بیرەوەری

# بە خەونی گەورەوە کەوتینە ڕێ

مامۆستا جەعفەر
(فازیل کەریم ئەحمەد)





چاپی دووەم
2020

بەرگی
1

بیرەوەری

# بە خەونی گەورەوە کەوتینە ڕێ

# بە خەونی گەورەوە کەوتینە ڕێ


نووسینی: مامۆستا جەعفەر (فازیل کەریم ئەحمەد)

بابەت: بیرەوەری

دیزاینی بەرگ و ناوەوە: ئومێد محەممەد

تیراژ: ٢٠٠٠ دانە

نرخ: ٨٠٠٠ هەشت هەزار دینار

چاپی یەکەم: ٢٠١٩

چاپی دووەم: ٢٠٢٠

چاپ: چاپخانەی تاران

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە( ١٦٨٤ )ی ساڵی ٢٠١٩ی پێدراوە

بیرەوەری

# بە خەونی گەورەوە
# کەوتینە ڕێ

**مامۆستا جەعفەر**
**(فازیل کەریم ئەحمەد)**

چاپی دووەم

٢٠٢٠

**پێشکەشە بە:**

عەبدولرەزاق فەیلی
نمونەی مرۆڤی خاوەن هەڵوێست و جوامێری و
رەوشت بەرزی گەلەکەمان

# پێڕست

## پێشەکی

سەرەتا بڕیارم دابوو، بیرەوەری نەنووسم. بیرەوەریشم نووسی، پێشەکی بۆ نەنووسم! لەدڵی خۆمدا دەمگوت: یەکێک چیرۆکی وەکو (ئەڵوەن و ئەفسانە) و (تاراوگە و گوڵە ژاکاوەکانی بەهەشت)ی نووسیبێت، چ پێویست دەکات بە قولەی قافی بیرەوەری رژدو هەڵەمووتدا هەڵگەڕێت؟ ئەحمەدی خانی (مەم و زین)ی نووسیوە و یەک دێڕ بیرەوەری نەنووسیوە! من نە خانیم و نە بێسارانی و نە نالی و نە گۆرانم. ئەمانە شاعیری گەورە بوون و دان بە شاکارو بەرهەمەکانیان دا نراوەو کەس ناتوانێت تاجی مرواری و یاقووت و زێڕ لەسەر سەریان داگرێتە خوارەوە.

سەردەمەکان جیاوازن، توانا و بەهرەش بە یەکسانی دابەش نەکراوە. هەلومەرجی ژیان، هەوراز و کەندو لەندەکان، زەمینەسازی نووسینی شاکاریان بۆ من نەڕەخساند: رۆژێک تێر و دووان برسی. رۆژێک پێشمەرگە و دڕک و داڵ هەڵشێلان، رۆژانێک ئاوارەو دەربەدەر و دوورە وڵات!

نیو سەدەیە لەجەنگەی خەباتی سیاسیدا پشتم چەماو سەرم سپی کردو هێشتا وەکو وانەی یەکەمی بیابانی ژیان سەرسام و فروسماوم! نە هیچ فێربووم و نە هیچ لەدەریای سیاسەتی کوردی تێگەیشتم. زانستی کۆمەڵناسی و زانستە سیاسیەکانم لە زانکۆی گیۆرگی ـ ئۆگوست (ئەڵمانیا) خوێندووەو سێ ساڵیش سەرقاڵی نامەی دکتۆرابووم! لە پێشبڕکێی سیاسیدا من ژێڕک و ئەوان تانجی.. لەیەک چرکەدا ئەوان سەدان جاران بە

دەوری پیرەمەگروونـدا سـووڕانەوەو مـن لـە شـوێنی خۆمـدا قڕوقپ، دۆش دامابووم!

میکیاڤیلی زیندوو بکرێتەوەو سێ چوار رۆژ بە بەردەرکی سەرادا بێت و بڕوات و دوو چا لە چایخانەی (شەعب) بخواتەوە و دەستێک تاوڵـە بـدۆڕێنێت و بـە سـەهۆڵەکەدا پیاسـەیەکی عەسران بکات، هەر یەکسەر لە ئامۆژگاری و بیروڕاکانی خۆی، کە بۆ (میر) نووسیونی پەژیوان دەبێتەوە! میکیاڤیلییەکانی ئێرە حەوت بەردیان بە پشتی ئەودا داوە. کێشەکە ئەوەیە هیچیان نەنووسیوە، تا کەسێک بتوانێت دەستەکەیان بخوێنێتەوە. ئەمڕۆ لەسەر دینێکن و سبەی دژی ئەو دینەن. هـەر رۆژە بەشێوەیەک نوێژ دەکەن و شایەتمان دێنن. هەریەکەیان لەچل ئاوی داوە و قولە پێی تەڕ نەبووەو لەسـەر هـەزار پـەت یارییان کردووە. تۆ پەپوولە دەبینیت لـەم گوڵ بۆ ئەو گوڵ دەفڕێت، لەناکاو لەناو لەپتدا دەنیشـتەوەو دەبێتـە دووپشـک! میکیـاڤیلی ئـەم جـۆرە سیاسـەتەی نـەبینیوە. ئـەم دەسـتیان ناهێڵێـت بزانێـت ئـەو دەسـتەکەیان چـی دەکـات! ئەمانـە گرەویـان لـە شـەیتانیش بردۆتەوە. ئەمانە خۆیان لێرەن و کلکیان لەشام تۆز دەکات.

یادەوەری مێژوویی و ئاستی رۆشنبیری و بەرپرسیارێتی، پێوەرن بۆ هەڵسەنگاندنی بیرەوەری کەسایەتیەکی سیاسی.

کەسـانێک بیرەوەریـان نووسـیوە، خۆزگـە هـەر نـەیان نووسیبایە. مامۆستا پشکۆ(ئەزموون ویاد)ی نووسیوە. ئەوان (ئەزموون و یاد)یان نەنووسیوە! (یاد)ێکی بێ (ئەزموون)یان بە ئارەزووی دڵـی تـۆ هۆنیوەتـەوە! هـەر بـۆ ئـەوەی راسـتیەکان بشـارنەوە، مێـژووی ژیـانی خۆیـان و خـەڵک بشـێوێنن. باسـی رووداوی ئـەوتۆیان کـردووە، مەگـەر لەسـەر (مـەریخ) و

(ساتۆران) روویدابێت. رووداوەکانی ژیانی خۆیان لەبن کای سەرخەرمان بێسەرو شوێن کردووە، تازەم زانیوە هەموویان پەپوولەبوون. نە زیانیان بەکەس گەیاندووە و نە لەپشتەوە خەنجەریان لەکەس داوە و نە مێروولەیەکەیش سکاڵای لەسەریان تۆمارکردووە. پاژێک لە بیرەوەریەکان لەشەڕە پشیلە دەچن. ئەمسەر و ئەوسەری کتێبە ئەستوورەکان دەخوێنیتەوە، بە ئاستەم چاوت بە یەک دوو قسەی راستی هەڵفلقێنراو دەکەوێت.

من پێشەکی دان بەوەدا دەنێم، هەموو راستیەکانم نەدرکاندووە: ئەسکوێم لەدیزەدا نەگێڕاوەو لێفەم لەسەر هەتیوان هەڵنەداوەتەوە. ئەمە شەڕگەی خوێناوی وێران و نەوێران نییە! هەزاران قەلای درۆ بەسەر سەرمانەوە هەڵچنراوە و گڵۆپە سەوزو سوورەکانیان سۆمای چاوان دەبەن. رەوڕەوەی مێژوو بەسەر ورگی رەش و رووتی ئەم وڵاتەدا تێپەڕیوە. لای خەڵکی داماویش ئەوە راستە، کە ئەوان نووسیویانە و گەردی پرسیاری چاوزیتی لێ نەنیشتووەو کەم کەس هەیە بڕوای بەو گێڕانەوە لارو لەوێرانە نەهێنابێت! هەلاوێرکردنی تاڵە دەزووە رەش و سپیە ئاڵۆزەکانی رابوردوو، دەیان نامەی دکتۆراو کاری زانستی تۆکمەی دەوێت.

لەم کتێبەدا جێگەی ژیاننامەی دەیان شەهیدم کردۆتەوە، کە کەم کەس باسی کردوون و رەنگە کەسانی تر وێنەیەکی دزێوی ئەو شەهیدانەیان خستبێتە بەر دیدی خوێنەرانی ئازیز. من ناڵێم: هەموو هەڵە و پەڵەکانم راستکردۆتەوە: هیوادارم وەکو (ئەفسانەی زیزیفۆیس)ی لێنەیەت: زیزیفۆیس لەلایەن خواوەندەکانی یۆنانەوە لەنەوچاوانی نووسراوە: دەبێ بەردێکی

زل تا نزیکی لووتکەی شاخ، بە پاڵ بەرزبکاتەوە، پێش ئەوەی بگاتە لووتکە، بەرەو خواری خوارەوە بانگلۆز ببێتەوە! من بە مرۆڤی پاک دەڵێم: پاک و بە ناپاک، دەڵێم: ناپاک! کاری من جێگۆڕکێ و ئاوەژووکردنەوەی راستیەکان نییە!

کولکەزێڕینەی دۆستایەتی و ئاشنایەتی بۆ نووسین لەسەر ڕووداوێک، بە پێوەرێکی هەڵە دادەنرێت. لەهەمان کاتدا، جڵەوی ((سۆز))م شل نەکردۆتەوە، لەگەڵ ئەسپی ڕەسەنی(لۆجیک)دا پێشبڕکێ بکات. هەڵەی سیاسی و عەسکەری، تاوانی بچوک و گەورە، کەتن و زیادەڕۆیی لەلای من بەر لێشاوی لێبووردنی گشتی نەکەوتوون، خاتری کەسم نەگرتووەو پووشم بەسەر کاری دزێوی هاوڕێکانمدا نەکردووە. خۆم لەو ئاستەدا دانەناوە، لاپەڕەکانی ئەم کتێبە بە لیکاوی زەردی ستایش و پیاهەڵدان ناشیرین بکەم. ستایشی چی و متایشی چی؟ بیرەوەری کەی جێگای پیاهەڵدان و مامە حەمەیی تێیدا دەبێتەوە؟

من دەمەوێ ئەزموونی قۆناخێک بخەمە بەرچاوی خوێنەران، لاپەڕە شاراوەکانی ئەو مێژووە لەبەردەست بێت، دەرگا داخراوەکان بۆ نەوەی نوێ بخرێتە سەر پشت، بە ئومێدی ئەوەی ملی ئەو ڕێگایە نەگرن، کە ئێمە گرتمان و ڕێگایەکی راسترو مۆدێرنترن بۆ خۆیان هەڵبژێرن، چونکە سەردەمەکە زۆر جیاوازە..

کاکم(مامۆستا غاندی) نیو سەدە لەمەوپێش پێیگوتم: (بەشێک لەسەرکردە سیاسیەکان کەللەسەری شەهیدەکان دەکەنە پردێک بۆ ئەوەی بە ئامانجە گڵاوەکانیان بگەن..) ئەوکاتە قسەکەیم زۆر پێناخۆش بوو. ئەو هەرچەند تەمەنی بیست و دوو ساڵ بوو، بەڵام خاوەن ئەزموونیکی دەوڵەمەند بوو. ئێستا دەزانم

قسەکانی ئەو چەند سوودبەخش بوون، ئەگەر من یەک لەدەی ئەو ژیر بوومایە....

پاژێک لەوانەی بیرەوەریان بڵاوکردۆتەوە، بوولێڵی حەزو ئارەزوو، رق و کینە، بەرچاوی گرتوون، مێژووی ژیانیان چەند دژوون و ناشیرینە، بە نووسینەکانیان دە ئەوەندەی تر رابوردووی خۆیان رەنگ زەرد کردووە. (سۆز) و (میزاج) و (رق) و (خۆشەویستی) دەبێ لەودیوی پەرژین و پەراوێزی باخ و گوڵزاری بیرەوەریدا جێگایان بۆ بکرێتەوە! دۆخی دەروونی شێواوو دووکەڵاوی ناچێتە خانەی رەفتارو هەڵس و کەوتی جێگیرو ئاوەزگەراییەوە.

یەکێک بەدەستی خۆی خوێنی دەیان هەڤاڵی بێتاوانی خۆی رشتبێت. هەزاران دێری نووسیبێت و نەیتوانیبێت یەک دێری پاشەڵ قوراویش لەپاشکۆی کتێبەکەیدا دابنێت و داوای لێبوردرن لەچاوی ئەو شەهیدانە بکات، کە خۆی گوللەبارانی کردوون. مرۆڤ کاتێک تاوانی ئاوا ئەنجام دەدات، دەبێ رۆژێک لەرۆژان ویژدانی یەکجار ئازاری بدات، ئەگەر ویژدانی ماڵئاوایی لێی نەکردبێت. دەبوایە فرمێسکی پەژیوانی هەڵوەرێنیت و نەفرەت لەخۆی و رابوردووی بێ شانازی و پڕ سەرئێشەی خۆی بکات! سەیرە کەسێک بەدەستی خۆی، لەسەر ((هیچ)) تێکۆشەرێکی گەورەی شەهید کردبێت و بەلایەوە ئەستەم بێت، دێڕێکی شەرمن لە پەراوێزی کتێبەکەیدا بشارێتەوە. هەروەکو ئەوەی بەدرێژایی ساڵانی شۆڕش لەناو ئەشکەوتێکی تاریک و نووتەکدا سەرقاڵی سیاسەت بووبێت و دوور بەدوور ئاگای لەرووداوەکانی رۆژگاری خۆی نەبووبێت.

مـەخابن تـوێژی رووناکبیرانی ئـەم گەلـە، لـەبری بـارانی نـەفرەت، لـەبری بـارانی زەهـرو زڵفـنج، گوڵبـارانی ئـەم جـۆرە کەسایەتیە دەکەن و ناتوانن ژیاننامـەی نەنووسـراو و بیرەوەری لەچاپدراو لەگـەڵ یـەکتردا بـەراورد بکـەن. مـن ((رووناکبیر)) دەناسم، بە بینینی بـەرگی کتێبێک سـەری گـەرم بووەو (حاڵ) گرتوویـەتی و کەوتۆتـە زرک وەشـاندن و پاشـان بـە بەرەکـەتی شێخ، ئارام بۆتـەوە. ئـەرکی رووناکبیر ئەوەیـە بـەراورد بکـات. بـەراورد واتـە: بیرکردنـەوە. مێشـک خسـتنەگەڕ، لـەبری، چەقبەستنی مێشک لەچوارچێوەیەکی ئاسنیندا. بڕواهێنانی رەهـا بە کتێبێک کارەساتە، دەبێ رووباری زانیاری چوار کتێب لەگەڵ یەکتردا بەراورد بکرێت و ئینجا بڕوا بە هیچیان نەکرێت! مێشکی کـراوەی خـۆی بکاتـە پێـوەرو پرۆپاگـەندەی ژەنگـاویش بـۆ بـن بەردێک لوول بدرێت. رق، تۆڵـە، میزاج و سـۆزی بێتام، مێشکی ژمارەیـەک بیرەوەرینووسـی داگیرکـردووە. یـەک دوو بـرای هێژا دەناسـم، دەفتـەرەکانیان لـەخاوەن بیـرەوەری وەرگرتـووە و ئـەمانیش بـە ئـارەزووی خۆیـان رستەسـازی و میتافـەیان دارشـتووە و رەنگـە خـاوەن بیـرەوەری جـارێکی تـر چـاوی بـە نووسـینەکەدا نـەگێرابێت. تـا بزانێـت چـی نووسـیوە و چـی نەنووسیوە؟ وردەکاری و شیکاری و تەکنیکی نووسین شانسی سـەرکەوتنی نووسـەرێک دیـاری دەکـەن، نـەک خۆهەڵکێشـان و شـاردنەوەی راسـتیەکان و خـۆ بـواردن لـە پـەیام گەیانـدن و راستگۆیی.

لـەم پـاژەدا، نـووکی قەڵـەمی شـەیدام لەسـەر ژیـان و بەسـەرهاتی ژمارەیـەک شـەهید دانـاوە: چـۆنم دیـون و چـۆنم ناسـیون، بەسـەرم کردونەتـەوەو تۆزقاڵێک قـەرزم داونەتـەوەو

ویژدانی خۆمم تا رادەیەک ئاسوودە کردووە. کێ کردی و کێ خواردی؟ دڵنیام بەرپرسە گەورەکان پێیان خۆش نییە شەهیدەکان بگەڕێنەوەو لەدەرگاکانیان بدەن! دەسەڵاتی قەڵەمی کەپەری ئێمە هەر ئەوەندەیە: ئەوان بێنێتە زمان و هەر یەکەیان بە چەند رستەیەک بیروبۆچوونی خۆی بگێڕێتەوەو مێژووی قۆناخێک بە زمانی پاراویانەوە بەرجەستە بکرێت. رەنگە ئەم رێبازەی من پەیڕەویم کردووە، بە تەکنیکێکی نوێ دابنرێت، کە رەنگە پێش من کەس بەکاری نەهێنابێت. ئەگەر ئەمە بەنوێگەری دابنرێت، ئەوە پێویستی سەپاندوویەتی و سەرووی دەسەڵاتی من بووە. من ئەوەم بەڕەوا نەزانیوە هەزاران وشە لەسەر خۆم بنووسم و ئامادە نەبم یەک دێڕ لەسەر ئەو هاوڕێیانە بنووسم، کە بەخوێنی خۆیان بەرگرییان لە شکۆی گەلێک کرد، داستانیان تۆمار کرد، شەپۆلە خواروخێچەکانی سیاسەتی کوردی ناویانی سڕیەوە و رێزو حورمەتی ئەوانیشی لەکەدار کرد.

لەکاتی بیرەوەری نووسیندا، رەنگە مرۆڤ بەدەستی خۆی نەبێت، رووبکاتە قۆناخی منالی یان گەنجایەتی خۆی، جڵەو بۆ ئەسپی خەیاڵ و فەنتازیا شل بکاتەوە، بەرەو ئەستێرەکان بفرێت. ئەسپی خەیاڵ بە ئەستێرەکان ناگات. مرۆڤ نەتوانێت بەسەر زەویدا بڕوات و بەردێک لەسەر بەردێکی تر دابنێت، لەو ئاسمانە پان و بەرینەدا هەر هیچی پێناکرێت. پاژێک لە بیرەوەرینووسانی کورد لەمەشدا زیادەڕۆیی دەکەن. خۆیان دەکەنە ناوەندی جیهان و هەرچی رووداوی رۆژهەڵات و رۆژاوا هەیە، جێ پەنجەی ئەمانی پێوە دیارە. ئەمە خۆی لەخۆیدا رازی نەبوونە بەو رۆڵەی ئەو کەسە لەناو کۆمەڵدا هەیبووەو بۆیە بە هەڵبژاردنی رۆڵێک، کە ئەو کەسە نەیگێڕاوە و

نـــەیتوانیوە بیگێڕێــت لەســـەر شــانۆی بــێ هـــەورازو نشــێوی بیرەوەریدا ڕۆلیکی نوێ بۆ خۆی وێنا دەکات.

ئـــەوە دەزانـــم بڵاوکردنـــەوەی ســـەرجەم بیرەوەریـــەکانم بەسـەریکەوە باشـترە. ئەمسـاڵ پاژێـک و سـاڵی داهـاتوو پـاژێکی تر، ئەوە کێشـەی تێدەکەوێت و ڕەنگە مرۆڤ بکەوێتە بەر هێرش و پەلاماری سوپای ڕەخنەگران و بیروڕای مـرۆڤ درزو کـەلێنی تێبکـەوێت. زۆربـەی بیرەوەرینووسـان یـەکبین یـادەوەری خۆیـان لەمناڵیـەوە تـا دوا چرکـەکانی تەمـەنیان لەکتێبێکـدا چـاپکردووە. حەزم دەکرد پاژ پاژێن، ئەمسـاڵ بۆ ئەوسـاڵی تێنەکـەوێت. ئـەوە بۆ کەسێک باشـە خـەم و پەژارەکـەی تـەنیا نووسـینی بیرەوەری بێـت و هـیچ خـەمێکی ئـەوتۆی نـەبێت، سـەرنجی بـۆ سـەردارو بنـداری ژیـانی ڕۆژانـە بـەرێت. پـرۆژەی نووسـینەکانم زۆرجـار لەپـەڕی چۆلەکەیـەکی چڵکـن دەچـن، کـە ڕەشـەبای ڕۆژگـار بـە چـەپ و ڕاسـتدا جۆلانـەی پێـدەکات. لەلایەکـەوە ((ئـەزموون)) ئەوەیـە تـاڵ و شـیرین بەیەکـەوە دابنرێـت. خوێنـەری ئـازیزی ئەمڕۆ، دەیەوێت من بەگەزی ئەمڕۆ جاوی چل سـاڵ لەمـەوپێش بپێوم! ئەو دەیـەوێت لەبـەردڵی خۆی تـەنیا ئەوانـە لەتاقیکردنـەوە دەرچێنم، کـە ئـەو بـە براوە و دەرچوویـان دەزانێت. مـەرج نییـە ئەو کەسەی، کە ئەو پەسـەندیان دەکات و چوار ڕۆژە دەیناسـێت و هیچ ئەزموونێک، هەردووکیان بە یەکەوە نابەستێتەوە، لەگـەڵ ئەو ناسینەی من یەک بگرێتەوە، کە چل ساڵ لەمەوپێش بووە!

من نەمتوانیوە قسـەی ئەو خەڵکەی، کە چل پـەنجا سـاڵ پێش ئێستا قسەیان بۆ کردووم وەکو لێدوانێکی ڕیکۆردکراو دابنێم:

یەکەم: من ئامێری تۆمارکردنم پێنەبووە.

دووەم: ئەگـەر قسـەکانم بـە دیـالێکتی ئـەو کەسـانە دانابایـە، ئـەوە دەبـا کـاتێکی زۆر بـۆ وەرگێڕان و روونکردنـەوە تـەرخان بکەم. زۆربەی ئەوانـەی لـە رێکخـراوی (هـەڵۆی سـوور)بوون بـۆ نمونــە: م. جــوامێر ســایەمیر بەشــێوەی کرماشــانی قســەیان کـردووە. دانـانی گفتوگـۆ بەشـێوەی کرماشـانی کارەکـەی منـی ئاڵۆز دەکرد.

مـرۆڤ هەسـت دەکـات مـن ئاستیکی(سـتاندارت)م دانـاوە بـۆ ئاخاوتنی سـەرجەم ئەوانـەی ناویـان هـاتووەو جۆرە یەکسـانیەک لەئاستی بیرکردنـەوە و زمـانی ئاخـاوتنی جووتیارێـک و گاوانێـک و رووناکبیرێـک رەچـاو دەکرێـت. مـن مەبەسـتم لـەم نووسـینەدا دارشـــتنەوەی (ئـــەزموون)ە، پێشـــکەش کردنـــی وێنایەکـــە، تاقیکردنەوەیـــەک، بـــە چـــاک و خراپیـــەوە. لێـرەش بـــە ئاســـانم نـــەزانیوە قســـەی جووتیـــارێکی گونـــدی (مچـــەکوێر) بەهـــەمان دیالێکت و رەنگ و بۆنی چل ساڵ لەمەوپێش دانێم..

هەوڵمـداوە وشـەی کـاک، بـەرێز، هـەڤاڵ، شـەهید.. تـاد. لـەناو نووسینەکەدا نەبێت. ئەمە خوانەخواستە بێ رێزی نییـە بەرامبـەر هـیچ کەسـێک لەوانـەی نـاوم هێنـاون. نووسـەرانی ئۆرووپی ئـەم (فـۆرم)ە بـەکارناهێنن و ئـەم شـێوازە جۆرێـک لـە نایەکسـانی دەهێنێتە کایەوە. رێزگرتنی من بۆ ئـەوان ئـەم کتێبەیـە و شـێوەی ناو هێنان نییە: هەر هەموو کاک و برای گـەورەن و شـەهیدەکان شەهید و سەروەرن.

**سوپاس و پێزانین بۆ برایان:**

مامۆستا پشکۆ نەجمەدین، هەڤاڵ کوێستانی، حەسەن یاسین. ئەمانـە دەستنووسـەکەیان خوێندەوەو سـەرنج و تێبینـی وردیـان لەسەر نووسیوە و هەڵە و پەڵەکانیان بۆ دەستنیشان کردووم و

ئامۆژگاریەکانیان لەسەر چاوان دادەنێم، سوپاس بۆ سیروان حەمەسەعید بەڕێوەبەری دەزگای رۆشنبیریی جەمال عیرفان، ئومێد محەمەد دیزاینەر.

زۆر سوپاسی برایانی هێژا:

سالار عەزیز، عیماد ئەحمەد، مەحموود سەنگاوی، ئازادی سەگرمە، سامان گەرمیانی، فوئاد مەجید میسری، موحسین عەلی ئەکبەر، خدر چکۆل، شێخ ئەشرەف تاڵەبانی، شێخ میقداد بەهائەدین، کامەران عارف، عەلی پەرلەمان، مەلا سەباری چرچە قەڵا، ئازاد مستەفا خۆشناو، عەلی بچکۆل، شوانی حەسەن خاوێ، عەدنانی شێخ عەبدولعەزیزی داربەڕوو، شێخ محەمەد ئەمینی ساڵح مەعرووفی بەکر بایەف (رزگار بایەفی)، مستەفا دەمرکانی، حاجی سەلیمی دەروێش ئاغای مەروێ، شلێر غەفوور ژاژڵەیی، مامۆستا گۆرانی مەلا وسووی مەنگوڕی، د. کاوسێن بابەکر، حسێن ئیبراهیم مستەفا (هێدی)، مام سالحی گۆڕێئەسپ، مەریوانی رەئوف بەگ، جوامێری برای حەمەی تەلە، ریبوار تۆفیق حاجی باقی بەنگینە، کاوەی مەلا مەحمود، د. بەندەر عەلی مەندەلاوی، دکتۆر موشیر (موشیر حەمەغەریب ئەمین)..... تاد.

هەریەکەیان لەسەر قۆناخە جیاجیاکانی خەبات، زانیاری وردیان پێشکەش کردوم و سوودم لەبیرەوەریەکانیان وەرگرتووە.

# ئاشتی

## (١)

بنووسم پاسێک لەبەردەممدا ڕاوەستا، یان بنووسم لەبەر لووتمدا پاسێک ڕاوەستا. ڕێک چل و دوو ساڵ لەمەوپێش، هەروەکو ئەوەی هیچ ڕووینەدابێت، هەر هەموو بەشەکانی سیناریۆ نەنووسراوەکەی فلیمەکەم بیر دەکەوێتەوە!. پاسێکی سووری دووقاتی. سەروژوور، پاش و پێش، جمەی دەهات. بەلای ڕاستدا خوار ببوەوە. ژاوەژاو و قریشک و هووڕ، حیلکە حیلک و کوڕژنی کیژانی تازە پێگەیشتوو. مەمک، وەکو تۆپی پینگ پۆنگ هەڵدەبەزیەوە. ڕەوەیەک خوێندکاری کارمامز و نەونەمام، بە پاڵەپەستۆ و قاقای پێکەنین، دابەزین. پوزو بەلەک، بەگۆرەوی پەمەیی و کاڵ و تەنک و بەڕووتی، لاڕانی سپی وەکو مەڕمەڕ، مینی جۆپ هەوارزتر هەڵدەکشێت. ئەمانە تازە بنمەمکیان داناوە و سەر سینگی هەورە ئاڵوشەکانی ئاسمانی پێ دەڕووشێنن. جانتا و کتێب ملوانکەی سەوز و سوور، فڕکان فڕکانیانە، باڵ و قۆڵ و مەچەک و سەرپەنجەکان لەئاسماندا دەیانگرنەوە.

من هەر بیرم لای کتێبەکانی ڕێکخراوی (تووپامارۆس)*ەو بیر لەوە دەکەمەوە: چۆن بەغدا و شارەکانی ناوەڕاست و خوارووی عیراق بهەژێنین؟

---

* تووپامارۆس: Tupamaros: بزاڤێکی سیاسی . چەکداری شاری بوو، لەئۆرۆگوای دەرکەوت. لەسالانی ١٩٦٠ ـ ١٩٧٠ سەرقاڵی کاری سیاسی بوون. ساڵی ١٩٧٠ ـ ١٩٧٢ ڕژێمی ئەوسای ئۆرۆگوای، بەشێوەیەکی نادیموکراسی، کەوتە وێزەی هەموو جموجۆڵێکی سیاسی ـ ئۆپۆزسیۆن، ئەمانیش پەنایان بۆ تاکتیکی

ئێمە بەدەستی خۆمان کوردستان وێران دەکەین! لەشاخە گەردن کەشەکاندا، شۆڕش هەڵدەگیرسێنین، فرۆکەی جەنگی و تانک و تۆپی رژێمە داگیرکەرەکان، دێهات و شارو شارۆچکە کاول دەکەن. ئەمجارەیان شەڕگە و چەقی زۆرانبازی بۆ پایتەخت و خوارووی دەگوێزینەوە..

لەدوادیداردا لەگەڵ ئاشتی(سەلام عەبدولرەزاق)و بێباک شێخ عومەرو** کەمال محەمەد ئەمین لەچایخانەی (شارەوانی) یەکترمان بینی. بەدەم تاوڵە و دۆمینە و چا فڕکردنەوە پێی گوتم:((پایتەخت دەریایە)). ئەمەی گوت و شەشبێشی بەتەنیشت یەک شەشەوە داناو بەدەنگی بەرز بە بێباک شێخ عومەری گوت: ((دوو شەشم لەدەستدا تۆپاند..)).. دواتر لەسەر قسەکانی خۆی بەردەوام بوو.. لەوێ بەرچاو ناکەوین، یەکتر بینین، جوڵە، چالاکی سیاسیی نهێنی سەرنجی کەس راناکێشێت. هەر لەشەقامی جمهوری، چەند شەقاوێک سەروویماڵی خۆتان*، سواری پاسی ژمارە - ١٨ - ببە و بیست و سێ وێستگە بژمێرە

---

شەڕی پارتیزانی شاری برد: (کوشتنی کەسایەتیە مەزنەکانی دەوڵەت، رفاندن، بانکبڕین.. تاد. بەتایبەتی لەپایتەخت (مۆنتیفیدیۆ). ساڵی ١٩٧٢ بەر شالاوی گرتن و کوشتن و بڕین و راووەدوونان کەوتن. زۆربەی سەرکردەکانیان گیران و تا ساڵی ١٩٨٥ لەزینداندا بوون و پاش نەمانی رژێمی دیکتاتۆری ئازادکران و جوڵانەوەیەکی سیاسی (دوور لەزەبروزنگ)یان دروستکرد. ناسراوترین سەرکردەیان رائول سەندیکە Raul Sendic (١٩٢٥ ـ ١٩٨٩) کە ماوەی (١٢) ساڵ لەزینداندا بوو. بەدڕندەترین شێوەش ئەشکەنجە دراوە و دەستەبەرداری بیروباوەڕی خۆی نەبووە.

**بێباک شێخ عومەر دەکەیی: (١٩٥٤ـ ١٩٧٨) کادرێکی هەڵکەوتویی کۆمەڵە بوو، ساڵی ١٩٧٨ بەدەستێکی رەش لەگوندی عازەبان - شارباژێر لەتەمەنی ٢٤ ساڵیدا و لەسەر هیچ کوژرا.

* مەبەست ماڵی کاکم بوو، کە ئەو زەمانە لەبەغدا دەژیان.

و دابەزە، چایخانەیەکی شەعبی تۆزێک سەرووی وێستگەکەیە، من لەوێ چاوەڕوانت دەکەم..)، ئەم رستەیەی بە سوعبەت و پێکەنینەوەو گوت!

((ئەی ئەگەر تۆم لەوێ نەدۆزیەوە؟)). منیش بە سوعبەتەوە ئەم پرسیارۆکەیەم لێکرد:

((بێ قەزا بیت، بەهەمان رێگەدا بۆماڵەوە بگەڕێوە؟)).

ئاشتی ئەوکاتە تەمەنی بیست و دوو ساڵ دەبوو. لاوێکی باریک، سمێڵ رەش، وریا، زیتەڵە، چاونەترس.. کاتێک لەتاقیکردنەوەی سێی ناوەندی دەرچوو، بە پێکەنینەوە گوتی: ((مژدە .. مژدە... دەرچووم... دەرچووم.. بڕوات هەبێت، نە لەترسی دایک و باب، نە لەترسی خوشک و برا، لەترسی تۆ پۆلی سێیەمم تەواوکرد...)).

ئاشتی برا بچووکی کەریم و عەلی و عەباس و موبارەک بوو. رۆژێکیان، لەسلێمانی، تا ئێوارەیەکی درەنگ بە شەقامی ئۆرزدی و مەولەوی و بەردەرکی سەرا پیاسەمان دەکرد. من گوتم: با بۆ ماڵی کاکم بچین لێرەوە نزیکە، ئەو گوتی: ماڵی ئێمە نزیکترە و دایکم بەردەوام هەواڵتان دەپرسێت..

نازە خان سەری دونیای لێهاتبووە یەک! سەلام: کوڕی بچووک و یاخی ئەوە، هەر زۆر سەرقاڵە و خەریکی شتێکە و دایکی هەرچی دەکات، داماوە مەتەڵەکەی بۆ هەڵنایەت: بەردەوام میوانی هەیە و لەپەناوە چپە چپ و فسکە فسکی خۆیان دەکەن، وازی لەخوێندن هێناوە و هەر سەری لەسەر لاپەڕەی کتێبەکان لا نادات. دوو سێ هەفتە کار دەکات، لەهەفتەی چوارەمدا، ماڵئاوایی لەو کارە دەکات..

پەرۆشـــیی دوا رۆژی کـــوڕە بچووکەکـــەی، نـــەک گیـــانی نـــوێگیری** پـــاڵی پێوەنـــا پرســـیار ئـــاژنم بکـــات. لەگـــەڵ مـــن بە دیالێکتی خانـەقی دەدوا و قـەت نەمبیسـتووە، بـە سنەیی بڵێت (بووچە) یان (توویچ)..

ـ روڵە ئیسە ماڵدان ها لەکورە؟

ـ ماڵمان ها خانەقی.

ـ مەکتەب تەواو کردیدە؟

ـ من لەسلێمانی مامۆستام.

ـ ئافەرین.. ئافەرین کوڕم.. یاخودا تەمەن درێژ بووی..

حوکیش لەیرەبی*، ئەو وەت من لەشەقڵاوە کارکەم.

تووخـودا تـووزی نەسـیحەت سـەلام بکـە، ترسـم سـەرمان بخەدە خەڕگ!** نێزانم ئەرا ئەی کوڕە کاری نێکەد؟ نێزانم ئـەرا لێواکەد؟

هـەر بـۆ ئـەوەی پەڵـە هـەوری گـرژی نێـوان دایـک و کـوڕ بڕەوێنمەوە، سەربردەیەکی نەنکمم بۆ گێڕایـەوە. نـەنکم دەیگـوت: کاتێـک نـازە و ڕەزاق لەشـاری سـنەوە هـەڵاتن، لـەم کاولاشـەدا پێڵاوی غـەریبیان داکەنـد.. نـازە کیژۆڵەیـەکی باریـک و بنـێس و ڕەق و تـەق بـوو.. هـەردووکیان لەسـەربان جێگـەیان بـۆ ڕاخـرا.

---

**نوێگیر: Neugir وشـەیەکی ئەڵەمانیـە، بەعـەرەبی: فضـولي، کەسـێک بیـەوێت شتێکی نوێ و زانیاری لەسەر خەڵک و بابەتی جیاجیا بزانێت. هـەر بـە مەبەسـتی تینوویەتی شکاندن سەبارەت بە پەیداکردنی شتی نوێ. مـن (نـوێ)م لـەبری (نۆی) ئەڵەمانی داناوە..

* مەلا بەختیار: (حکمت محمد کریم) رستەکە بۆ کرمانجی خـواروو وەرگێرم وای لێدێت: (حوکی لێرەبوو، ئەو گوتی: من لەشەقڵاوە کاردەکەم!)

** خەڕگ :قوڕ

دەترسام رەشەبا هەڵبکات و لەسەربان وەکو دوو پووشکەڵە لوولیان بدات.

منیش دەمگوت: ئاخ دادا***؟ ئێستا نازەخان ئەوەندەی سێ ژن دەبێت، چۆن پێش چل ساڵ ئەوەندە لەڕولاواز بووە؟

پێش ئەوەی سواری پاسەکە ببم، بە ئەسپایی دەستم لەسەر ئەو گیرفانە دانا، تژی گڕبوو. رۆژنامە و گۆڤاری نهێنی. لەسەر لەتە کاغەزێکی شڕ، کەللەی سەرت ڕەوانەی بەردەستی جەلادان دەکرێت!

هەست دەکەم(پیرەمەگروون)م لەگیرفانم داناوە. ئەو چرکەیە رۆژنامە و بڵاوکراوەکان، لە باڵی فڕۆکە پان و بەرینتر بوون. سەرانسەری پایتەخت بۆتە یەک چاو، ئەویش چەقیوەتە گیرفانی پێشەوەم. چاوەڕوانم، کوت و پڕ، لە دەرگای ئۆتۆمبێلە جامڕەشەکانەوە، سمێڵ پانە، دەمانچە لەبەر پشتێنەکان دەرپەڕن و ئەملاو ئەولام بگرن، دەمی لوولەی دەمانچەکانیان لەپشت ملم قایم بکەن، یەکسەر گیرفانەکانم بپشکنن و دەست لەسەر نهێنییەک دابنێن، کە دەیەوێت نەخشەی جیهان ژێر و ژوور بکات.

نازانم چەند شەقام و پرد و وێستگەمان تێپەڕاند!

لەناکاودا ژنەعەرەبێک* قریشکاندنێک قریشکاندی، هەروەکو ئەوەی پاسەکە لەپردێک بۆ ناو دیجلە بەربێتەوە، هەر هەموو چاوەکان ڕژانە سەر دەم و چەناگە خاڵدارەکەی ئەو.... پڕ بە کەللەی سەری دەیشیراند:

---

***دادا: نەنک: دایکی دایک یان دایکی باوک

* لە گەرمیان بە ژنە عەرەب دەڵێن: عەرەبەژن

(فریـام کــەون.. فریــام کــەون.. جزدانەکــەم دزرا.. ماڵیــان کــاولکردم. پارەکــەیان دزیــم.. فریاکــەون.. یارمــەتیم دەن.. بەقوربانتان بم.. کاکی شوفێر.. دەستم بە دامێنت..)

یاخەی کوڕێکی ڕەشتاڵەی قژ لوولی چاو دەرپەڕیوی گرت و چریکاندی!

بەدەم چریکاندن و شیڕاندن و زریکاندنەوە، کوڕە ڕەشتاڵە قژلوولەکەی وەکو مەشکە دەهێناو دەبرد:

(دەتکوژم.. روحت دەردەکەم.. هەردوو چاوت دەردێنم.. زوو.. هەی سەگسار..)

شوفێری پاسەکە، بەبێ سێ و دوو، دەرگاکانی خڕ داخست، بەدەنگێکی گڕی پڕ لەتووڕەیی هاواری کرد:

(دەنگە دەنگ مەکەن، ئارام بن و لەجێگەی خۆتاندا دابنیشن و قسەی بەرز و نزم مەکەن! ئێستا ڕاست بەرەو مەرکەزی پۆلیس دەئاژووم. لەوێ یەک بە یەکتان سەرتاپا دەپشکنن، کەس لەدەست ئەوان دەرباز نابێت و لەبن داراندا داتان دەڕزێنن، ئیدی چارەنووسی خۆتان دەزانن.)

چارم نەبوو، دەبێ دان بەخۆمدا بگرم. دەستم بۆ جامی پاسەکە برد، درزێک بکەمەوە، هەرچی ڕۆژنامە و بڵاوکراوە هەیە، ڕادەستی ڕەشەبایان بکەم. بەدوای کون و کەلەبەردا دەگەڕام، بە بڵاوکراوە و ڕۆژنامە پڕیان بکەمەوە! ئەی خودا بۆ سەر لەنوێ ئاوا تەنیا جێتهێشتم! دڵی من بیست ئەوەندەی دڵی دزەکە خێراتر لێیدەدا. کابرایەکی سەر ڕووتاوەی سوورفلی گامل، بە تەنیشتمەوە دانیشتبوو. بۆنی شپرزەیی و شڵەژانی منی کردبوو. هیچ بوونەوەرێک وەکو سەگ هەستی بۆنی بەهێز نییە! لێم ورد دەبووەوە، دەستەسڕەکەی دەرکرد و ئارەقی نەوچاوان

و لاجانگ و پشتملی سرِی. هەر مشەمشی بوو. ئەگەر جلەکانم ئەوەندە نویّ و ئوتوکراو نەبان و قژم پاک و داهێنراو نەبان رەنگە لەپڕ هاواری کردبا: من گومانم لەم پیاوەیە، وەرن بیگرن، شتێکی هەیە!

من پێمگوت:

(ئەوە چی ڕووی داوە؟)

(ژنێک جزدانەکەی لێدزراوە!)

عەرەبییەکەم ئەوەندە ئەدەبیانە بوو، کابرای ملپان، ئەوەندە بچووک بووەوە، ورتەی لێوە نەهات. تا لەمەرکەزی پۆلیس نزیکتر دەبووینەوە، تەپەی دڵم قایمتر دەبوو..

نێوان ئێمە و مەرکەزی پۆلیس یەک قەڵەمبازی مابوو. پاسەوانەکان کەوتنە جموجۆڵ و تفەنگەکانیان لەشانیان داگرت. کوڕە ڕەشتاڵە قژ لوولەکە، هەر زۆر بە ئەسپایی و بەبێ خۆ شڵەژاندن گوتی:

(ئەوەندە لەجزدانەکەت گەڕایت، ئەوە نییە کەوتۆتە بن عەباکەتەوە، تکایە لەمەودوا بە ناهەق دەستی تاوان بۆ خەڵک رامەکێشە!)

ژنە عەرەبەکە پێش ئەوەی جزدانەکەی هەڵبگرێت و سەیری بکات، نەعلە ڕەشە چڵکنەکانی داکەند، بە تووک و* جوێن و چەپۆکەوە، سەرو پۆتەلاکی کوتا..)

پاسەکە ئیستۆپی گرت و شوفێرەکە هەناسەیەکی هەڵکێشا.

---

* تووک: دوعای شەڕ. لە گۆرانی فۆلکلۆری وا هاتووە: (بابی لێت عاجز دەبێ و دایکی لێت دەکات تووکێ)

منیش هەناسەیەکم هەڵکێشا. ئەمجارەیان دڵم لە لێدان نەکەوت، ئیدی قەت دڵم لە لێدان ناکەوێت. کابرای شوفێر لەبەرخۆیەوە هەر دەیگوت:

(أمري لله الواحد القهار..)

(ئەستەغفرەڵا.. ئەستەغفرەڵا.. یارەبی.. یارەبی هەزار جار تۆبە..)

تا گەیشتمە لای(ئاشتی) سەرلەنوێ یەک بە یەکی وێستگەکانم بە بیری خۆم دەهێنایەوە و دەمژماردنەوە. نازانم چۆن ژمارەو ژماردنەوەم لێ تێک نەچوو؟

ئەو ئێوارەیە، تا درەنگانێ پێکەوە بووین. ئەو هەر بە بەزمی دزو ژنە عەرەبەکە پێدەکەنی. پاشان ئەم سەربوردەیەی شێخ موراد زەنگنەی گێڕایەوە کە زانایەکی گەورەی کوردپەرەوەر بوو:

(مانگی رەمەزان دەبێت، حاجی عەلی ناوێک دەچێت بۆ لای شێخ موراد و داوای لێدەکات، رێگەی بدات تاقە یەکجار بانگی پارشێوان بدات. شێخ زۆر جیڕ دەبێت و رەزامەندی دەرنابڕێت، ئەویش قیرسیچمە دەبێت و دەست لەبەرۆکی مامە شێخ بەرنادات. رۆژێک شێخ رازی دەبێت، حاجی عەلی بانگی پارشێو بدات. کاتژمێر ٥.١١ کاتی بانگدان دەبێت، حاجی لەخۆشیا پێی زەوی ناگرێت و ئێوارە ناو ساجی و چکلێت و پاقلاوە بەسەر ماڵانی گەڕەکەکەدا دابەش دەکات. بە پەلەپەل سەعات قوڕمیش دەکات و زوو دەخەوێت. لە ئەنجامی پەلەپروزێ کاژمێری لەسەر ١١.٥ داناوە. هەر سەعاتەکە زەنگ لێدەدات. حاجی تا حوسێنیەکە ناوەستێت. دەست دەکاتە (اللە اکبر.. اللە اکبر)، کچەکانی شێخ، باوکیان ئاگادار دەکەنەوە، ئەم بانگە بانگی چییە!

ئەویش بە پەلە خۆی لەبەردەکات. پێش بانگ تەواو کردن شێخ لەبەردەم حاجی قوت دەبێتەوە.

شێخ دەڵێت: ((حاجی رۆڵە سەیری سەعاتەکەی خۆتت کردووە؟)).

حاجی سەعاتی بەر باخەڵەکەی دەردەکات: (ئەی یا شێخ گیان سەعات.. سەعات.. ئەرێ ئەمە چییە! سەعات ١١.٥) جەنابی شێخ بە دەنگ و ئاوازێکی باوکانەوە پێی دەڵێت: ((کوڕم پێم نەگوتی لێینازانیت و کێشەمان بۆ مەنێرەوە؟)).

حاجی عەلی دەڵێت: ((یا شێخ گیان چارەسەرێکمان بۆ بدۆزنەوە..)).

جەنابی شێخ: (چارەسەر ئاسانە.. ئەو مایکەم بدەرێ)

شێخ، هەر یەکسەر، بە بێ قوڕگ پاکردنەوە و ئحمم! ئحمم! دەنگ بەرز دەکاتەوە (ئەی خەڵکی بە شەرەفی خانەقی، بخەفن*! حاجی عەلی گووی خوارد..)

سەلام دەیگوت: (چەند خۆشە ئەدەبیاتی مارکسی بۆ شێوەی دیالێکتی خانەقی وەربگێڕدرێت:

(خطوة الی الامام خطوتان الی الوراء) (یەک گام ئەرا نویا، دوگام ئەرا دویا)

(ما العمل ؟) چە بکەیمن ؟ یان: ئای خودا چە بکەین ؟

(عشرة ایام هزت العالم)دە رۆژ ئەی دونیا هاوردە جینگ و جانگ

ئەو بەبێ چاوترووکاندن گوتی: (هەفتەی داهاتوو سەری هەزاران کەس دەبینیت، کە لای ماڵی ئێوە بە دە دنیاری سەوزی زۆر نوێ، پەڕێنراون!)

---

* بخەفن: بنون. بخەون

(ئـەو هـەموو دە دیناریـە لـەکوێ دەهێنێـت و سـەرانی پـێ دەپەڕێنێت ؟)

سـەلام گـوتی: (دوو ملبـاریکی، چاویلکـە لـەچاوی ئـۆروپی، هـەموو مانگێـک، بـە جانتایەکـەوە، سـەد و هەشـتا هـەزار دینـار لـەبانک دەردەکـەن، لـۆژە لـۆژ، بـە بـەردەم کـۆڵانێکی باریکـدا تێدەپەڕن و بەرەو کۆمپانیاکەی خۆیـان دەڕۆن. ئێمـە زانیاریمـان هەیـە و چاودێریمـان کـردوون و بـەدواداچوونی وردیشـی بـۆ دەکەین. دەتوانین بە چوار پێنج کەسێکەوە وەکو داڵ پـەلاماریان بـدەین و جانتاکـەیان لێبـڕفێنین، خۆمـان لـەچاو ون بکـەین. پێمانباشـە لـەماڵی ئێـوە بیشـارینەوە، ئـەوێ لەهـەموو شـوێنێک ئەمینترە...)

منـیش گـوتم: (پـارە پەیـداکردن بـۆ شـۆڕش، لـەپیاو کوشـتن باشترەو..)

# هەرێمی پێشڕەو
# (٢)

هـەرێمی پێشـڕەو: کۆمیتـەی بـاڵای رێکخسـتنەکانی کۆمەڵـەی مارکسـی ـ لینینـی کوردسـتان(کملک) بـوو، لەبەغدا و خانـەقی و مەنـدەلی... تـاد. ئـەم رێکخـراوە سـاڵی ١٩٧٩ ناوەکـەی بـۆ (کۆمەڵـەی رەنجدەرانی کوردسـتان ـ کۆڕەک) گۆڕدرا. سـاڵانی ٧٦ــــ ١٩٧٧ هــــەرێمی پێشــــڕەو، یــــەکێک لــــە بــــەهێزترین، رێکخسـتنەکانی کۆمەڵـە بـوو، لـەچاو سـلێمانی و کـەرکووک و هـەولێر و دهـۆک.. چونکـە لـە شـاڵاوی گرتنـی سـاڵی ١٩٧٥ تـا ڕادەیـەک بـە سـەلامەتی دەربـاز بـوو، تـەنیا ژمارەیـەکی کـەم، کـە ناسـراوترینیان: (جـەبار فـەرمان، ئیبـراهیم حسـێن و سـەعدون فـەیلی... تـاد.) گیـران. دەنووسـم: بـەهێزترین مەبەسـتم ژمـارەی ئەندام و چالاکی و جموجۆڵە. لەڕووی چۆنایەتیشەوە ژمارەیەک کادری بەتوانای پەروەردە کردبوو، بەشێکیان تا ئێستاش لەسەر شانۆی سیاسی ناویان هەیە و دەوری گرنگیان لە بزووتنـەوەی رزگـاریی گـەلی کوردسـتان گێـڕاوە، جێگـە پەنجـەیان دیـارە. ئەنـدامانی کۆمیتـەی هـەرێمی پێشـڕەو، بریتـی بـوون لـەم پێـنج کەسە: (صادق شەریف، موحسین عـەلی ئەکبـەر، عیمـاد ئەحمـەد، دڵشاد مەلود ئەفەندی، بەندە). ئەم پێنج کەسە جگە لەدڵشـاد، کە هەولێریــە و ئێســـتا لەســـوید دەژێــت، چوارەکــەیتــر خــەڵکی (خانــەقین). ئەوکاتــە ناوەنــدی چــالاکی و خــەباتیان بــۆ بەغــدا گواستبووەوە..

من بە پێویستی دەزانم، تیشک بخەمە سەر ژیان و کەسایەتی ئەو کەسایەتییانەی ناویان هاتووە، بۆ ئەوەی خوێنەری ئازیز باشتر بتوانێت رووداوەکان بەرجەستە بکات. بەگوێرەی توانـاش هەوڵدەدەم دەقی قسەکانیان بیری خۆم بهێنمەوە و بەبێ دەستکاری لەرستەکاندا جێگەیان بکەمەوە.

**صادق شەریف** (١٩٥٦ـ ١٩٧٧)

دەرچووی ئەندازەی کیمیایی ـ زانکۆی بەغدابوو. لاوێکی خوێندەوار، زیرەک، بیر فراوان، قورس و گران، ئێسک سووک، جوانخاس بوو. ئەو لەگەڵ محەمەدی یاوەری عەبدوڵڵا قازی (حەمۆ) * و ئەندازیار سەلاحی حاجی حسێن حەمەخان شمشێرکوڵی لە زانکۆی بەغدابوون، دەیان خوێندکاری کوردیان لەناو (ئەڵقەی رۆشنبیری) رێکخستبوو. لەکاتی هەرەس و نسکۆدا ئەمان بڕیار دەدەن، جوڵانەوەی بەرەنگاری دروست بکەن و بەدوای رێکخراوێکی سیاسیدا دەگەڕان، ببێتە پاڵپشتیان و لەگۆشەگیری و دابڕان بیانپارێزێت.

ئەم گروپە پێش ئەوەی ئێمە بیانناسین و پەیوەندیمان پێیانەوە هەبێت، زۆربەیان دۆست و هاوڕێی (ئیبراهیم عەزۆ) بوون، ئەو بۆ ناو ئەڵقەی رۆشنبیری رایکێشابوون. ئیبراهیم عەزۆ پایزی ١٩٧٥ فەرمانی گرتنی بۆ دەردەچێت، ئیدی ئەمانیش دادەبڕێن. دیارە ئیبراهیم عەزۆ لەساڵی ١٩٧٢ بەدواوە

---

* شەهید محەمەد یاوەر (١٩٤٨ ـ ١٩٨١) کەسایەتییەکی سیاسی و کادری (پ.د.ک) و پاشان کادری (ی. ن. ک) بوو.. ناوی کاک( حەمۆ)م بەم شێوەی سەرەوە نووسیوە، تا لەگەڵ ناوی شەهید محەمەد یاوەر جیا بکرێتەوە.

لــەناو كــۆليجی ئەنــدازەی بەغــدا چەنــد هێــڵ و شـــانەيەكی پێكەوەناوە.

من سەرجەم براكانی صادقم دەناسی و لەگەڵ(حەمۆ) لەيەك كۆلاندا بووين. (حەمۆ) لاوێكی خوێن گەرم و بەحەماس بوو، دەيويست لەناو شاری خانەقيدا شانەی چەكداری دروستبكەين و دەست بوەشێنين. سەرەتای هەفتاكان، لە ڕێكخراوی (اخوان المسلمين) نزيك بوو. سەير ئەوەبوو، ئامادەی گوێگرتن بوو. حەزی دەكرد بيروڕای جياواز و پێچەوانە ببيستێ. لە ئەنجامدا، ئەو ڕاستيەی زانی كە(اخوان) لەگەڵ شێوەی بيركردنەوەی ئەودا نــاگونجێ و بەرەبەرە هــاتوچۆی مزگەوتيشــی كۆتــايی پێهێنا، چونكە مزگەوتەكە هێلانەی ئەوان بوو.

ژياننامە و كەسايەتی و تێگەيشتن و هەڵوێستی صادق زۆر جياواز بوو. ئەو هەر بە بەرنامە چووبووە ئەندازەی ـ كيميايی، دەيويســت لەڕێگــەی زانســتەوە خەونــە مەزنــەكانی گەلەكــەی بهێنێتەدی.

ئــەو پێيوابــوو: شۆڕشــی گــەلی كوردســـتان لەبازنەيــەكی داخـراودا دەسـووڕێتەوە، خـۆی دووبـارە دەكاتـەوە، هەرەسـێك چاوەڕوانی هـەرەسێكيتر دەكـات. كارەسـات بـەدوای كارەسـاتدا دێت، نوقتـە سـەری دێڕ. شۆڕشـی گـەلی كوردسـتان، بـە يـەك ڕێگادا سەردەكەوێت، بەهەمان ڕێگادا دەگەڕێتە دواوە. بەدەستی بەتاڵ دەڕوات و بەدەستی بەتاڵ دەگەڕێتەوە..

(.. دەبـێ ڕێگاكـان و شـێوەی خـەبات و بـەرەنگاری بگـۆڕين: نـابێ پشـت بـە دەوڵـەتانی دراوسـێ ببەسـتين! دەبـێ خۆمـان كارگەی چەك و تەقەمـەنيمان هـەبێت. خۆمـان ((بـاروتی ڕەش)) بەرهـەم بهێنـين. شـەڕی پـارتيزانی كاريگـەری و بايـەخی خـۆی

هەیە بۆ بەزاندن و دەرپەڕاندنی هێزی چەکداری رژێم. بەڵام نابێ شەڕی کۆڵان بە کۆڵان و شەقامەکانی پایتەختمان بیربچێتەوە. شەڕی مینکاری و تەقاندنەوە ((حرب المتفجرات)). سوپای رژێم تووشی ئیفلیجی دەکات و کاریگەری هێزەکانی دە بەرامبەر جارانی لیدێت. دوژمن لەناو جغزێکی داخراودا قەتیس دەکرێت!

من سەرچاوەیەکی زۆرم لەسەر دروستکردنی بارووتی رەش خوێندۆتەوە و لەگەڵ ژمارەیەک پسپۆر و مامۆستای زانکۆدا قسەم کردووە. واتە: هەنگاوەکان لەڕووی تیۆرییەوە دەزانم، بەڵام بۆ دانانی کارگەی بەرهەمهێنانی بارووتی رەش و تەقەمەنی و مین، دەبێ سەردانی هەندێ شوێن بکەم، کە ئەوان کارگەی خۆیان هەیە، بۆ نمونە: رێکخراوە فەلەستینیەکان..)

صادق زمانی ئینگلیزیی بە باشی دەزانی، بە بەردەوامی گۆڤاری (نویزویک) و(نیۆیۆرک تامیس)ی بۆ دەهات و ئەوەی پەیوەندی بەکوردەوە هەبووایە بۆی وەردەگێراین.

**مامۆستا موحسین عەلی ئەکبەر:** تەمەنی (٢٥) ساڵ دەبوو. پیاوێکی هێمن، خوێندەوار، هونەرمەند، دەنگخۆش، خۆشنووس، سەرناس، دووربین.. تاد. کاتی خۆی لە (پەیمانگەی مامۆستایان) پێکەوە بووین. هەر پێکەوەش خانوومان گرتبوو. پێکەوە کتێبمان دەکڕی و پێکەوە دەمانخوێندەوە. بە یەکەوە سەردانی مامۆستا جەعفەر و مستەفا رابەر و مامۆستا موعتەسەم بەرزنجیمان دەکرد. هەڵوێستمان بەرامبەر هێزە سیاسیەکانی کورد، بەرامبەر بە رژێم، هەر زۆر لەیەکەوە نزیک بوو. لەئەنجامدا پێم گوت: من

لە ڕێکخراوێکی سیاسی نهێنی کاردەکەم کە ناوی کۆمەڵەیە، ئەویش دژ نەبوو لەریزەکانی ئەو ڕێکخراوەدا ناونووس بکرێت.

**عیماد ئەحمەد:** خوشکەزای مامۆستا موحسینە. بەهۆی مامۆستاوە ئەوم ناسی. ساڵی ١٩٧٤ واتە: لەکاتی شۆڕشدا، لەئاوایی مەحمود قەجەر (مەجید قادر ئاغا) لەوێ، لە بارەگای لقی لاوانی دیالا، یەکترمان بینیەوە. لەبن (کەڵوەز)* یێکدا هاوینە هەوارێکمان لەرۆژهەلاتی گوندەکە دروست کردبوو. ئەم برایانە ئەندامی لق بوون (عەلی شامار، ئیبراهیم حەسەن باجەڵان، سەلام عەبدولڕەزاق، حیکمەت محەمەد کەریم، عیماد ئەحمەد و بەندە) محەمەد سایەخان لێپرسراوی لق بوو. دەیان هاوڕێ و برای ئازیز لەوێ دەژیان، یان زوو زوو سەردانیان دەکردین (بێباک شێخ عومەر دەکەیی، نەریمان مەحمود دەربەند فەقەرەیی، ئیسماعیل حەسەن باجەڵان، فەیسەڵ شێخ ڕەشید تاڵەبانی**، عەبدولکەریم عەبدوڵڵا قاسم تۆڕنەچی، مامۆستا محەمەد سەعید، حەمید ئەکبەر، محەمەد عەلی ئازاد، کەمال محەمەد ئەمین... تاد).

بەشی زۆری ئەندام و لایەنگرانی کۆمەڵە، هاتبوونە شاخ و کارو چالاکی خۆیان دەکرد. رەخنەی توندیان لە هەندێ دیاردەی سیاسی و کۆمەلایەتی دەگرت. بەدرێژایی ئەو ساڵە

---

*کەڵوەز:واتا (شوێنێک بوو لەنزیک گوندی (مەحمود قەجەر): تاوێرکی ڕێک و پان. جۆگەیەک ئاو، لەسەرەوە دەرژایە خوارەوە. ئێواران لەسەر تاوێرەکە جێگەمان رادەخست، بەرۆژیش لەبن کەڵوەزەکە، کە سێبەر و فێنک بوو، بەتانی و مەتانیمان رادەخست و لەگەڵ میوانەکاندا، رۆژمان بەنووسین و خوێندنەوەو یاری شەترنج بەسەر دەبرد.. تاد.

** شەهید سیروان تاڵەبانی

تـەنیا لێپرسـینەوەیەکی سـادە، لەلایـەن پاراسـتنەوە لەگـەڵ دوو کەسدا کرا. جارێکیـان عیمـاد ئەحمـەد بۆ (باوەهـای)*** بـانگکرا. جارێکیتر عەلی شامار رەخنەی توندی لە سـەرکردایەتی شۆڕش گرتبـوو. هــەردووکیان ئاگـادار کرابوونــەوە، لــە هــەر جـۆرە سووکایەتی و رەخنە و قسەی نابەجێ خۆیان بپارێزن.

**کۆمیتەی (هەرێمی باوەڕ)**: رێکخستنی کۆمەڵە بوو، لەناوچەی خانــەقی. ئەنــدامانی کۆمیتــەی هــەرێم بریتیبــوون لــە (ســـەلام عەبدولرەزاق، عیمـاد ئەحمـەد، حیکمـت محەمـەد کـەریم و عـەلی شـامار و بەنـدە) هـەموو ئەنـدامانی کۆمیتـەی (هـەرێمی بـاوەڕ) لەهــەمان کاتـدا ئەنـدامی لقـی لاوانـی دیـالای (پ. د. ک) بـوون. ئیبراهیم باجەڵان ئەندام لق بوو، لەکۆمەڵەوە نزیک بوو. تـەنیا محەمـەد سـایەخان سـەرۆکی لقـی لاوان بـوو، ئەنـدامی کۆمەڵـە نــەبوو، ئەوکاتــە ئێمــە گومــانی ئــەوەمان لێــی هــەبوو، گوایــە: پاراسـتنە! ئـەوەی راسـتی بێـت محەمـەد سـایەخان، پیـاوێکی بـە ئەزموون و هەر بەراستی دەوری برا گەورەی دەگێڕا و بـە دڵ و بـە گیـان ئێمـەی دەپاراست و ئامۆژگاری دەکردین و داکۆکی گەرمی لێدەکردین.

• عیمـاد ئەحمـەد: تەمـەنی نزیکـەی نۆزدە سـاڵ دەبوو. لاوێکـی چاوکراوە، وریا، گـورج گـۆڵ، خـەمخۆری هـەمووان. لەپەیوەنـدی کۆمەلایەتیدا خاوەن تۆڕێکی بـەربلاو بـوو. لەتەمـەنی نـۆ سـالاندا

*** باوەهــای: ئــەم شــوێنە دوو ســێ کیلۆمــەتر لەمــەحمود قەجــەرەوە دوورەو لـەدوولاوە سـنووری ئێرانـە. بارەگـای لقـی (٥) ی (پ. د. ک) سـالی (١٩٧٤ـ ١٩٧٥) لەوێ بوو..هەروەها ویستگەیەکی رادیۆشی لێبوو.

بـــاوکی لەدەســـت دابـــوو. بـــەکارو کەســـابەت و کرێکـــاری و وەستایی، دایک و خوشک و براکەی بەخێو دەکرد.

ڕۆژی هـــەرەســـهێنانی شـــۆڕش، زۆر کەســـم بینیـــوە بـــەکوڵ فرمێســـکیان هەڵوەرانـــدبێت، بـــەڵام کەســـم نـــەبینیوە وەک عیمـــاد بـــەکوڵ بگـــری، ڕۆ ڕۆ بـــۆ شۆڕشـــێک بکـــات، کـــە ئـــەم ئەوەنـــدەی ســـەرەدەرزیـــەکیش بەرژەوەنـــدیی تێـــدا نـــەبوو. مـــن زۆر ویســـتم هێوری بکەمەوە. ئەو بەدەم گریانەوە دەیگوت:

(رژێـــم زۆر بێشـــەرەفە، پێشـــمەرگـــە نـــەمێنێت، دەزانـــی چـــی دەکات؟ هـــەرچی شـــاخ و کێو هەیـــە بـــە شـــۆفڵ و بلـــدۆزەر لەگـــەڵ ئەرزدا یەکسانیان دەکات).

**عەلی شامار:** منالّی کۆلانێک بووین، باوک و دایک و خوشک و برای، هەر هەموو لەدەست دابوو. مـالّی مامـەکانی بـۆی ببـووە هێلانە و لەسێبەری ئەوانـدا ژیـانی بەسـەر دەبـرد. بەتەمـەن، ئـەو چوار پێنج سـالّێک لەئێمـە هەراشـتر بـوو. سـەرەتا عەرەبانەیـەکی دەستیی هەبوو، سێو، پرتەقالّ و سـەوزەی لەسـەری دەفرۆشـت. بەشێک لەکۆبوونـەوە و یـەکتر بینینمـان لای عەرەبانەکـەی عـەلی شامار بوو. ژێر عەرەبانەکەی هـەمووی کتێبی ماوتسـی تۆنـگ و شۆڕشی چین و ماچین بوو. هەر کەسێک سـلاّوی لێـی بکردایـە، یان دوو کیلۆ تەماتەی لـێ کڕیبایـە، یەکسـەر باسـی(پرۆلیتاریا) و (شۆڕشـی جوتیـاران و شـەڕی پـارتیزانی) بـۆ دەکـرد و چەنـد نامیلکەیـەکی ماوتسـی تۆنـگ و کـیم ئیـل سـۆنگی دەخسـتە بـەر باخەڵیـــەوە. عـــەلی (کـــەپیتال)ێکی بچـــووکی پێکـــەوەنا و پـــاش ماوەیـەک دوکـانێکی لای مـالّی (خـەلیل بـەگ) کـردەوە. نوقـلّ و چکلێـت و مەساسـە و فرفـارە و میزلّـدانی دەفرۆشـت، لایـەکی

ڕەفەکان وردەواڵە بوو، لایەکی تری نامیلکە و کتێب.. دەیگوت: (دەبێ میشکی گەنجان روون بکەینەوە، با چاو بکەنەوە، لە ژیان تێبگەن. کە بەرچاویان روونبووەوە، دەبنە هێزێک، گەورەترین قەڵای زۆرداران دەڕووخێنن).

دوکانە چکۆلانەکەی هەمیشە وەکو (کەشتی نوح) جمەی دەهات و جێگەی گفتوگۆ و شیکاری سیاسی و بیروڕا گۆڕینەوە بوو. هەر کەسێک سەری کێشابێتە دوکانەکەی عەلی شامار، هەستێکی ئەوتۆی لا دروست دەبوو: ڕاپەڕین و شۆڕشی پرۆلیتاریا دەتەقێتەوە و دیکتاتۆری پرۆلیتاریا لەسەر رووباری ئەڵوەن دادەمەزرێت. قەڵەمە و کۆزەڕەقە و نەیکەنە و قامیشەڵان هەر هەمووی دەبنە سوڵخۆزو کۆڵخوزو جڤاتی هەرەوەزی.

# ڕێژی دۆبرە
## (٣)

کتێبەکەی (ڕێژی دۆبرە)*م دەخوێندەوە، کە ناوی (شۆڕش لەناو شۆڕشدا)ی لێناوە: دەستەیەکی چەکدار (فۆکۆس)** دەتوانن بزاڤێکی چەکدار دروست بکەن و شۆڕش هەڵگیرسێنن. نە حزب و نە چاوەڕوانکردنی پێگەیشتنی هەل و مەرجی شۆڕشگێڕانە پێویست نین. بارودۆخی وڵاتانی بەناو (جیهانی سێیەم) لەگەڵ جیهانی یەکەم و دووەمدا زۆر جیاوازە. یەک (فۆکۆس)ی شۆڕشگێڕانە دەبێتە هۆی ئەوەی سەرانسەری ئەو وڵاتە کڵپەی شۆڕش بەرپابێت و دەسەڵاتی سۆسیالیستی دامەزرێت.

لەپڕ لەدەرگا درا. ئەو زەمانە هەر لەدەرگا بدرایە، چاوەڕوان دەکرا ئەمن و موخابەرات بەر دەرگایان گرتبێت و ماڵ بپشکنن و کەلەپچە کردن و جوێنباران دەست پێبکات. لەپەنجەرەکەوە بەخێرایی سەیرم کرد. زانیم میوان، میوانی منە. عیماد ئەحمەد

---

* ڕیژی دوبرە: Regis Debray (١٩٤٠ ـــ) فەیلەسوف و نووسەر و پرۆفیسۆرێکی فەڕەنسییە، نووسەری کتێبی (شۆڕش لەناو شۆرشدا)یەو زۆر دۆستی کاسترۆ و رائول و چی گوارا بووە. ساڵی ١٩٦٧ لەبۆلیڤیا لەگەڵ چی گوارا دەبێت، کاتێک چی گوارا هاوڕێکانی دەکوژرێن، ئەم دەستگیر دەکرێت و سێ ساڵ حوکم دەدرێت. لەبن گوشاری رای گشتی و حکومەتی فەڕەنسی ئازاد دەکرێت. دۆست و هاوڕێ وراوێژکاری سەرۆکی (چیلی) سلڤادۆر ئەلەندی (١٩٧٣) دەبێت تا رۆژی کودەتاکەی پینۆشێ.

** فۆکۆس Focus بەعەرەبی: بؤرة ـ (البؤرة الثورية)

لەبەر دەرگا وەستابوو. شپرزەیی و نا ئارامی و پەرۆشی بەدەموچاویەوە دیاربوو. بەبێ پێشەکی یەکسەر گوتی: ((دەتوانی هەر سبەی فریای مولازم جوامێر بکەوی ؟)).

منیش گوتم: بەسەرچاو! هیچ بووە ؟)).

عیماد: ((مولازم جوامێر بۆ بەغدا گەڕاوەتەوە، لیستێکی (٧٥) کەسیی پێیە، هەرکەسیانی بەردەست کەوت ساردی بکاتەوە..)).

(( ئەرێ بەر گوێت نەکەوتووە ناوی کێ لەسەر لیستی ناوەکان دانراوە ؟)).

عیماد گوتی: ((لەناو حزبی بەعس محەمەد عایش، بدن فاضل، عوسمان محەمەد فایق.. لەناو کوردیش: مەلا ماتۆر، شێخ ستار، حەبیب محەمەد کەریم، دارا تۆفیق، سالح یوسفی..تاد))..

((چۆن ئەم ناوانە هەڵبژێردراون ؟)). من بەسەرسوورمانەوە ئەم پرسیارەم ئاراستەی عیماد کرد، ئەویش ئەم روونکردنەوەیەی پێشکەش کردم:

((عوسمان محەمەد فایەق، سەرۆکی دەزگای هاوکاریە و دوژمنی سەرسەختی کولتوور و رۆشنبیری کوردە. لەسەر لاپەڕەی رۆژنامە و گۆڤارەکان بە بڕیاری ئەو وشەی ((کورد)) و((کوردستان)) و ((کوردەواری)) و ((کوردایەتی)).،، تاد. قەدەغەکراوە. گەورەترین گوشاری خستۆتە سەر روناکبیرانی کورد. ئەو سانسۆرەی ئەم کابرایە لەسەر بڵاوکراوەی کوردی سەپاندوویەتی، لەهیچ سەردەمێکدا ئەوەندە توندو قێزەوەن نەبووە.

محەمـەد عـایش و بـدن فاضـل*، دوو سـەرکردەی سـەندیکای کرێکارانی بەعسین و ئێستا بەتـەنیا دەسـوورێنەوە و یـەک کـەس پارێزگارییان لێناکات و هەر زۆر بە ئاسانی لەناو دەبرێن..)).

من روومکردە عیماد و ویستم بزانم ئەو چۆن بیردەکاتـەوە ؟

(( ئەمە بیروڕای تۆیە، یان پەیامەکەی مولازم جوامێرە ؟)).

((ئەمـە ئـەو بڕیارەیـە، کـە ئـەو هێناویـەتی و پەیوەنـدی بـە تێگەیشتنی منەوە نییە!)).

گوتم: ((سـەبارەت بـە عوسـمان محەمـەد فایـەق، بکوژرێ یـا نـەکوژرێ هـیچ لەچارەنووسـی گـەلی کـورد ناگۆڕێـت! بـە پێچەوانـەوە، رەنگـە بـە کوشـتنی یـەکێکی وەکـو ئـەو تـۆڕی رێکخسـتنی ئێمـە تووشـی ئاشـکرابوون و گـرتن و کوشـتن و ڕاوەدوونان ببێت! لـەناوبردنی کەسێکی وەکو ئـەو، ئـەو هـەموو قوربـانی و زیـان بەرکەوتنـە ناهێنێت. عوسـمان محەمـەد فایـەق لەچاو ئەندامـەکانی ئێمـەدا هـەر هیچ نییـە. راسـتە رژێم لـەبواری راگەیاندا ئەو بە سەگی پاسەوانی دەزانێت، بەڵام قورسـایی ئـەو لەناو سیستێمی سیاسیدا، ئەوە نییە ئێمە چارەنووسی خۆمـانی بۆ بخەینە ناو دەستی دێوەزمەی دەزگا ئەمنییەکانی رژێمەوە.)).

ئەو گوتی: ((سـەرانی رێکخسـتن هـەر هـەموویان دەنووکیـان لەسەری داناوە..)).

من درێژەم بەقسەکانی خۆمدا:

---

* لەکودەتاکەی سـەدام لـە سـاڵی ١٩٧٩ دژ بـە ئەحمـەد حەسـەن بەکر ژمارەیـەک تێوەگلێنران و لەناوبران (بدن فاضل و محمد عايش )یش لەگەڵ ئەواندا راپێچ کران..

((مـن كوشـتنی محەمـەد عـایش و بـدن فاضـلیش بـەڕاسـت نـازانم. ئەمانـە هـەر لەبـەر ئـەوەی پاسـەوانیان نییـە و بەتـەنیا دەسووڕێنەوە، وەکو نێچیرێکی قەڵەو سەیریان بکەین و لوولـەی دەمانچەیان ئاڕاستە بکەین ؟)).

عیماد: ((ئەو برایانە دەڵێن: راوێکی ئاسـان و دەنگدانەوەیـەکی سیاسی زۆر گەورەی دەبێت!)).

بەرسیڤی من هەر زۆر روون بوو:

((دڵنیابە سەدام حوسـێن، پێش خـەڵکیتر، بڕیـاری ئیعدامی بـۆ ئەمانـە دەرکـردووە. ئـەو دەیـەوێت، لەهـەلێکی گونجـاودا ئەمانـە لـەناو ببـرێن. ئێمـە بـۆ ببینـە داردەسـتی ناڕاسـتەوخۆی سـەدام و پلانەکەی ئەو پێشوەخت جێبەجێ بکەین ؟ بۆ کارێک بکـەین ئـەو شادو دڵخۆش بێت؟)).

عیمـاد: ((دڵنیابـە مـن وەکـو تـۆ بیردەکەمـەوە، بۆیـە بەپەلـە بـۆ ئێرە هاتووم)).

من لەسـەر سـەرجەم بڕیارەکان بێتاقەت بووم:

((حەز دەکەم بزانم بۆ و کێ بڕیـاری تیرۆرکردنـی دارا تۆفیـق و حەبیب محەمەد کەریم و ساڵح یوسفی .. تاد. دەرکردووە ؟)).

عیمـاد: ((گوایـە ئەمانـە بەرپرسـیارن لەهەڵـەکانی شۆڕشـی ئـەیلول و هەرەسـی ١٩٧٥ و بەرپرسـیارن لەهـەموو قوربـانی و ماڵوێرانی و کارەساتەکان، کە بەسەر کورددا هاتوون..)).

مـن بـە ئـامرازی پـەڵپ و بیـانووی ئـەوان بـۆ تاوانبـارکردنی سەرکردەکانی شۆڕشی ئەیلوول رازی نەبووم:

((ئەمانــە پیــاوی تێکۆشــەر و ســەرکـردە بــوون. شــۆڕش بەشێوەیەک هەرەسی هێنا، هیچ کەس نەیتوان بەخۆشمانەوەی بەردەم هەرەسەکە بگرێت! ئێستا ئەمانە وەکو دیلی شەڕ وان، وەکو کەسایەتی تێکشکێنراوو دۆڕاو هەڵس و کەوتیان لەگەڵدا دەکرێت، رۆژانە هەزاران سووکایەتییان پێدەکرێت و ناتوانن داکـۆکی لەخۆشـیان بکـەن، هــەموو چرکەیــەکیان مردنێکــی بەکاوەخۆیــە، بــەلاّم گیانیــان دەرناچێــت و رزگاریــان نابێــت... بەکوشتنی ئەمانەش چی دەگۆڕین ؟)).

عیماد: "من بۆ گفتوگۆ و بیرورِا گۆڕینەوە بۆ لات نەهاتووم. منیش وەکـو تـۆ بـڕوام وایـە: ئەمـە کـارێکی هەڵەیـە و نـابێ بەهەڕەمەکی بڕیاری کوشتنی خەڵک دەربکرێت و کاریگەری و کاردانەوەکان لەبەرچاو نەگرین! پێویستە تۆ سبەی بۆ بەغدا بڕۆیـت و پێشـگیری لـەڕوودانی کارەسـاتێک بکـەیت. مـولازم جوامێر سایەمیرت بینی، دەتوانی پێی بسەلمێنیت ئەم بڕیارە هیچ سوودێکی نییە و ئەم گورزانە بەر تەپڵی سەر و بڕبڕەی پشــتی رژێــم ناکــەون. ئەگــەر زوو فریــا بکــەویت بڕیارەکــە هەڵدەوەشێتەوە، یان پێداچوونەوەی بۆ دەکرێت و قەناعەتیان پێدەکرێت..)).

دەمزانی کارەکە ئاسان نییە و بڕیار لەسەرەوە بۆ خوارەوە دادەبەزێت..

((مـن سـبەی بـۆ بەغـدا دەچـم و هـەوڵی بێسـنووری خـۆمی لەگەڵدا دەدەم. بەلاّم چۆن و لەکوێ یەکتر ببینین ؟)).

عیماد: ((پەرلە ـ مان* داناوە. سەعات چواری پاش نیوەڕۆ دێتە چایخانەیەکی (ساحة التحریر) تۆ هەر چاوت پێیکەوت. ڕۆژنامەیەک بەدەستەوە بگرە و ئەم دەست و ئەو دەستی پێبکە و بڵێ: ڕۆژباش! چۆنی باشی! ئەو ناوی کاک (هیوا)یە و با تۆش ناوت (ئەحمەد) بێت..)).

* پەرلە: کلمة سر، وشەیەک یان دەستەواژەیەک لەنێوان دووکەس، بەنهێنی دادەنرێت، بۆ ئەوەی هەردوولا بەهۆی ئەو وشەیە هەڵەیەک نەکەن.

# جوامێر سایەمیر
## (٤)

مام جەلال ئەم سەربردەیەی لەسەر مولازم جوامێر بۆ گێڕامەوە: ((جاریکیان دعوەتی (فاضل البراک ـ مدیر الامن العامة) بووین. فاضل البراک گوتی: ئێوە، کە خاوەن یەکێکی وەکو مولازم جوامێر بن، هەردەبێ سەرکەوتن وەدەستبهێنن. ئەم پیاوە لەژووری ئەشکەنجەداندا بوو، هەرچی ئازار دەدرا، بچووکترین جوڵەشی نەدەکرد. ڕۆژێک شیشێکیان بە نەرمەی رانی راستیا کرد.. ئەشکەنجەدەران پێیان گوت: تۆ کوڕێکی گەنجی حەیفە بکوژرێیت. داوای لێبوردن بکە و خۆت دەتوانی هەر ئێستا بڕۆی.. جوامێر بێدەنگی هەڵبژارد. شیشێکی تریان بەرانی چەپیا کرد. ئەو پیاوە، چرکەی نەکرد. شیشیان بە قۆڵی راست و چەپیا کرد. پێیان گوت: پارچە پارچە دەکرێیت. تۆ پیاوێکی قۆز و جوانی حەیفە لەناوبچیت! ئەو گوتبووی من کاتێک ئەم ڕێگایەم بۆ خۆم هەڵبژاردووە، ئەم ڕۆژەشم لەبەرچاو گرتووە.. هێزێکی سیاسی پاڵەوانی ئەوتۆی هەبێت، ئەمڕۆبێت یان سبەی، هەردەبێ سەرکەوتن وەدەستبهێنێت..)).

یەکەمین جار، ساڵی ١٩٧٤ لەدەربەند بێلوولە، مولازم جوامێرم ناسی. تەمەنی (٢٧) ساڵ دەبوو. ئەوکاتە سەرلقی هێزی پشتیوانی (ئیسناد)ی بەتالیۆنی بەمۆ بوو. پیاوێکی ئازا، بوێر، چالاک، پڕ جموجۆڵ، هێزەکەی ئەو هەمیشە لەهێرش و پەلامار دابوو، دژی هێزە چەکدارەکانی ڕژێم. ئەو لەناو هێزی

پێشمەرگەو کۆمەڵانی خەڵکدا خۆشەویسترین کادری سەربازی و نمونەی فیداکاری و دڵسۆزی بوو.

گیانێکی پتەوی وەرزشکارانە، مووزەرد، سوروسپی، کەڵەگەت و جوانخاسبوو. هەموو جارێک بە سوعبەتەوە پێم دەگوت:

((تۆ لەریزێ دۆبرە دەچێت. ئێستا لەفەرەنسا یان ئیتالیا بوویتایە، کەس گومانی ئەوەی نەبوو، کە تۆ ئۆروپی نەبیت..)).

ئەویش دەیگووت: ((ریژە دۆبرە کێیە ؟)).

((هاورێی چی گوارە و رائول و فیدل کاسترۆ بوو..)).

کاتێک جوامێرم لەبەغدا بینی، قژی درێژتر کردبووەوە، سمێڵە زەردەکانیشی شۆڕترکردبووەوە، چاویلکەیەکی رەشی هەتاوی، دیمەنێکی ئەوتۆی پێدەدا، بە ئاسانی نەناسرێتەوە. جانتایەکی بچووکی رەشی بەدەستەوە گرتبوو، دەمانچەیەکی تۆپڵی تێدا قایم کردبوو. ئەو گوتی: ((ئەم چایخانەیە زۆر گوماناوییە، هەستە با بڕۆین بۆ چایخانەیەکیتر، ئەوبەری (الجسر الجمهوری) خەڵکی ئاسایی سەردانی ناکەن و چای تێدا ناخۆنەوە، چونکە بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی (الامن العامة)یە. پیاوی چاک قەت رووناکەنە ئەم جۆرە چایخانەیە.)).. ئەو بەدەم قسەکردنەوە، بە بەردەوامی پێدەکەنی، سەیری ئەملاو ئەولای خۆی نەدەکرد و هیچ شڵەژان و پەشۆکاویی پێوەدیار نەبوو. کاتێک بەسەر شۆستەکاندا هەنگاوی دەنا، هەستت دەکرد پڵنگێکی توورەیە، درِ بەشەقامە خنکاوەکانی پایتەخت دەدات. پێموابوو هەروەکو چۆن جاران لەبەشێکی گەرمیاندا سوپای دوژمنی هەراسان کردبوو، ئێستاش ئەمە ئەو پڵنگەیە، کە رووی

کردۆتە بەغدا و دەیەوێت، ئەوێ لەچەقەڵ و مەقەڵی گەڕوگوڵ پاک بکاتەوە.

من هەر زۆر بە راشکاوانە گوتم:

((تــــۆ لەشـــــاخ ســــــەرکردەیەکی پێشــــــمەرگەیی زۆر سەرکەوتووبوویت، من پێموانییە لەناو بەغداشدا بتوانیت هەمان سەرکەوتن وەدەستبهێنیت!)).

ئـەو گـوتی: ((بچـوکترین کـاری پێشـمەرگانە لەناوەڕاسـتی پایتەختـدا، سـەد ئەوەنـدەی گـەورەترین داسـتانی پێشـمەرگانەی شاخەکانی کوردستان دەنگدانەوەی هەیە!)).

من گوتم: ((گومـانم لەقسـەی تۆ نییـە، بەڵام ئەمە بە خەڵکی تریش دەکرێت و تۆ لەشاخ درێژەت بەخەباتی خۆت بدایە چاکتر بوو..)).

((من دەتوانم لێرەش پەلاماری دوژمن بـدەم. لێرە پەلامارەکـە لە نزیکەوە دەبێت و لە شاخ پەلاماردان دوور بەدوورە..)).

ئەو لە قـەبارەی مەترسیەکانی مـن بەئاسـانی تێنەدەگەیشـت، بۆیە من پرسیارەکەم لەدیوێکی ترەوە خستەڕوو:

((تۆ من دەناسی ؟)).

(من تۆم نەبینیوە.. نا.. نا.. بڕواناکەم!)).

((ئەمــە کێشــەیەکی تـرە، خــەڵکێکی زۆر دەتناســن و تــۆ نایانناسی!)

ئەو قسەکەی پێبڕیم: (( دڵنیابە لێرە کەس نامناسێت!)).

گوتم: (( هەر بەراست قەناعەتت وایە کەس لێرە ناتناسێت؟)).

((بەڵێ! دڵنیام.. ماوەیەکی دووردودرێژە من لێرە نەبووم!)).

پرسـیارەکەم دووبـارە دەکەمـەوە: ((تـۆ پێشـتر لەشـوێنی تـر منت بینیوە؟)).

((نەخێر!)).

گوتم: ((باش بیر بکەرەوە..)).

گوتی: ((بیرم ناکەوێتەوە، پێشتر لەشوێنێک تۆم بینیبێت!)).

گوتم : ((لە بەمۆ سێ ساڵ لەمەوپێش سەرلقی هێزی پشتیوانی (ئیسناد) نەبوویت ؟)).

((بەڵێ!)).

((.. بەردەوام نەدەهاتی بۆ قوتابخانەکەی باخ هەنارە.. سەردانی مامۆستا جەبار، حەسەن، جەلالت نەدەکرد.. پاشان چووین بۆ ناو پەڵەچنارەکەی دەربەند بێلوولە بەرامبەر بارەگای بەتالیۆنی بەمۆ پێکەوە فراوێنمان نەدەکرد ؟)).

ئەو گوتی: (( وایە.. وایە.. بەڵام بۆ تۆم بیرناکەوێتەوە؟)).

گوتم: ((لەمەشدا شانسم نییە!)).

ناونیشانەکانی من زۆر وردبوون. بەکەوچکە فافۆنە رەش هەڵگەڕاوەکەی چاکەی شێواند. فرێکی لەچاکەدا، هەروەکو کەسێک بەناچاری بڕوا بەراستییەک بهێنێت، کە پێیخۆش بوویێت، درزی قووڵ دیواری قەناعەتەکەی لێکبترازێنێت...

((کاک جوامێر من ویستم تەنیا ئەوەت پێبڵێم، سەدان کەسی وەکو من دوورونزیک تۆیان ناسیوە، تۆ ئەوان ناناسیت! واتە: ئەم بازنە فراوانەی ناسین، رەنگە کێشەی چاوەڕواننەکراوی لێبکەوێتەوە..)).

# پێشمەرگەی نوێ
## (٥)

سەبارەت بەسەرەتاکانی شۆڕشی ئەیلول و دروستکردنی هێزی پ. م وێنایەکی تەمومژاوی لەمێشکماندا هەبوو. پێمانباشبوو، ئەو ئەزموونە دووبارە نەکەینەوە، چونکە سەردەمەکە گۆڕانی بنەڕەتیی بەسەردا هاتبوو.

ئەوەی لەکتێبەکانی ریژێ دۆبرە و چی گوارە و جیاب و ماو نووسرابوون، ئەوە چاوەڕوان بووین، هاوڕێیان بەزووترین کات (بنکەی سوور) و سوپای سوور و راپەڕینی جووتیاران رابگەێنن.

راستە ئێمە لەسەر شۆڕشی نوێ، لەچاو خەڵکی ئاساییدا، برێک زانیاری ئاڵۆزکاومان هەبوو. لەسۆنگەی بڵاوکراوە، دەنگوباسی ناو هێڵەکانی رێکخستن، بینینی پ. م وێنایەک لەمێشکماندا گەڵاڵە ببوو، بەڵام شارەزایی و ئەزموونی مولازم جوامێر زۆر جیاواز بوو.

((..ژمارەی پێشمەرگەکان زۆر کەمن. لەناو دەستەی چەکداری بچووک بچووکدا رێکخراون. جووتیارەکان نائومێدن و زۆر لێمان بەگومانن و بەگەرمی پێشوازیمان لێناکەن. چەک و تەقەمەنی زۆر کەمن. کلاشینکۆف، برنەو، دەمانچە بەرامبەر تانک و هەلیکۆپتەر و تۆڕی فروانی هەواڵگری و جاسوسیی.. زۆر زۆر بەئاگا و وریا نەبین هەر بەرۆژی نیوەڕۆ دەمانکەنە

پۆڕی خوراو. شەوان دەچینە دێهاتەکان و کۆبوونەوە لەگەڵ جووتیاراندا دەکەین. بەرۆژ لەپەنای کاوو تاشەبەردو دەوەن و پەناو پەسێر خۆمان قایم دەکەین. رۆژانە پەروانەی هەلیکۆپتەرەکان ئەوەندە نزم دەبنەوە سێبەر لەسەر سەرمان بڵاودەکەنەوە.

من گوتم: ((کەواتە: هەلومەرجی بابەتی و زاتیی بەرپاکردنی شۆڕش نەخەملیوە و جووتیاران لەخەباتی ئاشکرا دەپرینگێنەوە..)).

ئەو گوتی: (هەلومەرجی چی ؟ رادەی نائومێدی و بڕواپێنەبوون سنووری خەیاڵی بەزاندووە..)).

زانیارییەکانی تینوویەتی نەشکاندم:

((خەبات و تێکۆشان بەزۆرەملێ ناکرێت.. دەبێ چەکەکان تا رادەیەک هاوسەنگ بن!)).

جوامێر گوتی: ((ئێمە شەڕێکی نا هاوسەنگ و نا بەرامبەر دەکەین: پیادە بەرامبەر پیادە شەڕ ناکات. ئێمە لەسەنگەری سەر شاخ و بەرزایی، ئەوانیش پۆل پۆل لەناو بۆسەیەکی قایم چاوبکەنەوە. هەلیکۆپتەر سەنگەرێکی پۆلایینی گوللەنەبڕی بەرزو جوڵاوە، بەسەر سەرتەوە لەنگەر دەگرێت.. یەک دەستپێشخەری بۆ تۆ ناهێڵێتەوە: کشانەوە، دزە کردن و بادانەوە دەچێتە کەلی شەیتانەوە..)).

پرسیارێکی بنەڕەتیم بیرکەوتەوە:

((کەوابوو بۆ پەلەتان لەشۆڕش هەڵگیرساندن کرد، پێش ئەوەی زەمینە سازی و ئامادەکاری بۆ بکەن ؟)).

جوامێر: ((سەرەتا بەتەمای شۆڕش راگەیاندن و تەق وتۆق نەبووین.. دەستەی بچووک بچووکی پ. م بۆ هۆشیارکردنەوە(فرق الدعاية المسلحة)، ئەمە تەنیا بۆ ئەو ئەندامانە بوو، کە رژێم بڕیاری گرتنی بۆ دەرکردبوون. دەمانویست زەمینەسازی بکەین و تۆڕی رێکخستن بەهێز بکەین و بەرە بەرە چەک و تەقەمەنی و پێداویستی پەیدا بکەین..)).

جیهانی تیۆری شتێکە و داروبەردی واقیع شتێکیتر. راستی زۆر تاڵە، زانینی راستیەکان و دۆزینەوەی چارەسەر، هەر زۆر لەوە چاکترە، مرۆڤ سەری خۆی بکاتە ژێرلمەوە...

((ئایا بەبێ ئامادەکاری شۆڕش هەڵدەگیرسێنرێت ؟)).

جوامێر: ((هەڵە کوشندەکە لێرەوە دەستپێدەکات: ئێمە بڕیارمان دابوو، لەڕووبەڕووبونەوەی سەربازی خۆمان بپارێزین.. کەچی مام جەلال و هەڤالانی شام هەر زۆر بەپەلەبوون و پێیانوابوو لە٢٦ / ئابی١٩٧٦ واتە: هەر یەک دوو مانگ پاش هەڵگیرساندنی شۆڕش، لەبەغدا باڵی سوریی حزبی بەعس کودەتا دەکات و هانی خەڵکیان دەدا بە لێشاو رووبکەنە شاخ و کورد لەئاهەنگی دابەشکردنی کێکی پاش کودەتای سەربازیدا بێبەش نەبێت!)).

کە ئەم رستە و پرۆژەی بەلارێ بردنەم بەر گوێ کەوت، حەزم نەدەکرد بڕوای پێبکەم:

((جەنجاڵی کودەتای سەربازی لەکوێ و شەڕی پارتیزانی درێژخایەن لەکوێ؟ ئەمە لەهەموو روویەکەوە هەڵەیە. کودەتاچی هەر کودەتاچییە، ئیدی بەعسی بێت یان نەتەوەیی.. هەر هەموو جاشی ماکەریکن..)).

جوامێر: ((نەمبیستووە عەرەبێکی کودەتاچی بڕوای بە دیموکراسی و مافی گەلان هەبێت..)).

((کەواتە: تاکتیک و پلانەکانی کۆمەڵە سەرەوبن کران.. ئیدی چۆن دەتوانرێت درێژە بەشەڕی پارتیزانی بدرێت ؟)).

جوامێر: ((شەڕی پارتیزانی درێژەی پێدەدرێت، بەڵام کارێکی ئاسان نابێت وەکو زۆر کەس چاوەڕوانی دەکەن! دەمی ئەو خەڵکە تژی ژەهر و تاڵاوی نسکۆیە. قەڵای ئومێدی گەلێک، لەناوەوە بەئاوری گومان و دڕدۆنگی رەنگی خۆڵەمێشی گرتووە.. چیای ورە هەرەسی هێناوە، بەئاسانی کۆڵەکەی بڕوا بەخۆبوونێکی تری نادرێتە بەر..)).

دەموچاوی ئەوم تا ڕادەیەک خوێندەوە. هەستم کرد، بەشێک لەخەونەکانی شاخ لەبنبەست نزیک دەبێتەوە، بۆیە جوامێر لە(دەروو)یەکی تر دەگەڕێت..

گووتم: ((مەرجە هەر دەبێ لەشاخ درێژە بەخەبات بدرێت؟)).

جوامێر: ((دەبێ شار و شاخ پێکەوە گرێبدرێن. گرەوکردن لەسەر سەرکەوتنی خەباتی شاخ، یان شار بەتەنیا باش نییە..)).

من ویستم لەگفتوگۆدا بۆ سەر ئەو خاڵە بابدەمەوە کە ئەو رێگا پڕ لەمین ومەترسیەم لەپێناویدا بڕیوە:

((چارەنووسی گەلەکەمان لەقوڕگی شێر دایە و هەزاران تەڵەمان بۆ نراوەتەوە. پێتوایە کوشتنی چەند بەکرێگیراوێک یان خۆفرۆشێک ڕەورەوەی مێژوو دەگۆڕێت ؟)).

جوامێر: ((کوشتنی خەڵک، ڕژێم زیاتر شێت و هار دەکات..)).

((ئەگەر دڵنیایت تیرۆر زیانی هەیە، بۆ کارێکی پڕ لەزیان و بێ قازانج بکەین ؟)).

جوامێر: ((من بۆ ئەو ئەرکە هاتووم و ناتوانم بەدەستی بەتاڵ بگەڕێمەوە..)).

((کاک جوامێر! ئەریٚ پێم بڵێ: خەبات وکاری ناو شارێکی وەکو بەغدا بریتیە تەنیا لەکوشتنی فڵان و فیسار، یان ئێمە دەتوانین دەیان کاری بایەخدار بکەین بۆ نمونە پەلاماردانی بانک و رفاندن و تەقاندنەوەی هەندێ پرۆژەی سەربازی ستراتیجی..)).

جوامێر: (( ئێمە پارەمان لەبەردەستدا بوایە، چەکمان پێدەکڕی و ژمارەی (پ. م)مان زۆرتر دەکرد.. چەکی کاریگەرمان پەیدا دەکرد بۆ لێدانی تانک و کۆپتەر و هێرش و بەرگری..)).

((کەواتە: کارەکەت ئاسان کردەوە، لەبری تیرۆر، با هەوڵبدەین پارە پەیدابکەین...)).

# ناوی ڕێکخراوی هەڵۆی سوور
## (٦)

صادق شەریف پێشنیازی ئەوەی بۆ کردین، لەخانەقی کۆبوونەوە نەکرێت و یەکەمین کۆبوونەوەی فراوان لەبەغدا بکرێت، لەوێ جێگە و ڕێگە هەیە و بەرچاویش نییە و سەرنجی کەسیش ڕاناکێشێت.

صادق گوتی: (( غەفووری برام لەکەڕادە ـ کرادة داخل ـ عمارة شاکر الوادی ـ ژمارە (١٠) شوقەیەکی هەیە و شوێنی دەوڵەمەندو خوا پێداوەکانە. کاکم و خێزانەکەی بەسەردان ڕۆیشتوون بۆ چیکسلۆفاکیا و کلیلەکەیان لای من داناوە. ئەم یەک مانگە کۆبوونەوە و دانیشتن و یەکتر بینین دەخەینە ئەوێ..)).

غەفوور شەریف ئەندازیار بوو، ژنەکەی* چیکسلۆڤاکی بوو. ماوەیەک بوو لەپراگ گەڕابووەوە و لەبەغدا کاری دەکرد. ئەپارتمێنتەکە بەدیکۆری ئۆروپی ڕازێنرا بووەوە، شەقڵی ڕۆژهەڵاتیی پێوەدیار نەبوو. صادق هەر بۆ سوعبەت دەیگوت: ((هەقە کۆمەڵە لەزۆربەی شارەکاندا شوقەیەکی وای هەبێت، ئەم شوێنە تام و بۆنی کۆبوونەوەکانیش دەگۆڕێت..)).

ئامادەبووان: (صادق شەریف، دڵشاد مەولود ئەفەندی، موحسین عەلی ئەکبەر، عیماد ئەحمەد و بەندە). بۆ هەر چوارمان یەکەمین جار بوو، پێ بخەینە ئەپارتمێنتێکەوە، کە لەجێگەی ژیانی مرۆڤ بچێت. هەست بکەیت بۆ چەند سەعاتێک

---

* ئێستاش هەردووکیان لەسلۆڤاکیا دەژین. ئەو ژنە ناوی (ڤیرا)یەو سلۆڤاکیە.

لەناو جیهانی ئۆروپادا ژیاویت، بەبێ ئەوەی سواری فڕۆکە بوو بێت. پەنجەرەی گەورە، لەدوولاوە، پەردە و گاردینە* شۆڕببووەوە. گوڵ و گوڵزار لەبەردەم جامی پەنجەرەکەدا، ئینجانەکانیان دادەپۆشی. تاقمێک قەنەفەی سەوزباو بۆ دانیشتن رایدەکێشایت. صادق کوڕی ماڵێکی خانەدان بوو، دەیزانی چۆن پێشوازی لەمیوان دەکات و دڵیان رادەگرێت! هەر زوو پەرداخی ئاوی لەسەر مێزەکەی بەردەمماندا دانا. خۆی دەستی کردە چا لێنان. عیماد کوپەکانی بۆ سەر مێزەکە دەگواستەوە.. چا بەدەم نوکتە و قسە و باسەوە فڕکرا.

سەعات دە کۆبوونەوە مێژووییەکە دەستی پێکرد. عیماد هەڵسووڕێنەری کۆبوونەوەکە بوو، ڕێکخەری پەیوەندییەکان بوو، لەگەڵ کۆمیتەی هەرێمەکان و هەر ئەوکاتە جارێک بەنهێنی چاوی بە شاسوار جەلال(ئارام) کەوتبوو. هەر خۆی و مامۆستا موحسین ئاگایان لە کەرتە جیاجیاکانی ڕێکخستن بوو.

ئەو وێنەیەکی گشتیی لەسەر ڕێکخراوی (خوێنی شەهیدان)** داینێ، کە پاشماوەی ڕێکخراوەکەی (لەیلا قاسم)و هەڤاڵەکانی بوو. ئەمانە هەر دوای گرتنی ئەو گروپە، خۆیان دەرباز کردبوو، هەریەکە بەلایەکدا رۆیشتبوون: بەشێک بۆ شاخ و بەشەکەیتر لەناو بەغدا دا خۆیان حەشار دابوو. ژمارەیەک لاوی کوردی خوێنگەرمی دانیشتوی بەغدابوون.

---

* گاردینە: (توول)، قوماشێکی تەنکی سپیە، لەگەڵ پەردە دا هەڵدەواسرێت.

** هەندێکیان جەختیان لەسەر ئەوە دەکرد، کە ناوی (خوێنی شەهید)ە. من پشتم بە نووسینێکی (رعد بشیر اسکندر)بەستووە، کە ساڵی ١٩٧٨ نووسراوە، خۆی ئەندامی ڕێکخراوەکە بووە.

ئـەوان دەمانچـە و فیشـەک و تەقەمـەنییان هـەبوو. تایـپ و رۆنیۆیـان هـەبوو، بـەیان و بڵاوکـراوە و نووسـین و وەرگێڕانـی خۆیـان بـڵاو دەکـردەوە. کـەرەسـتە و ئـامرازی دروسـتکردنی ناسنامەیان هەبوو بۆ ئەو کەسانەی دەبووایە زوو دەربـاز بـن و تووشی گرتن و راوەدوونان نەبن.

ئـەو زەمانـە، رێکخسـتنەکەی ئێمـە تـازە دارە دارەی دەکـرد و لەهەندێ بواردا دەسـت و پـێ سپی بوو، توانایـەکی دیـاریکراوی هـەبوو، بـەڵام کـادر و ئەنـدامی فیـداکار و بـوێر و چاونەترسـمان هەبوو. ئەو چەک و تەقەمەنییانەی لە بەغدا هـەمانبوو، بەهیمـەتی ئاشـتی و وصـفیە بـەنی وەیـس گەیێنرابوونـە پایتـەخت. کاتێـک ئـەوانمان ناسـی پێمـانوابوو هـەنگوینمان لـە دارا دۆزیوەتـەوە. بەهاریکاری و هاوسەنگەری و خەباتی هاوبەش، ئـەوان دەتـوانن سوود لە شۆڕش و خەباتی چەکداری شاخ و بـە توانـای تیـۆری و ئایـدیۆلۆژی و پەیوەندییـەکانی کۆمەڵـە لـە سـەرانسـەری وڵات وەربگـرن، ئێمـەش لـە بەغـدادا دەمـانتوانی شـان بەشـانی ئـەوان بازنـەی کـارو چالاکیمـان فراوانتر بکـەین، لەبەرئـەوەی لـە بەغدا دەژیان و دەوروبەری خۆیان باش دەناسی..

لـــەم کۆبوونەوەیـــەدا بڕیـــاردرا کاروبـــاری پێشـــمەرگانە رێکبخرێت و ناوی هـەبێت. پێشـتر ژمارەیـەک ئەنـدامی کۆمەڵـە و ژمارەیەک ئەندامی (خوێنی شەهیدان) هـەروا یـەکتریان دەبینـی و چـاودێری و بـەدواداچوونیان بـۆ مەلـەفی چەنـد بـەکرێگیراوێک دەکرد، کە دەتوانرا لەلایەن ئەوانەوە سزا بدرێن.

بڕیارمانـدا لیژنەیـەکی هاوبـەش دروسـتبکەین: سـێ ئەنـدامی کۆمەڵـە و سـێ ئەنـدامی (خـوێنی شـەهیدان) بەمـەرجێ ئـەو

ڕێکخراوە(لیژنـە) نوێیـە لەلایـەن مـولازم جـوامێر سـایەمیرەوە سەرکردایەتی بکرێت.

ئێمەش ئەومان دیاری نەکردبایە، ئەم پیاوە ئەوەندە هەیبەتی هەبوو، ئەوانـەی بیانناسیبا بەبێ سێ و دوو ڕازی دەبوون بە برا گەورەی دابنێن و گوێ بۆ قسەکانی رادێرن..

کۆمەڵـە: (جـوامێر سـایەمیر، سـەلام عەبـدولرەزاق، حەمیـد ئەکبەر)*ی دەستنیشان کرد.

خـوێنی شـەهیدان: (سـەلمان داود، جـەمال سـەعید ئیبـراهیم، عادل عەبدولکەریم) لەلایەن ئەوانەوە دانرابوون.

من پێشنیازم کرد، ناوی ئەم ڕێکخـراوە نوێیە(هـەڵۆی سـوور) بێـت و لەلایـەن ئەنـدامانی کۆمیتـەی (هـەرێمی پێشـڕەو)ەوە بـە کۆی دەنگ پەسەند کرا.

ڕێکخـراوی (هــەڵۆی ســوور) پەیوەنــدی لەگــەڵ (هــەرێمی پێشـڕەو) دەبێـت و بڕیـاری چـالاکی لـەوەوە وەردەگرێـت، هـیچ لایـەنێک نابێـت دەسـتوەربداتە کاروبـاری ڕێکخراوەیـی (هـەڵۆی سوور).

عیمــاد لەســـەر پەیوەنـــدی نێوان(هـــەرێمی پێشـــڕەو) و (ڕێکخراوی خوێنی شەهیدان) بەردەوام بوو:

((مـن تـا ئـەمڕۆش سەرپەرشـتی پەیوەندییـەکانی خۆمـان و (خـوێنی شــەهیدان)م کـردووە. لەبەرئـەوەی کارەکـانم یـەکجار زۆرن. مــن نامپەرژێتــە ســەر ئــەوەی سەرپەرشــتی ئــەم پەیوەندییانــە بکــەم، بــا یــەکێکیتر ئامــادەیی دەربڕێــت ببێتــە لێپرسراوی پەیوەندی ئێمە و ئەوان!)).

---

* حەمید ئەکبەر خەڵکی شاری خانەقی بوو، لەهەشتاکاندا لەڕووداوێکدا گیانی لەدەستداوە.

صادق یەکسەر دەستی راستی بەرزکردەوە و گوتی: (من ئامادەم بیانبینم و قسەیان لەگەڵدا بکەم..)).

عیماد، پاشان، بە تەنیا شوێن و کات و پەرلەی پێشکەش کرد و هەندێ ئاسانکاری و رێوشوێنی خستە بەرچاوی..

بڕیاردرا هەردوولا گۆڤارێکی هاوبەش بەزمانی عەرەبی دەربکەن.

داواکرا من سەرپەرشتی گۆڤارەکە بکەم. صادق بەڵێنیدا بە وەرگێڕان لەگۆڤارە ئەمریکی و ئینگلیزییەکانەوە بەشداری لەو گۆڤارەدا بکات.

(صادق لەسەر دیاردە و چەمکی تیرۆری سیاسی وتارێکی نووسی و چەند بەشێکی لەراپۆرتەکەی ئۆتس پایکی* وەرگێڕا، ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم لەگۆڤاری (نویزویک) بلاوببوەوە)

من و عیماد و مامۆستا موحسین نامەیەکمان بۆ (کۆمیتەی هەرێمەکان) نووسی. عیماد گوتی: من رەوانەی دەکەم. گەنم گرد و جۆ بلاو.

---

* ئۆتس پایک: راپۆرتێکی ئەمریکیەکان بوو لەسەر کارەساتی ساڵی (١٩٧٥) و پەیوەندی نێوان سەرکردایەتی شۆڕش و ئیدارەی ئەمریکی.

# جوجکی سوور

## (٧)

ئێوارەیەکی درەنگ، سەلام بەدواما هات و حەزی دەکرد، بەو درەنگانە پیاسەیەک بەرەو شەقامی سەعدون بکەین. کپ و بێدەنگ و مات بوو. لەناوەوە پیشی دەخواردەوەو هەورە بروسکەی هەڵچوون و پەستی و تووڕەیی، بەدەموچاویەوە دیاربوو..

ـ ((ئەریێ ئاشتی، ئاسمانی پایتەخت بەم هاوینە، سرکە و ترشیات دەبارێنێ؟)).

ـ (( ئەگەر وەزع وا بڕوات(....) دەبارێت..)).

ـ ((گرنگ ئەوەیە پزیشکمان بەرنەکەوێت..)).

هەستم کرد، بە پەلەپیتکەیەک دەتەقێتەوە. گوتم، با خۆمی لێ نەبان بکەم.

ـ (( دیارە دەتەوێ ژن بهێنێت و لە نەنکی کچەکەوە هەواڵێکی دڵخۆشنەکەرت پێگەیشتووە..)).

لەقاقای پێکەنینی داو گوتی:

((ئەم هەواڵەت لەکوێ بیستووە؟)).

(( چۆلەکەم زۆرن!)).

((لەوە دەچێت قەلەباچکەت هەبێت و دەنگوباسی لنگەوقووچت پێبگەیێنن!)).

((دۆزیمەوە.. دیارە قەلەباچکەیەک هەواڵی ناڕاستی پێ گەیاندوویت؟)).

یەکسەر زانیم یەکێک لەپەناوە پەمپی داوەو خۆی نەیوێراوە راستەوخۆ بێتە سەر خەت، ئاشتی بۆ بەرەی پیشەوە رەوانە کردووە تا مینەکانی رێگای پێبتەقێنێتەوە:

ئاشتیی گوتی: ((قسەی کەس کارم تێناکات!)).
من گوتم: ((پێبزانین یان نەزانین قسەی خەڵک کاریگەری خۆی لەسەرمان هەیە! راست و رەوان پێمبڵێ: کێشەت لەگەڵ کێدا هەیە ؟ پێشخواردنەوەو پلار، کێشەکان چارەسەر ناکەن!)).
گوتی: ((من هەر زۆر پەستم! خەریکە هەناسەم لەبەر دەبڕێت!)).
گوتم: ((منیش زۆر پەستم! پەستم لەتۆ.. پەستم لەداروبەرد..)).
گوتی: ((پەستم لەهەرێمی پێشڕەو.. ئەمانە کێن لەسەرەوە دانیشتوون و ئاگایان لەخوارەوە نییە؟ هەر بڕیاری بێسەروبەرمان بۆ دەردەکەن!)).
بەلامەوە سەیر بوو، کە بە مەزندەش ناوی یەک بە یەکی ئەندامانی کۆمیتەی هەرێمی پێشڕەو نەزانێت! چونکە ئەو لای هەمووان متمانە پێکراوترین کەس بوو.
پێشتریش ئەندامی هەرێمی باوەڕ بوو، کەچی (پێشڕەو) ئەوی رەوانەی پەراوێز کردبوو، کاری قورسی لەئەستۆ خرابوو.
((شەڕە پشیلە روویداوە، کێشەیەک نراوەتەوە ؟)). من بەپێکەنینەوە ئەم رستەیەم گوت!.
گوتی: (( بۆ من کەسیان دەناسم، دەزانم کێن و کێنین ؟)
تۆزێ تروسکایی دڵنیاییم بەئاسمانەوە دی. ئەو هەر بەگومان پێیوابووە من هەندێکیان دەناسم، ئیدی لەدڵی خۆمدا گوتم: با، گابەردی گومان لەم لاپاڵەدا بانگلۆز* بکەمەوە..
((باشە ئەگەر نازانی کێن و کێ نین و کەسیان ناناسی.. ئەی بۆ ئێستا جامی تووڕەییت بەسەر ئەواندا قڵپکردۆتەوە؟)).

* بانگلۆز: خلۆرکردنەوەی بەردی زل لەهەورازەوە.

پرسیارەکەی منی بە پرسیارێکی داخراو وڵامدایەوە:
((ئەی تۆ کەسیان ناناسیت ؟))..
((ئەی تۆ ئەوە نازانیت من لەسلێمانی دەژیم و کاردەکەم و پەیوەندیم بە ڕێکخستنی ئێرەوە نەماوە..)).
هەرکە دڵنیابوو منی تیانیم، نەیهێشت رستەکەم تەواو بکەم، یەکسەر بەتووڕەییەوە گوتی:
((کیرم بەقوزی دایکی یەک بە یەکی ئەندامانی هەرێمی پێشڕەو...)).
منیش گوتم: ((دەستت خۆش.. گوڵی خۆتت کرد..))..
((گوو بەشەرەفی هەر هەموویان))
((بەم جوێنانە دڵت ئاوی خواردەوە ؟))
گوتی: ((حەزدەکەم پارچە پارچەیان بکەم...))
((ئاشتی ئەگەر ڕێزی خۆت بگریت باشترە، ئەگینا یەکتر بینینەکەمان کۆتایی پێدێت! ئەوە باس بکە چ هەڵەیەک ڕوویداوە؟ کێ خیانەتی کردووە یان لەڕێباز لایداوە ؟))..
((باشە کام قەحپە دایک ناوی ئەم ڕێکخراوەی ناوە هەڵۆی سوور.. هەڵۆی سوور.. ئەمە ناوە ؟))..
زانیم قسەی شیرین و نەرم و نیان سوودی نییە، ناچار بووم تۆزێک کێش و ئاوازی قسەکانم توندتر بکەمەوە:
((یەکەم: فێری ئەوە ببە، لەگەڵ یەکێکی تۆزێ لەخۆت گەورەتر قسەت کرد، جوێن، قسەی ناشیرین و سووکایەتی بەکەس مەکە.. من تا ئێستا تۆم وەکو پیاوێکی فیداکارو سەربەرزو ڕەوشت بەرز ناسیوە.. دەتەوێ جوێن بە من بدەی ڕاست و ڕەوان قسەی خۆت بکە.. بەم زمانە دزێوە قسە بکەی دڵنیابە هەرچی پەیوەندیم لەگەڵ تۆدا هەیە دەپچڕێنم..

دووەم: فەرموو ئەوە من ناوم ناوە (هەڵووی سوور) بەم ناونانە کەعبە کەچ بوو ؟))..

رەنگی بڕێک تێکچوو، دەم و چاوی ئارەقی شین و مۆری دەردا..

((ئەم ناوە پەلە پەل و هەڵپە هەڵپی پێوە دیارە! ناوێکی گەورە بۆ گوندێکی بچووک!))..

((ئەو شووتییە گەورەیە لەناوکێکی بچوکەوە دروست دەبێت.. کاتێک بچووکیش بێت هەر ناوی شووتییە.. ناو پەیوەندی بەگەورەیی و بچوکیەوە نییە.. ناو ناوە! کاتێک منداڵ بوویت ناوت هەباس بوو یان مەلا چراخ ؟))..

نەیزانی چۆن وڵامبداتەوە ؟

(( با ناوی (جوجکی قرمزی)ی بوایە، یان (واڕکی سوور)* یان (کەڵەشێری سوور) بووایە!))..

- ((ئەرێ پێمناڵێیت لەکوێی ئەم دونیایەدا ناوی رێکخراوێکی پێشمەرگانەی چەکدار نراوە (جوجکی قرمزی) یان (کەڵەشێری سوور)! ئەمەی تۆ باسی دەکەی لەناوی چێشتخانە و کەبابخانەکانی رێگای (دووز) دەچێت..))..

((ئێمە هیچمان نەکردووەو تازە سەرمان لەهێلکە جووقاوە، یەک دەنووکمان نەوەشاندوو.. هەر یەکسەر بووینە هەڵۆ ؟))..

من زیاتر پێم لەسەر قسەکانی خۆم داگرت:

((هەرچی حزبی کۆمۆنیستی و کرێکاری هەیە، نە کۆمۆنیستی و نەکرێکاری و نە سۆسیالیستین! ناونان بۆ خۆ جیاکردنەوەو خۆناسین و خۆناساندنە.. لەرێگەی ناوەوە دەزانیت ناسنامەی هێزە سیاسیەکە چییە ؟)).

---

* وارک: بارۆکە: قۆناخی نێوان جوجک و مریشک.

# پارە یان دەستوەشاندن
## (٨)

چایخانەیەک لەباوەشی رووباری دیجلەدا کڕ کەوتووە. زۆربەی دانیشتووانەکەی کوڕو کچن، لەجل و بەرگ و دانیشتن و شەربەت نۆشیندا، هەست دەکەیت ئەمانە لەچاو شوێنەکانیتر مۆدێرنترن. مێزو کورسیەکان بەناو یەکتردا نەچوون، درەخت و درەختۆکە، پەرژینی بەداری مۆرد دروستکراو، بەشێک لەکورسی و مێزەکان لەیەکتر جیادەکاتەوە. گڵۆپی رەنگاورەنگ و کەم رووناکی، یەکتر ناسینەوە لەدوورەوە، دەبێتە ئاستەم. کیژێکی شان و مل ڕووت، کراسێکی سپی، بەخاڵی رەش نەخشێنراو، نیوەی رانی دادەپۆشێ. کوڕێکی گەنجی سمێڵ تەنک، بڕۆ پەیوەست، بەرامبەری دانیشتووە. هەریەکە شەربەتێک لەبەردەمیاندا دانراوە. سەیری ناو چاوی رەشی یەکتر دەکەن. دەفڕن، مەلە دەکەن، یەکتر بەرووتی دەبینن، پڕ دەمیان لە لیک دەبێت. لە لێوی یەکتر ورد دەبنەوە. دەستیان خستۆتە ناو دەستی یەکترەوە. گوێ بۆ مۆسیقا رادەدێرن. کیژەکە جارجار، پشت بەکورسێکەوە دەدات، قژە خاوەکەی بەسەر شانیدا دادەخزێتە خوارێ. مەمکە خڕو تورت و ناسکەکەی تەکانێک بۆ سەرەوە دەدات!

ئەو جوڵانەوەیە سەرنجی جوامێر رادەکێشێت:

((ئیمە لەچ خەیاڵ و ژیانێکین و ئەمانە لەچ ژیانێکدا دەژین..))..

من گوتم: ((جیاوازی ئێمە و ئەوان ئەوەیە: ئێمە بۆ خۆمان ناژیین..))..

جوامێر: ((پێتوایە ئەم خەڵکە کارەکانی ئێمە بەڕەوا دەزانن؟))..

((بێگومان ئەمڕۆ ئەوان خەباتی ئێمە بەناڕەوا دەزانن و لێمان تێناگەن.. ئەگەر سەرکەوتنمان وەدەستهێنا ئەوکاتە دەبنە پشت و پەنامان..)). من بەم شێوەیە وەڵامی ئەوم دایەوە.

جوامێر: ((ئێمە ئەمڕۆ پێویستیمان بەوانە!))..

من گوتم: ((ئێمە جوڵانەوەیەکی نوێین. خۆمان بە خەڵک نەناساندووەو کەس نەیئەزموونەدوین و نازانێت ئێمە کێین ؟ ئەندامانی ناو تۆڕی ڕێکخستنەکانی ئێمە بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن..))..

جوامێر: ((گەر ئێمە پیاوانی ڕژێم لەناو بەرین، بەمەش خۆمان بەخەڵک ناناسێنین ؟))..

گوتم: ((کوشتنی چەند کەسێک، باری ژیانی خەڵک لەخراپەوە بۆ چاک ناگۆڕێت!)).

جوامێر: ((دەبێ ئەرکی سەرشانم ئەنجام بدەم، چونکە ئێمە ئامادەکاری پێویستمان کردووە!))..

گوتم: ((دەزانیت ئەمە یەکەمین و دوایەمین چالاکی پێشمەرگانە دەبێت. پەنجا شەست کەسێک دەگیرێن و لەناو دەبرێن. سەرجەم ڕێکخستنەکانمان لەبەغدا و خانەقی هەڵدەتەکێنرێن..))..

جوامێر: ((ئێمە کاری خۆمان زۆر بەنهێنی و بەوردی ئەنجام دەدەین..))..

((کاک جوامێر گیان. من کورد هەر زۆر چاک دەناسم، کەس زمانی خۆی پێناگیرێت! ئەمڕۆ شتێکی کرد، سبەی بۆ دنیای دەگێڕێتەوە. دەزگای هەواڵگری ڕژێمیش نەنووستووە..))..

جوامێر: ((من زۆر دڵنیام لەهاوڕێکانم!))..

((ئەگەر تۆ لە تەپڵی سەری ڕژێمتدا، یان بڕبڕەی پشتت وردوخاش کرد، ئەوە گەورەترین قوربانیش بدەیت هێشتا کەمە.. کوشتنی کەسانی وەکو عوسمان محەمەد فایەق ئەوە ناهێنێت ئەو هەموو قوربانیە گەورەیەی بۆ بدەین..)). من جارێکیتر لەسەر بۆچوونەکانی خۆم سوور بووم..

جوامێر: ((ئێمە مەبەستمان بێت، هەر کەسێکمان بوێت دەتوانین لەناوی بەرین، بەسەدام حسێنیشەوە!))..

من وەکو یەکێک بڕوا بە بیستنی خۆی نەکات:

((دەتوانی سەدام حسێنیش بکوژیت ؟))..

جوامێر: ((بەبێ دوودڵی!))..

گوتم: ((ئەگەر دەتوانی سەدام بکوژیت، ئیدی عوسمان محەمەد فایەق چیە بکوژرێت یان نەکوژرێت ؟ ئەو ئەگەر بکوژرێت ڕەوتی سیاسی ڕژێمی عێراق دەگۆڕێت، بەڵام هەزاران کەسیتری بکوژرێت، یەک لەسەدی کاریگەریی کوژرانی ئەوی نابێت..))..

جوامێر: ((ئەگەر کاری بۆ بکەین وەکو ئاو خواردنەوەیە..))..

گوتم: ((دەتوانی ڕوونکردنەوەی زۆرترم بدەیتێ..))..

جوامێر: ((سەدام و داروودەستەکەی زۆرجار سەردانی (نادی الصید) دەکەن. من لەو ناوەدا، لەماڵی خزمێکم خۆمم شاردۆتەوە. زۆرجار لەپەنجەرەکەوە چاودێری ئەو دەوروبەرە دەکەم و زانیاری زۆرم کۆکردۆتەوە. پێویستیم بە قەناسێکە و

هیچیتـــر. بـــەڵێن دەدەم، تـــەنیا بەیـــەک گوللـــە تـــەپڵی ســـەری هەڵدەگرم..))..

گـوتم: ((جـاران تـۆ بـە گوللـە تـۆپ ئـاڵای عیراقـت لەسـەر مەرکـەزی پۆلیس دەپێکا، ئەگـەر بـە قەناسـیش هـەروابیت، ئـەوە دڵنیام ئەو کارە بە ئاسانی ئەنجام دەدرێت..))..

جوامێر: ((بەکارهێنانی قەناس ئاسانترە..))..

گوتم: ((ناتوانین قەناس پەیدا بکەین ؟))..

جـوامێر: ((پەیـداکردنی تفـەنگی قـەناس ئاسـانە و مـن دەتـوانم قەناسێک بۆ ئێرە بهێنم..))..

گـوتم: ((دەسـت لەهـەموو شـتەکانیتر هـەڵبگرە بـا قورسـایی خۆمان بخەینە سەر جێگری سـەرۆک کۆمـار. کارەکانی تر ئـەو نرخەیان نییە. ئەم پیاوە بمێنێت کارەساتێکی گـەورە بۆ هـەموو لایـــەک دروســـت دەکـــات: دەرگـــای دۆزەخمـــان بـــۆ دەخاتـــە سەرپشت..))..

## تیرۆر یان ڕێکخستن؟
## (٩)

ئاشتی و هاوڕێکانی، بەرە بەرە لەبواری تیرۆردا خەریک بوو دەبوونە پسپۆڕو خاوەن پیشە: ((کاری تیرۆر لەناو پایتەختدا وا ئاسان نییە، ڕووبەڕووی کابرای بەکرێگیراو ببیتەوە، دەمانچەی لێدەربکەیت و بیتۆپێنیت. کارەکەی ئێمە پشتبەستنە بە وردترین زانیاری و بەدواداچوونی بەردەوام))..

هەر کەسێک بڕیاری ئیعدامکردنی بۆ دەربچێت، تەنیا لەدوو شوێن پێوە دەبێت، یان لەبەردەم ماڵەکەی خۆی، یان لەدەوروبەری شوێنی کار. ئێمە سێ مانگە چاودێری ماڵ و ئۆفیسەکەی دەکەین. وێنەکەیمان پەیداکردووە و دەزانین باڵا و سەروکەللەی چۆنە! کێشەکە ئەوەیە، ڕۆژێک سەعات (٨) لەماڵ دەردەچێت، ڕۆژێکیتر سەعات (١٠)، ڕێگاکانیش بە بەردەوامی دەگۆڕێت. کاتی گەڕانەوەشی یەک کات نییە! هەڵکەوتی ماڵەکەیان وایە، دەتوانێ بەڕێگای جیاجیادا بگەڕێتەوە. پاسەوان و ئۆتۆمبێلی دوا مۆدێلی مەرسیدسی هەیە. یەک دوو ئۆتۆمبێلی خێراترمان هەبوایە، بەرودوامان لێدەگرت و نەماندەهێشت دەرباز بێت..))..

گوتم: ((ئەرێ ئاشتی ئێوە بۆ دەنووکتان خستۆتە سەر ئەم کابرایە. ئەمە ئەگەر ببێ بە ئاگر کوێ دەسووتێنێ؟..))..

ئاشتی: ((تۆ جارجار سەردانی هاوکاری دەکەیت و ناسیاویت لەگەڵ ژمارەیەک شاعیر و نووسەری کورد هەیە، ناتوانی لەگەڵ مولازم جوامێر، دوو قۆڵی بچنە ژوورەوە! تۆ هیچ مەکە، تەنیا لەگەڵ ئەودا بچۆ! ئەو ئامادەیە لەناو ئۆفیسەکەی خۆیدا بیکوژێت و کۆتایی پێبهێنێت..))..

من بڕوام بە قسەو پلانەکەی(ئاشتی) نەبوو، هەر یەکسەریش زانیم، چ ئاماژەیەک لەپشت شیکاری و راڤەکاریەکانی ئەو خۆی مت کردووە. ئەگەر بچم بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە بەسەلامەتی ناگەڕێمەوە، ئەگەریش بەدەنگیەوە نەچووم، ئەوە ناوم دەخرێتە لیستی رەشی نابوێرەکانەوە. هیچ گومانێکم لە نیازپاکی و دڵسۆزیی ئاشتی نەبوو. بەڵام خەڵکیتر، کە لەودیوی چەمەکەوە قولاپیان هەڵدەدا، بە تاکتیکی((دەستی خۆم نییە و ماری پێدەگرم)).کاریان دەکرد. هەر بۆیە بەڵێنی بێ پاشگەزبوونەوەی خۆمم داو کات و شوێنی یەکتر بینین دانرا، پێکەوە بۆ راووشکار بچین:

((ئاشتی من لەقسەکانت بەجوانی تێگەیشتم، هەندێ کەس دەیەوێت من ئەو کارە بکەم، بەسەرچاوان، هەر بۆ ئەوەی پاش چەند رۆژێک بەیانێکی تیروتەسەلمان لەسەر بڵاوبکرێتەوە: لەناو شاری بەغدا کارێکی شۆڕشگێڕانە ئەنجامدراو فلان و فلان گەیشتنە کاروانی شەهیدان..تاد. من هەرچەند بڕوام بەم جۆرە کارو بیرکردنەوەیە نییە. تیۆری مارکسی لەکوێ و تیرۆری رەمزەکانی رژێم لەکوێ؟ دڵنیابە من ئامادەم لەگەڵ مولازم

جوامێردا بڕۆم و خۆشم تەقەی لێبکەم.. ئەم کارە لەبەر دڵی تۆ دەکەم، هەر بۆ ئەوەی بەهەڵە لە من تێنەگەیت..))..

ئاشتی مرۆڤێکی دڵپاک بوو، تێگەیشت سنووری بەزاندووە، بۆیە بەدیوی ئەملادا بایدایەوە:

((مامۆستا تۆ بەهەڵە لەمن تێگەیشتیت!))..

گوتم: ((کەسمان بەهەڵە لە یەکتر تێنەگەیشتووین. من قەناعەتی سەد لەسەدی خۆمت پێ دەڵێم. من نامەوێ لەبەر دڵی ئەم و ئەو خوێن لەپەنجەی هیچ کەسێک بێت. تکایە قەناعەتم پێبکە و دوای گەردەلوول و تەپ و تۆزی بڕیاری ئەملاو ئەولا مەکەوە..))..

ئاشتی: ((مەسەلەکە پەیوەندی بە سومعەی مولازم جوامێرەوە هەیە و هیچیتر! سومعەی ئەو پیاوە لەسەر جێبەجێکردنی چالاکیەکی پێشمەرگانەی گەورەی ناو پایتەخت وەستاوە. ئەگەر بڕیارەکان جێبەجێنەکات حەیای دەچێت..))..

گوتم: ((ئەرێ سەلام! چالاکی پێشمەرگانەی گەورە بە تەنیا بریتی نییە لە کوشتنی عوسمان محەمەد فایەق.. دەیان کارو ئەرکی قورس چاوەڕوانمان دەکەن.. ڕێکخراوێکی مارکسی دەبێ پێش هەموو شتێک بایەخ بە ڕێکخستن بدات، ڕۆژنامەیەکی ناوەندی دەربکات.. ئێمە خۆمان لەو کارانە دزیوەتەوەو هەموو قورسایی خۆمان خستۆتە سەر کوشتنی ڕەمزێکی بێکەڵکی ڕژێم و هیچیتر..))..

# ١٦/ی حوزەیرانی ١٩٧٧
# (١٠)

ئەو شەوە لەگەڵ ئاشتیدا لەسەر ئەوە ریکەوتین، سبەی واتە: رۆژی پێنجەشـــەممـــە ١٦/ی حـــوزەیرانی ١٩٧٧ ســـەعات دەوروبـــەری (نـــۆ و نیـــو)ی ســـەرلەبەیانی لەبـــەردەم دەرگـــای دەزگای(هاوکـاری)دا یـەکتر ببینـین. ئەگـەر ئـەوان بۆیـان رێـک نەکـەوت بـێن، ئـەوە سـەعات حـەوتی ئێـوارەی هـەمان رۆژ لەشەقامی (ابو نواس) لەگازینۆی (النخیل) سـەر رووبـاری دیجلە چاومان بە یەکتر دەکەوێت.

ئاشتی دەیویست، لـەناوەوە، چاوێک بـە کۆریـدۆر و بەشـێک لەژوورەکانـدا بگێرێـت، تـەنیا بـۆ ئـەوەی بزانێـت ژوورەکـەی عوسـمان محەمـەد فایـەق چـۆن چـۆنی هەڵکـەوتووە ؟ چـۆن دەزگای هاوکاری لەناوەوە پارێزگاری دەکرێت ؟

مـن کابرایـەکی خـەڵکی خانـەقیم لـەوێ دەناسـی، بڕواناکـەم نووسـەر و رۆژنامـەوان بووبێـت، لـەوێ کـاری ئیـداریی دەکـرد. هەسـتێکی ئـەوتۆم لا دروسـتبوو، ئـەم پیـاوە پەیوەندیـەکی دۆستانەی لەگەڵ عوسمان محەمەد فایەقدا هەیە. من چیرۆک و هەنـدێ گوتـارم کردبـووە بیـانوو، هـەر بـۆ ئـەوەی هەنـدێ دەنگوباسـی پێویسـتم دەسـت بکـەوێت، ئـەو کابرایـەش، بـەبێ ئـەوەی مەبەسـتی بێـت، زانیـاری یـەکجار گرنگیشـی پێشـکەش کـردم. جارێکیـان پێیگـوتم: ((حەزدەکـەم کـاک عوسـمان ببینـی پیـاوێکی زۆر بـەڕێـزە و باسـی تـۆم بـۆ کـردووە و ئـەویش پێیخۆش بوو تۆ ببینی..))..

ئەو شەوە تا درەنگانێ هەر بیرم لەوە کردەوە، چۆن چۆنی لەگەڵ سەلام یان جوامێردا بچینە ژوورەوە؟ ئەگەر دەرگاوان یان پرسگە پرسیارباران کردین چی بڵێین و پشکنین و مشکنین بکرێت بەرسیڤمان چی دەبێت ؟ ئیدی لە خەیاڵی خۆمدا سەردانێکی (ج) دەکەم و لەوێ چەند دەقیقەیەک پێکەوە دادەنیشین. ئەو هەموو جارێک دەردی دڵی خۆی بۆ دەکردمەوەو کۆمەڵێک سەربردەی دەگێڕایەوە.. ئەمە بیانوویەکی بەهێزە و دەیکەینە کلیلی چوونە ژوورەوە. پاش ئەوەش خودا دەرگایترمان بۆ دەکاتەوە..

ماڵی کاکم چەند شەقاوێک لە(ساحة الخلانی)یەوە دووربوو. ویستم هەڵسم و بەکاوەخۆ لەماڵ دەربچم، دوو سێ میوان لەدەرگایانداو هاتنە ژوورەوەو بووە چۆنی و چاکی و دەستمۆچان. زانیم خەریکە لەجێی یەکتر بینین دوادەکەوم، بە پەلە هاتمە دەرەوە. تەکسیەکم راگرت و پێمگوت: (ساحة الخلانی). هەر لەدوورەوە چاوم بۆ سەلام، یان جوامێر دەگێڕا، کەسم بەرچاو نەکەوت. قەڵەباڵغێکی یەکجار زۆر، دەیان ئۆتۆمبێلی پۆلیس، خەڵکی چەکدار، بەچڕی ناوەڕاستی شەقامەکەیان گرتبوو، هیچ تەکسییەک رێگەی نەدەدرا بوەستێت. کلاشینکۆف بەدەستەکان، هەر لەدوورەوە، بەئیشارەت داوایان لە شوفێرەکان دەکرد، نەوەستن و خێراتر بئاژوون و کەس نابێ دابەزێت.. شوفێری تەکسیەکە تێگەیشت بۆیە تا توانیی پێی پێدانا و لەو ناوەیە نەوەستا.

من پاش دوو سێ سەعات، بڕیارم دا بەهەمان رێگادا بگەڕێمەوە، هەر بۆ ئەوەی دڵنیابم چی روویداوە ؟ کاتێک گەیشتینە نزیکی (ساحة الخلانی) هێشتا ژمارەیەک ئۆتۆمبێلی

پۆلیس و چەکدار ئەو ناوەیان بەچڕی گرتبوو. لەشوفێرەکەم پرسی ((ئەم ناوەیە هەر زۆر قەڵەباڵغ دیارە ئۆرزدی باک لەم نزیکانەیە؟))..

مەبەستم ئەوەبوو، کابرای شۆفێر بەناڕاستەوخۆ بکەوێتە قسە و گومانیش لەپرسیارەکەی من نەکات..

((جێگری سەرۆک کۆمار سەری لەوەزارەتی (مواصلات)دا))..

خۆم بەتەواوی لێی نەبان کردو پرسیارێکی گێلانەترم کرد: (بۆ وەزارەتی مواصلات لێرەیە؟)

کابرا پێی عەیب نەبوایە دەیگوت: (زوو دابەزە!)، بەڵام گوتی: ((دونیا ژێروژوور بووەو تۆش ئەم پرسیارانە لەمن دەکەیت!))..

کە گوتی: (دونیا ژێروژوور بووە) خورپەیەک بەدڵمدا هات. بەجوانم نەزانی کابرا بۆژوو بکەم..

گوتم: ((من زۆر بەکەمی سەردانی بەغدا دەکەم، پایتەخت زۆر گەورەیە و زەحمەتە بتوانم شارەزایی پەیدا بکەم..))..

# ئێوارەی هەمان رۆژ (دەنگ و باسی تەلەفزیۆن)

# (١١)

پێش سەعات (٧)، بە بیست دەقیقەیەک، گەیشتمە ئەوسەری شەقامی (ابو نواس) و لە گازینۆی (النخیل) نزیک بوومەوە. هیچ شتێکی ناسروشتی، جموجۆڵ، ئۆتۆمبێلی پۆلیس، بەرچاوم نەکەوت. گازینۆیەکی گەورە لەسەر رۆخی رووباری دیجلە ئۆقرەی گرتووە. ماسی برژاندن، ئاورێکی بڵند، ماسیە پشت هەڵدراوە بە شوڵکراوەکان روویان کردۆتە ئاگرەکە، وەکو دەنووکی کەویان لێهاتووە.

لەدوورەوە ئاشتیم بینی، بەرامبەر کورێکی گەنجی قژلوولی سمێڵ رەش دانیشتبوو. چاوی لەچاوی (دووبرا)*یەکی برسی دەچوو، کە بەدوای نێچیردا بگەرێت. هەر منی بینی، بەزمانی چاو تێیگەیاندم دووربگرم، لەسەر کورسیەکی ئەوسەر دابنیشم. دوو کورسی و مێزێک بەرامبەر تەلەفزیۆنێکی رەش و سپی وەکو تووترک رایانکێشام. بۆ حەوتی ئێوارە رێک چارەکیکی مابوو.

ئەو کەسەی بەرامبەر سەلام دانیشتبوو، پاشان لەتەلەفزیۆنی بەغدا وێنەیەکیان بلاوکردەوە و ناسیمەوە (سەلمان داوود)بوو. هەڵسان و رێکردن و جولانەوەی لە پیاوێکی بەهیمەت، کردە و دەستوەشێن دەچوو. ئاشتی ئەوی تا دەری دەرەوە رەوانە کرد و خۆی هاتەوە هەر دانیشت و گوتی:

((باوەرکەم ئەمرۆ بووینە مامری سوور.. کەڵەشێری سوور..))

---

* دووبرا: مەلێکی راوچی گۆشتخۆری دەنووک خوارەو لەهەڵۆ گەورەترە.

من راچەنیم! ئەو پێدەکەنی و دەستی بەسمێڵەکانیا هێنا.. ئەو لەسەر قسەکردن بەردەوام بوو.

((یەکێکمان کوشت! بەوێنە و مواسەفات.. پیاوێکی کەتە، قاتێکی شینی لەبەردابوو. ئۆتۆمبێلێکی مرسیدسی رەشی مۆدێل بەرز، گەیشتە بەردەم دەرگای دەزگای (هاوکاری) و پاسەوانی دەرگاکە، بەڕاکردن هات و دەرگاکەی کردەوە! دوو سێ هەنگاو لە سەلمانەوە دووربوو. ئەم دەمانچەکەی هەڵکێشاو گوللەیەکی بە پشتیەوە نا! ئەو هاواری لێهەڵسا (ئاخ یمە انکتلت)* لەسەر زەویەکە تەخت بوو. ئێمە هەڵاتین. چەند کەسێک دومان کەوتن. ئێمە خێراتر بووین و خۆمان دەرباز کرد..))..

من گوتم: (دڵنیان عوسمان محەمەد فایەق بوو؟).

ئاشتی: ((نەخێر دڵنیانیم!))..

گوتم: ((ئەگەر بەهەڵە کەسێکی تر کوژرابێت، ئەوە هەڵەیەکی گەورەیە..)).

ئاشتی: ((هەشتا لەسەد ئەوە.. ئەگەر ئەو نەبێت چیبکەین؟)).

گوتم: ((ئێوە خۆتان چی دەڵێن ؟)).

لێدوان و گفتوگۆی ئێمە زۆری نەخایاند، سەعات بووە حەوت و کاتی بڵاوکردنەوەی دەنگوباس بوو لەتەلەفزیۆنی بەغدا.. یەکەم هەواڵ چالاکی هەڵۆی سوور بوو.

((.. قامت عصابة مجرمة عملية الاستعمار بأغتيال المناضل عثمان محمد فائق عضو المجلس التشريعي لمنطقة الحكم الذاتي و مدير عام دار التضامن الكردية..))..

ئینجا بەدووروودرێژی و بە ماتی و کزی، ژیاننامەی عوسمان محەمەد فایەقی خوێندەوە.

---

* ئاخ دایە کوژرام.

ئاشتی بە پێکەنینەوە گوتی: ((ئەوە بوینە هەڵۆی سوورو دەبێ سبەی نیوەڕۆ دەعوەتێکی (کباب بالساطور)م بکەیت..))..

گوتم: ((شوێنێکی خۆش دەناسیت ؟))..

ئاشتی: ((شوێنێک هەیە نزیک (ساحة التحریر) و لەکۆتایی (شارع الجمهوریة) دوا کۆڵان، دەستی راست، دە دوانزە دوکان بژمێرە دەستی چەپ! کەبابێکی نایابی هەیە))..

گوتم: ((باشە بەسەرچاو دەعوەتی منی..))..

ئاشتی گوتی: ((ئێمە دەوری سەعات نۆی پێشنیوەڕۆ (من و جەمال و سەلمان) گەیشتینە (ساحة الخلانی) تەنیا بۆ چاودێری و پشکنینی ئەو دەوروبەرە. چاوەڕوانی مولازم جوامێرو تۆمان دەکرد. بەتەمای هیچ نەبووین. ئەوەی بۆ سەلمان رێکەوت بۆ کەس رێکنەکەوت: دابەزینی ئەو لەئۆتۆمبێل و هەڵکیشانی دەمانچە لەلایەن سەلمانەوە یەکێک بوو..))..

من گوتم: ((ئاشتی! شتێکت پێدەڵێم ئەگەر بەقسەم بکەن قازانج دەکەن و بەقسەم نەکەن زەرەرێکی گەورە دەکەین و هیچ سوودێکیشی نییە..))..

ئاشتی: ((فەرموو با قسەی لەسەر بکەین..))..

گوتم: ((بێگومان کوشتنی رەمزێک لە رەمزەکانی رژێم لەناو بەغدا دا، لەسەر ئاستی ناوخۆ و جیهانی، لەڕووی راگەیاندنەوە کاریگەری گرنگی خۆی دەبێ، بەڵام دڵنیابە رژێم نەنووستووە و دەستەوەستان دانانیشێ و چاوەڕوان ناکات کەللەسەرەکان یەک لەدوای یەک بە بەرچاویەوە دروێنە بکرێن..))..

پرسیارەکەی من ئەمەیە: ((چەند کەس بەم رووداوە دەزانێت؟))..

ئاشتی: (سێ بەتۆوە چوار!).

من گوتم: ((کێ و کێن ؟))..

ئاشتی: ((من و سەلمان و جەمال و ئەوە من بۆ تۆشم گێڕایەوە..))..

گوتم: ((دەتوانین چوار نەکەینە پێنج ؟))..

ئاشتی: ((سوودی چییە کارێک بکەین و لای کەس باسی نەکەین ؟))..

گوتم: ((پێنجەم زانی ئەوە شەشەمیش راستیەکە دەزانێت.. قسە کەوتە زارێ، دەکەوێتە شارێ. ئێمە گەلێکی دەم نەوەستاوین. پاش چەند رۆژێک دەنگوباسەکە بەراستی و رەوانی بگاتە گوێی دەزگا هەواڵگریەکانی رژێم ئەوکاتە، سەرتاپای رێکخستن دەگیرێت و دەکوژرێت.. کەواتە: چیمان کرد ؟))..

ئاشتی: ((قسەکانت سەد لەسەد راستن. من دەبێ ڕووداوەکە بۆ جوامێر بگێڕمەوە.. سەلمان و جەمالیش دەیانەوێت، ڕووداوەکە بۆ هاوڕێیانی خۆیان بگێڕنەوە..))..

من قسەکەم پێبڕی:

((سوودی چییە ؟)).

ئاشتی: (( ئەی ئێمە ئەم کارەمان بۆ کردووە ؟)).

گوتم: ((تۆ بەدەستی خۆت کلیلی دەرگای نهێنیەک رادەستی دەزگا هەواڵگریەکانی رژێم دەکەیت. ئەگەر ئێمە بەرپرسیاریتی خۆمان لەسەر ڕووداوەکە جارێک رانەگەینین، رەنگە باڵە ناکۆکەکانی ناو حزبی بەعس(تاوان)ەکە بخەنە ئەستۆی یەکتر و بکەونە گیانی یەکترو بەمەش رژێم لاوازتر دەبێت..)).

ئاشتی: ((بۆچونەکانت راستن و من دەبێ سەلمان و ئەوان ئاگادار بکەمەوە..)).

گوتم: ((سبەی یەکتر دەبینینەوەو بۆ نیوەڕۆ لەشوێنێک دادەنیشین و قسەکانی خۆمان درێژەی پێدەدەین..)).

# ئێوارەی هەمان ڕۆژ (ماڵەوە)

## (١٢)

کاتێک گەیشتمە ماڵەوە، کش و ماتی و بێدەنگی! گەورە و بچووک، قڕوقپ، چاویان بە شاشەی تەلەفزیۆنە ساردوسڕە، ڕەش و سپیەکەوە هەڵواسیبوو. بێژەرێکی سمێڵ ئەستوور نووچە و ڕیپۆرتاجی لەسەر (عوسمان محەمەد فایەق) دەخوێندەوە. بینەرانی ناو هۆڵەکە، دەیانویست سەرە کەوچکێک زیاتر، ئامرازی پەیوەندی لەناو قسەکاندا بدۆزنەوەو بزانن چی ڕوویداوە ؟ خەڵک حەز دەکات لەناو دێڕە نووسراوو نەنووسراوەکاندا، شتێک هەڵکرێنێت، تینوویەتی پێبشکێت.

کاکم* توانای بۆنکردنی زۆر باشی هەبوو، پێشبینیشی دەکرد، ڕەوتی ڕووداوەکان بەکام ئاڕاستەدا دەڕۆن. ئەو لەمنی پرسی: ((ئەرێ بەڕێکەوت کەست نەبینیوە و هیچت لەسەر ئەم ڕووداوە نەبیستووە ؟ لەناوەڕاستی بەغدا دا عەمەلیەیەکی ئەوتۆ بکرێت و هەر ڕێکخراوێکی سیاسی کردبێتی کارێکی ئاسان نییە..)). ئەو، دەیزانی عوسمان محەمەد فایەق کێیە ؟ ڕۆژ نەبوو نوکتە و(داستان)ێکی ئەم کابرایە نەگێڕێتەوە: جارێک عوسمان چاوی بەناوی (د. کوردستان موکریانی) کەوتووە، بەبێ لێکدانەوە گوتویەتی لەبری (کوردستان) بنووسن (ناوچەی ئۆتۆنۆمی).. تاد.

((..گوێم لە ئێستگەی BBC و مونتیکارلۆ و ئیسرائیل گرت، ئەوانیش بەسەر سووڕمانەوە لەڕووداوەکە دەدوان. هیچ کۆمێنتێکیان لەسەر ئەوە نەبوو، کام لایەن بەرپرسیارێتی لەئەستۆ گرتووە ؟)).

---

* مامۆستا غاندی (مەجید کەریم ئەحمەد)

کاکم دڵنیابوو ئەم کارە تۆڵە سەندنەوەو کاردانەوەی روونـاکبیرانی کـوردە، بەرامبـەر بـە رژێـم. هـیچ پەیوەنـدی بـەزۆرانبازی و باڵبـاڵێنی نـاو حزبـی دەسـەڵاتدارەوە نییـە. هەرئـەوەبوو بـە هەسـتی سیاسـی و زیرەکیـی خـۆی، هـەر ئەوەندەی مابوو راست ورەوان بڵێت: ((شـوێن پەنجـەی ئێوە بە رووداوە دراماتیکیەوە دەبینم..))، بەڵام بەناڕاستەوخۆ، شیکاری سـەرجەم ململانـێ و کـارو کردەوەکـانی رژێـم و شۆڕشـی بەجیاجیا کرد. ئەو گوتی: (ئەم کابرایە دڵسۆزترین پیاوی رژێم بووە و وەکو گورگی هار بەر دراوەتە گیانی رۆشنبیرانی کورد، هـەر زۆر بـەوردی کـاری بـۆ شـێواندن و سـڕینەوەی ژیـانی رۆشنبیری کـورد دەکـرد.. ئـەقڵ نایگرێت رژێم خـۆی بـەرۆژی نیوەڕۆ، لەناوەڕاستی بەغدا، بەئاشکرا بیکوژێت! رژێم ئەگەر بیەوێت هەر کەسێکی خۆی لەناوبەرێت، بەرووداوی ئۆتۆمبێل چیرۆکێـک دەهۆنێتـەوە، یـان لەرێگـەی میـدیاوە، داوودەزووی کودەتایـەکی نهێنـی دەدۆزێتـەوە، قەسـابخانەیەک بـۆ کودەتاچییەکان دەنێتەوە. ئەو ئۆپۆزسیۆنەکانی خۆی لەناودەبات و لاشـەکانیان* لەقـەراخ رێگـا گشـتیەکانی دەرەوەی شـار، بـە شێوێنراوی، فڕێدەدات..)).

گـوتم: (دەسـتی شـۆڕش زۆر کورتـە، جـارێ لـەقۆناخی دارە دارەیە و دەستی ناگاتە هیچ شوێنێک!)).

کاکم فەرمووی: (شۆڕش لەهەموو قۆناخەکاندا، ئەگەر زۆر مەبەستی بووبێت، بەئاسانی دەستی گەیشتۆتە بەغداو دەستی وەشاندووە..)).

---

* لەنووسینی ئەمڕۆدا لەبری (لاشە) دەنووسرێت(تەرم)!

تەرم: دوو داری درێژ و دوو داری کورت، بەشێوەی لاکێشەیی دادەنرێن و بەگوریس قایم دەکرێن و لبادی لەسەر دادەنرێت، تەرم ئامرازێکە لەبری تابووت بۆ گواستنەوەی لاشەی مردوو دروستی دەکەن. لەزمانی کوردیدا (لەش) گیانی کەسێکی زیندووە، لاشە، گیانی کەسێکی مردووە. لەزمانی ئەڵمانیدا: (لایشە) -die Leische بۆ کەسێکی مردوو بەکاردێت. میدیای کوردی پێویستە لەبری (تەرم) وشەی (لاشە) بەکار بهێنێت.

## ( The Day After)**

## (١٣)

هـــەروەکو چـــۆن ڕۆژی پێشـــوو، ئێمـــە هـــەردووکمان ڕێکـەوتبووین، لای کەبابخانەکـە یـەکترمان بینییـەوە. دەموچـاوی ئاسوودەیی و سەرفرازی پێوە دیاربوو. خۆی پاک پاک شتبوو، ڕۆن و چـەوری بـەقژو دەموچاویـەوە دیـار نـەبوو. کـراس و پانتۆڵەکەی خاوێن و ئوتوو کراوبوون.. قەت سـەلامم بـەو پاکی و خاوێنییە نەبینبوو. پاش چۆنی و چاکی گوتم:

((ئاشتی ئەوە دیارە موقابەلەی تەلەفزیۆنیت هەیە بۆیە خۆتت وا لەتەل داوە!)).

ئاشـتی: ((تـۆ هەمیشـە بەڕوواڵـەت ئامـادەی بـۆ بـەردەم تەلـەفزیۆن و عەرەبیەکەشـت لـە زمـانی عـەرەبی زۆر عـەرەب چاکترە..)).

گـوتم: ((دەترسـم ڕۆژێـک وەکـو هـەواڵی یەکـەم، وێنەکـەت لەتلفزیۆن پیشان بدەن..)).

ئاشـتی: ((هـیچ ترسـت نـەبێت، لـەوێش هـەر پێکـەوە دەبـین، ناهێڵم من پیشان بدەن و تۆش لەماڵەوە بیچامەت لەبەرکردبێت و ڕۆژنامەت بەدەستەوە بێت و سەیری تـەلفزیۆن بکەیت و مـن بەتەنیا پیشان بدەن. بە خوا تاقەتم نییە تۆم لەگەڵدا نەبێت..)).

گـوتم: ((ئەوەنـدە باسـی (کـەباب بالسـاطور)ت کـردووە، بـا جاریّ پێش موقابەلەی تەلفزیۆنی تێر کەباب بخۆین، پاشـان چـی دەبێت با هەر ببێت..)).

** The Day After ناوی فلمێکە، باسی یەک ڕۆژ دوای تەقینەوەی بۆمبی ئەتۆمی، بە ئینیمێشین، خراوەتە ڕوو، واتە: ڕۆژێک پاش ڕووداوەکە.

بەرامبەر وەجاخ و کەبابچییەکە، سەلام گوتی:

((سەیری دەست و پلی کەبابچییەکە بکە. قەمەکەی دەستی پێیدەگوترێت: (ساطور). گۆشتە نەرمەکە بە شیشەوە دەکات. ئینجا بە قەمەکەی دەستی ونجڕ ونجڕی دەکات.. من لەهیچ شوێنێک کەبابی وا خۆش و بەتامم نەخواردووە.. هەر پێمخۆشبوو تۆش تام و چێژی بکەیت. دەزانم کەبابی وات قەت نەخواردووە..)).

گوتم: ((ئەرێ ئاشتی، کاتێک بۆ ئێرە هاتی کەش و هەوای پایتەخت ئاسایی بوو ؟)).

ئاشتی: ((ئەوەندە برسیم بوو، سەیری هیچ کوێم نەکرد..)). ئەو قسەکانی هەر بە سوعبەت بوو.. هەردوای ئەم رستەیە لە قاقای پێکەنینی دا..

گوتم: ((ئاشتی پایتەخت ئەمڕۆ رەشپۆشە. ترس و دڵەڕاوکێ و ئاڵۆزکاوی بەغدای داپۆشیوە. سەربان و بنبانی بینا بەرزەکان، سەرباز سەنگەری گرتووە. بست بە بستی ئەم شارە بە سەربازو چەکدار تەنراوە!)).

ئاشتی: ((منیش کە هاتم، بەزەق و زۆپی رەچاوی جموجۆڵی سەربازو ئەمنم کرد. هەرچی وەزارەت و داوودەزگای حکومەت هەیە، بەچڕی پاسەوانی لێدەکرێت.. سەرەتا وامانزانی کارەکەمان هەر زۆر بچووک و بێ بایەخە، نەمزانی هەر بەفشە دونیامان هەژاندووە..)).

گوتم: ((حکومەت کێشەکەی زۆر بەجیدی وەرگرتووە، لەبەرئەوەی نازانێت چی رووی داوە ؟ ژێدەر و سەرچاوەکەی کێ یە و کێ نییە و چ لایەنێک ئەنجامی داوەو کام هێز لەپشتیەوە وەستاوە؟)).

ئاشتی: ((حکومەت ئێستا پێویایە (ئیستعمار))و (ئیمپریالیزمی جیهانی) ئەم کارەیان کردووە و کون بەکون بەدوای ئەواندا دەگەڕێت و دەیەوێت لە لەندەن و واشنتۆن بیاندۆزێتەوە! نازانێت ئێمە لێرە خەریکی کەباب خواردن و چا فڕکردنین..)).

پاش تۆزێک بێدەنگی، سەلام هەروەکو شتێکی زۆر سەیری بیر کەوتبێتەوە، گوتی:

((بیرم نەبوو! ئەمڕۆ ١٧/ی حوزەیرانە و ڕۆژی هەینییە، ڕۆژی هەینی لە بەغدا بازاڕ و دونیا داخراوە و شەقامەکان تا ڕادەیەک چۆڵ و هۆڵن.. ئەمڕۆ لەڕۆژی یەکەمی کودەتا دەچێ، ئەمن و سەربازو پۆلیس، هەر چاوێکیان کردۆتە چوار چاو، هەموو چرکەیەک چاوەڕوان دەکەن، لەپشتەوە کەسێک تەقەیان لێبکات، یان نارنجۆکێک لەبن پێیاندا بتەقێتەوە..)).

من و ئاشتی، لەسۆنگەی گیانی نوێگیرییەوە* بڕیارماندا، لەناو شەقامی ڕاست و پێچاوپێچی پایتەختدا، بەدوو قۆڵی پیاسە بکەین.

لە سەرەتای شەقامی ڕەشیدەوە بەرەو سنەک ڕۆیشتین. چاومان بە بەردەم و سەربینا بەرزەکاندا دەگێڕا. ئەوان لەئاسمان بۆمانێ دەگەڕان و ئێمەیش بەکاوەخۆ پیاسەی خۆمان دەکردو بە بەر سمێڵیاندا تێدەپەڕین..

سەربازەکان تۆپەڵ تۆپەڵ سەریان بەیەکەوە نابوو، بەسەر گۆشە و پەناو پەسێردا دابەش ببوون. پاسەوانەکان، بە چەکی سەرشانیانەوە لەبەردەم دەرگا داخراوەکاندا، وەکو

---

* نوێگیر: Neugir حەزکردن لەزانینی زانیاری لەسەر خەڵک و بابەتی جیاجیا لەپێناوی پڕکردنەوەی حەزی زیاتر زانین و کۆکرنەوە و شارەزایی، بەعەرەبی: فضولي، بە ئینگلیزی CURIOUS

مێروولـه دەهـاتن و دەچـوون. بەشـێکیان، قایشـی چەکـەکانیان لەملـدابوو پەنجـەیان لەسـەر پەلەپیتکـە دانـابوو. ئامـادەبوون بـۆ تەقە و بەرگری، بەبێ ئەوەی هـیچ دوژمنێک لەبەرچاویاندا بێت، یان هیچ مەترسییەکی جیدی لەسەریان بێت.

ئاشتی چاوەڕوانی ئەوە نەبووە، رژێم ئـەم کاردانـەوە فراوان و فرە لایەنەی هەبێت.

من گوتم: ((جیاوازی ئەمڕۆ و پێرێ چییە ؟)).

ئاشـتی: ((بسـت بەبستی پایتـەخت کۆنترۆڵ کراوە. هـەروەکو ئەوە وایە، رژێم ترسی کودەتایەکی چاوەڕوانکراوی لێنیشتبێت.. من پێموایە تـا دوو سـێ مـانگیتریش گرژی و ترس و دڵـەڕاوکێ رژێـم بـەرنادات. مـن بـڕوا ناکـەم لـەم ماوەیـەدا، ئێمـە بتـوانین هەناسە بدەین، نەک چالاکیی پێشمەرگانە ئەنجام بدەین!)).

پـێم باشبوو(ئاشـتی) بـەچاوی خـۆی شـەقامە خۆڵەمێشـی و تۆقێنراوەکانی بینی و دڵنیایی لاپەیدابوو (هەڵۆی سوور) تا چەند مـانگێکی تـریش نـاتوانێ بەسـەر ئاسـمانی بەغـدا دا بفڕێـت، لەهـەموو شـوێنێک بـۆنی خـوێن، بـاروت و دووکـەڵ دێت. ئـەو هەڵۆیـە وا چـاکترە لەهێلانەیـەکی شـاخی(پیرەمەگروون) یـان شاخی(زەردە) بێت.

من قسەکەم لەدەمی وەرگرتەوە:

((شەڕی پارتیزانیش هەروایە، سوپای دوژمن هێرشی کرد، نابێ لەبەردەمیدا راوەستیت، دەپلیشێیتەوە. سـەری تۆ بەرگـەی ئـەو هـەموو گـورزە گۆپاڵـە ناگرێـت، پاشەکشـە باشـترین چارەسەرە بۆ خۆپاراستن و ماندووکردنی دوژمن..)).

ئاشتی: ((من بەهـەر هـەموو ئـەو هاوڕێیانـە دەڵێم: مانـەوەمان لێرە هیچ سوودێکی نییە.. دەبێ بۆ کوردستان بگەڕێینەوە..)).

# خوێنی شەهیدان

## (١٤)

سەرم لەصادقدا، کە ماڵیان چەند هەنگاوێک لەماڵمانەوە دووربوو. پیشی دەخواردەوە، نەیدەتوانی ئارام بگرێت و تۆزێک هێوربێتەوە. بەراشکاوانە گوتی:

((جارێکیتر من پەیوەندی لەگەڵ رێکخراوی (خوێنی شەهیدان)دا نابەستم. با کەسێکیتر بیانبینێت و ببێتە لێپرسراوی پەیوەندییەکانی (کۆمەڵە) و (خوێنی شەهیدان) و من نامەوێ جارێکیتر سادەترین پەیوەندیم لەگەڵیاندا هەبێت!)).

صادق پیاوێکی نمونەیی بوو لەسەبرو هەڵس وکەوت، قورس و گران، لەسەرخۆ، دەم و زمان شیرین، کەچی ئێستا ناتوانی قسە لەقسەیدا بکەیت و تۆزێ ساردی بکەیتەوە. من گوتم: ((جارێ پێمبڵێ چی روویداوە ؟ چاوت بەکێ کەوتووە ؟ کەسێک قسەیەکی بەرزونزمی کردووە؟)).

صادق: ((یەک مانگیتر هەر هەموویان دەگیرێن! ئەمانە ناتوانن رێسای رێکخراوی نهێنی بپارێزن.. هەر زۆر هەرزەکار و ناخاڵەن*(خەریک بوو بمکوژن!))

من گوتم: ((لەناو کۆمەڵەش کەسانی وەکو مولازم جوامێرو سەلام و حەمید ئەکبەر هەر زۆر دەگمەنن!)).

صادق: ((یەک مانگی پێ ناچێت هەر هەموویان دەگیرێن! نازانن کاربکەن! خەریک بوو بمکوژن.. ویستیان تەقەم لێبکەن!

---

* ناخاڵە: قۆناخی هەرزەکاری و پێش تەمەنی (١٨)ساڵی. بارەکەو: ئەو قۆناخەیە کە (خەت و خاڵ)ی دەرنەکردووە.

نازانن جل و بەرگ لەبەر بکەن! هەڵس و کەوتیان بۆ هۆلیۆد گونجاوە، بەڵام بۆ ڕێکخراوێک بیەوێت لەپەناوە دروێنەی کەللەسەری سەرانی ڕژێم بکات، ئەوە هەر زۆر زەحمەتە و سەرکەوتوو نابن..)).

گوتم: ((تۆ باسی تیرۆرانینی خۆتم بۆ دەکەیت. قسەکانت گرنگن و من بەهەند وەریان دەگرم. جارێ باسی ئەوەت بۆ نەکردم ئەوان بەرامبەر جەنابت چییان کردووە ؟)).

صادق: ((کاک عیماد شوێن و پەرلەو هەموو کارەکانی لەگەڵ سەلماندا بەوردی دیاری کردبوو. منیش کراسێکی رەش و پانتۆڵێکی سپیم لەبەرکردو سەعاتەکەم کردە دەستی ڕاست و ڕۆژنامەیەکم بەدەستمەوە گرت و بەرەو (شارع الکفاح) ڕۆیشتم. شوێنەکە چایخانەیەکی پەرپووتی گومناوی بوو. لەوێ دە دوانزە گەنجێک بەدەور مێزێکەوە دانیشتبوون. هەر هەموو کراسی رەش و پانتۆڵی سپیان لەبەردابوو. خەریکی چا خواردنەوە و جگەرەکێشان بوون. کاتێک منیان بینی، هەر زۆر شڵەژان، بەیەکداهاتن و چوون، ڕاچەڵەکین. پێیانوابوو، پیاوخراپ هاتووەو بەتەمایە دەستبوەشێنێت، یان لەلایەن دەزگا هەواڵگریەکانەوە نێردرا بێت.. پشتیان گرتم و گوتیان: ((بەداوی چیدا دەگەڕێیت ؟)).

من گوتم: ((دەمەوێت کاک سەلمان ببینم!)).

یەکێکیان گوتی: ((سەلمانت بۆ چییە ؟ دەیناسیت ؟)).

صادق: ((دەمەوێ ببینم، مەوعدمان پێکەوە هەیە!)).

سێ کەس ئەملاو ئەولایان گرتم و داوایان کرد لەگەڵیاندا بۆ باخچەکەی پشتەوە بڕۆم و لەوێ دەمانچەیان لەسەر تەپڵی سەرم ڕاگرت و کردیانە دەنگە دەنگ و هات و هاوار:((تۆ

جاسوسیت! موخابەرات تۆی ناردووە.. زوو قسە بکە هەر ئێستا هەموو فیشەکی شانەی دەمانچەکە لەسەرتدا بەتاڵ دەکەم..)).

صادق: ((با سەلمان ببینم دەتوانم خۆمی پێبناسێنم!)).

یەکێک لەولاوە: ((تۆ کاک عیمادی ؟))..

صادق: ((نەخێر! من هاوڕێی کاک عیمادم!)).

سەلمان (لەولاوە دێت): ((تۆ هاوڕێیانی کۆمەڵەیت ؟ ئەگەر لەوانیت(پەرلە)کەمان پێبڵێ..)).

صادق: (الغنى في الغربة وطن، و الفقر في الوطن غربة)

سەلمان گوتی: ((پەرلەکەت)). تەواوە، بەڵام ناونیشانەکانیترت هەڵەی تێدایە.

دەبوایە کراسەکەت سپی بوایە و پانتۆڵەکەت رەش. ئێمە حیساب بۆ بچوکترین هەڵە و گۆڕانکاری دەکەین.. یەکسەر بە فیشەک بەرسیڤمان دەبێت..)).

صادق: ((من لەگەڵ ئەم جۆرە ئاکارەدا نیم! ئەمەی ئێوە کردتان کردەوەیەکی ساویلکە و نەشیاوە. ئێمە لەناو کۆمەڵەدا، شێوەی ترمان بۆ یەکتر بینین و یەکترناسین هەیە، هەر بە چوار قسە و (پەرلە)یەک یەکتر دەناسین، ئیدی نە میل هێنانەوە و نە خۆ گیڤکردنەوەی دەوێت و نە سەر ئێشەش بۆ خۆمان دروست دەکەین..)).

پاش ئەوەی صادق بەشێک لە (شۆک) و (تراوما)* ی خۆی گێڕایەوە، من ویستم باشتر لەگروپی (خوێنی شەهیدان) تێبگەم. لەسۆنگەی قسەکانی صادقەوە، بەرە بەرە قەناعەتێکم لا گەڵاڵە

---

* تراوما: Trauma برینی دەروونی، پاش هەر رووداوێکی قورس و ترسناک خەڵک تووشی (شۆک) و تراوما دەبێت و وێنەکان تا ماوەیەکی زۆر لەبەر چاویدا سەما دەکەن..

بوو، کە ئەم گروپە خۆیان بە قەڵبەیەکدا دەدەن. ئێمە وەکو (هەرێمی پێشڕەو) نابێ دەستەوەستان و پاسیڤ چاوەڕوانی گەردەلوولێک بکەین، ئەوەی لەحەوت هەشت ساڵدا دروستمان کردووە، بەچاوتروکاندنێک رادەستی گەردەلوولێکی رەشی بکەین..

من گوتم: ((لەناو چایخانەدا دەمانچەیان پێبوو ؟)).

صادق: (( میلیان لێهێنامەوە. دەمانچەکەیان لەسەر سەرم دانا..)).

گوتم: ((گروپێکی نهێنی بچووک، لەناو جەرگەی بەغدادا، چۆن بە ئاشکرا دەمانچە هەڵدەکیشن، بە بێ ئەوەی هیچ روویدابێت ؟)).

صادق: ((ئەمانە سادەترین بنەماو رێسای رێکخستن و کاری نهێنی نازانن. تەمەنی درێژیان مانگێک، دوو مانگی ترە! هەر هەموویان دەگیرێن و لەناو دەبرێن..)).

گوتم: ((بەهۆی ئەوانەوە، ئێمەش ئاشکرا نابین، گورزێکی کوشندەمان بەرناکەوێت ؟)).

صادق: ((پاش ١٦/ی حوزەیران تووشی لەخۆبایبوون و خۆ بەزلزانینێکی سەیر هاتوون و پێیانوایە، چەند هەفتەیەکیتر دەتوانن، دەست بەسەر بەغدادا بگرن و کەس بەهیچ نازانن..)).

گوتم: ((دەبێ هەرێمی پێشڕەو کۆبونەوەی خۆی بکات و بڕیاری یەکلاکەرەوە بدات، جولانەوەو هاوئاهەنگی و کاری هاوبەشی خۆمان لەگەڵ ئەواندا سڕ بکەین..)).

# دۆزینەوەی سەرەداو

## (١٥)

ئەو ماوەیە بە قووڵی بیرم لەوە دەکردوە، چی بکەین تا ڕێکخستن و(هەڵۆی سوور) لەکارەساتێکی چاوەڕوانکراو بپارێزین ؟ من ئەوکاتە لەدەزگا ڕۆشنبیرییەکان، کە ژمارەیەک کوردی (باش) و (خراپ) کاریان تێیدا دەکرد، چەند کەسێکم دەناسی. چەند لاپەڕەیەکم ڕەشکردەوە، هەرچەند دڵنیابووم بڵاویان ناکەنەوە، بەڵام من بەتەنیا ئەو چرکەیە کارم بڵاوکردنەوە و بڵاونەکردنەوە نەبوو. لەدڵی خۆمدا گوتم: (با سەردانی (ج) بکەم و پیرۆزبایی لێبکەم، بە بۆنەی لەناوچوونی عوسمان محەمەد فایەقەوە.. تاد. دەمویست بزانم کاردانەوەی ڕووداوەکە لای ئەوان چۆن بووەو گومانیان بۆ کوێ دەچێت و بۆ کوێ ناچێت ؟

لەپرسگەکە گوتم: ((دەمەوێت سەردانی (ج) بکەم)). کە فەرمانبەرێکی بچووک و هیچ بەدەست بوو، کوردیەکەشی تەپ و تۆزی دەکرد. من باوکیشیم دەناسی، هەر بەتورکمانی قسەی دەکرد.

پێش ئەوەی بیروڕای خۆم بڵێم، بڕێک شەپۆلانی چۆنی وچاکیم درێژەپێدا، ئەو بەم شێوەیەی خوارەوە شۆک و کەسەرو زووخاوی دڵی خۆی هەڵڕشت:

((اغتیال شەهید عثمان)، یەک (حدث، مروع، مفزع و جریمة نکراء..) وەڵڵا من فرە (محزون) بیم (طول فترة العزاء) من لە (مراسیم العزاء) دانیشتبیم (استقبال معزین) کردم. (شهید عثمان) فرە (انسان) خاس بی. من لای (اطفال و عیال) و فرە گیرستم لەبانیان (مع شدید الاسف)چی. (انشاء اللە) چد(مباشر) لەناو (جنە)... تاد)).

لەدڵی خۆمدا گوتم: عەمرت نەمێنێت، هەی قورمساغی، بێکەڵکی، ماکەر، یاخوا داڕزێیت..

ڕێگەی نەدا من هیچ بڵێم! بەردەوام بوو لەسەر ستایشکردنی (شهید عثمان) دەیوست کارێکی ئەوتۆ بکات منیش دەست بکەمە گریان و قوڕپێوان.. ناچار بووم منیش کوردیەکەی خۆم وەکو کوردیە ـ تورکمانیەکەی ئەو لێبکەم و گوتم:

((من دڵنیام دەزگای ئەمن و موخابەرات هەر زۆر بەهێزن و هیچ لەدەستیان دەرناچێت و لەم ماوەیەدا دەیانگرن..)).

(ج) گوتی: ((دوێنێ لەماڵی شەهید عوثمان بووم. مودیری ئەمنی عام و مودیری موخابەرات و گەورە بەرپرسیارەکان بەسەردان بۆ ماڵی شەهید عوثمان هاتن، لەبەرچاوی خۆم بەژنەکەیان گوت: دڵت هیچ نەکات، تۆڵەی شەهید عثمان سەد قات دەکینەوە. ئێمە سەرەداوی هەر زۆر گرنگمان دەستکەوتووە. ناتوانیین هەموو وردەکاریەکانت بۆ بگێڕینەوە. دڵنیات دەکەین ناهێڵین یەک مانگ تێپەڕێت، هەر هەر هەموویان بەدەست دەگرین و سزای زۆر قورسیان دەدەین و تۆڵەی شەهید عثمان دەکەینەوە..)).

ئەم هەواڵە بۆ من وەکو هەورە برووسکە بوو، نەمزانی چۆن هاوارم نەکرد، هەر یەکسەر لەژوورەکە دەرنەچووم. من لەخەفەتی (دۆزینەوەی سەرەداو) دا واقم ورمابوو، ئەویش پێیوابوو خەفەت بۆ (شهید)ەکەی ئەو دەخۆم. چەند بەڵگەی تری پێدام، کە دەزگا هەواڵگریەکان دەتوانن هەر ئێستا هەموویان بگرن، بەڵام جارێ چاوەڕوان دەکەن، کارەکە پێبگات و نەهێڵن یەک کەس دەربچێت..

لەکۆتایی حوزەیرانی ١٩٧٧ ماڵی کاکم بیری خانەقی و کەس و کاریان کردبوو، منیش ئەوەم بەهەل زانی و گوتم: کارێکم

لەبەغدا بۆ دروستبووە. بەبێ ئەوەی من راستەوخۆ داوای کلیل بکەم، ئەوان کلیلی شوقەکەیان رادەست کردم. شوقەکەی ئەوان کرایە هێلانەی دانیشتن و یەکتر بینینی ئەندامانی کۆمیتەی (هەرێمی پێشڕەو). کۆبوونەوەکە، کۆبوونەوەی بڕیاردان و یەکلاکردنەوە بوو. ژیانی هاوڕێیانی (هەڵۆی سوور) لە لێواری بورکانێکی مەترسی و کارەساتی نەبینراودا بەدی‌یدەکرا. ئێمە پاش سەردانەکەی صادق بۆ لای برایانی (خوێنی شەهیدان) و سەردانەکەی من بۆ لای (ج) و بەشێک لەنووسەرانی کورد و تێبینی و سەرەنجەکانی حەمید ئەکبەر لەسەر شێوەی کاری بەشێک لەهاوڕێیانی (هەڵۆی سوور) دڵنیابووین لەماوەیەکی زۆر کورتدا سەرجەم ئەندامانی (خوێنی شەهیدان)و(هەڵۆی سوور) تووشی گرتن و کوشتن و راوەدوونان دەبن. بۆیە دەبێ بەزووترین کات بڕیاری یەکلاکەرەوە و چارەنووساز بدەین و نەهێڵین کارەسات رووبدات و درێژە بە خەباتی سیاسی و رۆشنبیری و رێکخراوەیی خۆمان بدەین.

یەکەم: داوامان لە(کۆمیتەی هەرێمەکان)کرد، رۆژنامەیەکی ناوەندی بڵاوبکەنەوە، چونکە (رۆژنامە) بۆ رێکخراوێکی سیاسی یەکجار پێویستە: یەکێتی بیروباوەڕ و یەکێتی رێکخستن و یەکێتی هەڵوێست، بەبێ رۆژنامەیەکی ناوەندی نایەتەدی.

دووەم: دەبێ دەستەی ئێستای (هەڵۆی سوور) هەموو چالاکی و جموجۆڵەکانی بۆ ماوەی یەک مانگ رابگرێت.

سێیەم: دەبێ ئەمانەی خوارەوە رووبکەنە شاخ: (جوامێر سایەمیر، ئاشتی، سەلمان، جەمال، شێرۆ، کازم جاسم.. تاد) چونکە ئەمانە لای هاوڕێ و ناسیاوەکانیان باسی ئەوەیان کردبوو، کە هەریەکەیان چ ڕۆڵێکی لەکوشتنی عوسمان محەمەد فایەقدا گێڕاوەو دەیانەوێت لەداهاتوودا چی بکەن ؟

چوارەم: دەبێ (هەڵۆی سوور) بەراستەوخۆ لەلایەن (هەرێمی پێشڕەو) ەوە سەرپەرشتی بکرێت و نابێ کەسانی تر لەملاو ئەولاوە، دەستوەربدەنە کاروبارەکانیەوە، چونکە ئەمە دەبێتە هۆی ئاژاوە و پشێوی.. (ئەوکاتە دەمانزانی، جوامێرو سەلام پەیوەندیان لەگەڵ (کۆمیتەی هەرێمەکان)دا هەیە، لەوانەوە بڕیاری لابەلا وەردەگرن، بەبێ ڕەچاوکردنی هەلومەرجی ڕێکخستن و تێگەیشتنی (هەرێمی پێشڕەو) بۆ گۆڕانکاریەکانی ناو شاری بەغدا..تاد)

پێنجەم: ڕەخنەی توند لەبەیاننامە لاواز و بێسەرو بەرەکەی کۆمەڵە گیرا، کە بەرپرسیارێتی کوشتنی عوسمان محەمەد فایەقی لەئەستۆ گرتبوو.

(ئەم بەیاننامەیە لەسەر نیولاپەڕەی A4 چاپکرابوو. بەبێ ئەوەی هیچ حسابێک بۆ کاردانەوەی ئەو جۆرە بەیانە بکرێت..)

شەشەم: پێویستە (هەرێمی پێشڕەو) پەیوەندی تەنیا لەگەڵ ئارام (شاسوار جەلال)دا هەبێت و نابێ کەسانی تر لەپەناوە، پەیوەندی لەگەڵ ئەندامانی (هەڵۆی سوور)دا ببەستن. هەر دەستتێوەردانێک دەبێتە هۆی ئەوەی (هەرێمی پێشڕەو) بڕیاری جیابوونەوەی خۆی لەکۆمەڵە بدات و بەشێوەیەکی سەربەخۆ درێژە بەخەباتی سیاسی و فیکری خۆی بدات.

بەکورتیەکەی رایەڵەی نێوان (هەرێمی پێشڕەو)و (کۆمیتەی هەرێمەکان) خەریکبوو بگاتە مریشکە ڕەشە و پچڕان قەناعەتمان وابوو، بەهۆی (کۆمیتەی هەرێمەکان)ەوە کارەساتێکی گەورە روو دەدات. دەبێ بەخێراترین شێوە، پێش ئەوەی بەتەڵەوەبین و کار لەکار بترازێت، بە ئەوپەڕی ڕاشکاوییەوە بەبێ پێچ و پەناو خۆڵکردنە چاوی یەکترەوە وشەکان سەروبۆر بکەین.

# پیاسەیەکی سێ قۆڵی
# (١٦)

ئـەو ماوەیـە لەشـاری خانەقیـەوە، دوورو نزیـک چـاودێری ڕووداوەکانمان دەکرد: عیماد و من زوو زوو یـەکترمان دەبینـی. دەربــــارەی دەنگدانـــــەوەو کاردانــــەوە و ڕەنگدانـــــەوەو دەرهاویشـــتەکانی چالاکییـــەکانی (هـــەڵۆی ســـوور) بـــەچڕی گفتوگۆمـــان دەکـــرد. دوا ڕۆژەکـــانی مـــانگی حـــوزەیران بـــوو، بڕیارمان دا پێکەوە سەفەرێکی کورتی بەغدا بکەین، بەمەبەستی بینینـــی مـــولازم جـــوامێرو ســـەرلەنوێ هانـــدانی، بـــۆ ئـــەوەی بەزووترین کات، بارگـە بۆ هـەوار تێکنێ و ماڵئاوایی لەپایتـەخت بکات و جارێکی دی لەوێ هیچ ئەرکێک دەستۆ نەگرێت.

بەگوێرەی کـات و شـوێنی دیاریکراو گەیشـتین. چایخانەیـەک لە نزیک(ساحة التحرير) ی ناوەڕاستی بەغدا. بەغدا لـەحوزەیران بـەدواوە گەرمایـە، ئێمـە دەوروبـەری سـەعات چـوار گەیشـتین. لەوێ لـەبری شـادی و دڵخۆشـی بـە بینینـەوەی مـولازم جـوامێر، تووشـــی (شـــۆک) و حەپەســـان و ڕاچەڵـــەکین بـــووین! ئێمـــە پێمـانوابوو جـوامێر بەتـەنیا دێت و کەسـی لەگەڵدا نابێت. کـەچی ئـەو سـەرەڕای ئاگـادار کردنـەوەو مەترسـی ئێمـە، لەیـەکێک لـە ئەندامەکانی کۆمەڵە، کە باشـمان دەناسـی و دڵنیـابووین بەرگـەی ئـازارو ئەشـکەنجە ناگرێـت. وەکـو مـرۆڤ پیـاوێکی تێکۆشـەر و مرۆڤێکـی بـەڕێز بـوو، بـەڵام بەرگـەگرتن و بەرگەنـەگرتن و خـۆراگرتن و خۆڕانـەگرتن، ئـەوە پرسـیارێکە نـابێ بەهەنـد وەرنەگیرێت.

جوامێر و (ک. ج)* بەرامبەر یەکتر دانیشتبوون و قسەیان بۆ یەکتر دەکرد. ئەوان ئێمەیان بینی و ئێمەیش ئەوانمان بینی، هەردوولا خۆمان وا نیشاندا، گوایە یەکترمان نەبینیوە، من ئەو چرکەیە رووبارێک ئاوی بەسەتەڵەکم بەسەردا برژایە، ئاوها رانەدەچەنیم. نەمزانی پاشە و پاش بگەڕێمەوە، یان راست بۆ لای جوامێر برۆم و پێبڵێم: ئێمە لەسەر چی رێکەوتین ؟ ئێوە ئەگەر لەسەر شێوەی کارکردنی خۆتان برۆن بەقەڵبەیەکماندا دەدەن.

ئێمە چەندین جار بەراشکاوانە بەجوامێر و ئاشتی و هاورێیانی ترمان گوتبوو: ئێمە، ئێمەین و نامانەوێت (ک. ج) ئێمە بناسێت و نابێ بچوکترین پەیوەندی بە (هەڵوی سوور)ەوە هەبێت. ئێمە شیکاری خۆمان بۆ کەسایەتی و لەش و لاری ئەم کابرایە کردبوو، بریاری نەگۆڕی خۆمان دابوو..

(ک.ج) دەیزانی من ئەندامی کۆمەڵەم، لەسۆنگەی ئەم یەکتر بینینەشەوە ئەوە عیمادیشی** هاتە سەر. لەکاری رێکخراوێکی

---

* (ک.ج) پێشتر کۆمۆنیست و کادرێکی کرێکاری بوو. بەپێچەوانەی شیکاری سایکۆ ـ سۆسیۆلۆژی ئێمە، سەرەتا خۆی باش راگرت تا ١٩٧٨/٤/١٠ رەوانەی ژووری جێبەجێکردنی حوکمی لەسێدارەدان کرا، یەکسەر ورە بەردەدات و ئامادە دەبێت دان بەهەموو شتێکدا بنێت، بەرامبەر بەڵێنی پەتی ئیعدام لەملی دووربخێتەوە. پاش ماوەیەکی کورت ئازادکرا. نووسراوی حوکمی لەسێدارەدانەکەی لەزۆربەی رۆژنامەکانی ئۆپۆزسیۆن کاتی خۆی (١٩٧٨) بلاوکرایەوە. سالی ١٩٧٤ مەلا بەختیار داوای کۆبوونەوەیەکی کردبوو لە (قەسرشیرین) و پێشەکی ناوی ئەندامانی کۆمەڵە، کە ئامادەی کۆبونەوەکە دەبن لای ئەو درکاندبوو. من ئەوکاتە گوتم: ((کاک حیکمەت من بەشداری لەم جۆرە کۆبوونەوەیە ناکەم و پێشم خۆش نییە فلان بمناسێت..)).

** من لەعیماد ئەحمەدم بیستووە، لەکاتی گرتنی ئەودا، (ک.ج) بەرامبەری دانیشتووەو دانیپیداناوە، کە عیمادو مامۆستا جەعفەری لەچاپخانەیەکی نزیک

نهێنیـــدا، یـــەکتر ناســـین بـــەم ئاســـانییە، کێشـــەی گـــەورەی لێدەکەوێتـــەوە. پـــاش ڕۆژی ١٩٧٨/٤/١٠ مەترســـیەکان یـــەک لەدوای یەک هاتنەدی.

ئێمە کورسی و مێزێکیترمان هەڵبژارد و خۆمان لەوان نەبان کـرد، هـەروەکو یـەکێک نـە ئـەوانمان دیبێـت و نـە ئـەوانمان ناسیبێت. داوای چاو ئاوی خۆمان کرد. جوامێر، پاش ماوەیەکی کورت تێگەیشت، نە ئێمە ئامادەین لای ئەوان دابنشین، نە بەوە ڕازی دەبین، ئەوان بێن لای ئێمە دابنشین. ڕەنگە مەترسی و ئاگادارکردنـەوەکانی ئێمـەی بیرکەوتبێتـەوە. یـەک قسـە، یـەک هەڵوێستی نەگۆڕمان هەیە و هێز نییە بەموو لەقسەکانی خۆمان بمانجوڵێنێت. جوامێر (ک.ج)ی بردە دەرەوەو بەلاچاو ئامـاژەی کرد، کە تۆزێکیتر دەگەڕێتەوە بۆ لامان.

جوامێر هاتەوە! زوو هەرسێکمان هەستاین ڕوومانکردە (ئەبو نـەواس)، هـەر بـۆ شـوێن بزرکـردن و خـۆ دوورخستنەوە لـەو چایخانەدا نەماین.

ئەبو نەواسی ئەو سـەردەمە، (ابو نواس) بوو، شنەبایەکی فێنـک لەڕووبارەکـەوە دەهـات، گـەرمای ئـەو نـاوەی فێنـک دەکردەوە. ئەم بەرو ئەوبەری شەقامەکە جمەی دەهات: کوڕان و کیژان پۆل پۆل، شەپۆلیان دەدا. بەشێک جل و بەرگی نمایش دەکـرد. بەشـێکیتری گۆنـەر گۆنـەری پیشـاندانی شـان و مـل و سـینگ و مـەمک بـوو. کـوڕان هـەروەکو گـورگی برسـی، بەحەسرەتەوە سەیری دووگی مەڕ بوون. ئێمەیش بەحیساب گەنجین و لەهەڕەتی لاویدایین: هەر بیرمان لای ئەوەبوو چۆن

(ساحة التحرير) پێکەوە بینیوە و بڕیار بووە لەگەڵ مولازم جوامێر کۆببوونەوەو هاوئاهەنگی بکرێت.

ئەنـدامانی (هــەڵۆی ســوور) ڕەوانــەی شــاخی زەردەو قــۆپی و دەربەند باسەڕە بکەین!

ئێمە هەر زۆر بەڕاشکاوانە مەترسییەکانمان خستە بەرچاو و پێمـان گـوت: بڕیـاری (هـەرێمی پێشـڕەو)ە، دەبێ لـەماوەی سـێ چوار ڕۆژدا بڕۆن و لەشاخ درێژە بە خەبات بدەن. لێرە بواری مانـەوەتان نـەماوەو دەیـان تەڵـەتان بـۆ نراوەتـەوەو بـواری دەربازبوون نەماوە. جوامێر وەکو پیاوێکی عەسکەری هـەر زۆر گوێڕایەڵ بوو. سادەترین منجە منج و بەرپەرچدانەوەو پەڵپ و بیانووی نەبوو..

# دوا دیداری ئاشتی

## (١٧)

پاش گەڕانەوەم بۆ خانەقی، ئاشتی خۆی گەیاندە لای ئێمە. هەرکە یەکترمان بینی، دڵنیابووم ئەو لەبەغدا زۆر بێتاقەت بووەو دەیەوێت بۆ سلێمانی بگەڕێتەوە. من تێبینیەکانی خۆمم بە راشکاوانە خستەڕوو:

گوتم: (( کۆمەڵە نەدەبوو بەرپرسیاریەتی ئەو کارە دەستۆ بگرێت و ئەو بەیاننامەیەی بڵاونەکردایەتەوە! رژێمیش دەنووکی نەدەخستە سەرمان.. پێشم گوتی: تکایە ئێستا تەنیا ئەم چوارە دەزانێت کێ عوسمانی کوشتووە؟ با چوار نەبێتە پێنج.. لەرێکخراوێکی سیاسی نهێنیدا ناونان و ناوبردن و ناوهێنان زیان دەگەیەنێت، نەک قازانج! یەک تۆز گوێتان بۆ ئێمە رادێرابا تووشی ئەم هەموو دڵەڕاوکێ و سەرئێشەیە نەدەبووین..)).

ئاشتی: (( ئەوە دەسەڵاتی منی تێدا نەبوو.. من لەبەغدا بووم، ئەوان لەسلێمانی بەیانێکیان بڵاوکردەوە.. سەبارەت بەوەی چوار کەس دەیزانی: کارەکە کێ ئەنجامی داوە ؟ با چوار نەبێتە پێنج، ئەوە من ناچاربووم بەجوامێر بڵێم و برایانی خوێنی شەهیدانیش لای ئەندامەکانی خۆیان و دەرو دراوسێ و ئاشناو رۆشنا هەرچیان زانیوە بە ئەمانەتەوە گێڕاویانەتەوە!)).

من گوتم: (( هەزار جار پێمنەگوتی زۆربەی کورد ناتوانێت نهێنی بپارێزێت و سادەترین قسە لەدڵیاندا جێگەی نابێتەوە..)).

ئاشتی: ((خوێنی شەهیدان سەرئێشەیان زۆر ناوەتەوە و بە قەڵبەیەکماندا دەدەن. پرنسیپ و دیسپلینیان هەر زۆر لاوازەو ڕێکخستنەکەیان توندوتۆڵ نییە..)). من بە سوعبەتەوە پێمگوت: ((زۆری نەماوە لەسەر شاشە وێنەکەت پیشان بدەن و بڵێن: تم القاء القبض على المجرم سلام عبدالرزاق..)).

ئاشتی بڕێک راچەنی وەکو کەسێک پێشبینی بکات، دەگێرێت و لەسەر شاشەی تەلفزیۆنی بەغدا پیشاندەدرێت..

ئاشتی گوتی: ((من و تۆ زۆربەی کات بەیەکەوەین، منیان گرت، دوای سەعاتێک چنگ لەسەر شان تۆش بۆ لای من دەهێنن. ئیدی هەردووکمان بەیەکەوە لەسەر شاشەی تلفزیۆن پیشان دەدەن..)). من گوتم: ((دڵنیابە بەزیندوویی منیان چنگ ناکەوێت!!

تۆ و سەلمان و جەمال بە سێقۆڵی بۆ بەردەم کامیراتان دەبەن! منیان بۆ چییە ؟)).

ئاشتی: (( من لەزیندانەدا بەبێ ئێوە ئیدارە ناکەم.. ناخۆش نییە! هەر چوارمان لەبەردەم شاشەی تلفزیۆندا پیشانمان بدەن.. رەنگە یەکەمین کەس تۆ پیشانبدەن و بڵێن ئەمە مامۆستایە و برا گەورەی هەمووانە، ئەمەکان زارۆڵە و مناڵە وردکەن و هەر هەمووی لەبن سەری مامۆستادایە..)).

من گوتم: ((ئاشتی! من خۆم زۆرباش دەناسم. بەزیندوویی دەستیان ناکەوم.. من هەمیشە گوێم هەڵخستووە.. قەت لەماڵی خۆمان نانوم، شوێنی خۆشم بەهەموو کەسێک ناڵێم و تۆڕێکی پەیوەندی زۆر چاکیشم لەزۆر شوێن دروست کردووە، وێڕای

ئـەم هــەموو خۆپاراســتنە، توانـای ئـەمن و موخابـەراتی رژێـم بەهەند وەردەگرم..)).

ئاشتی: ((من نامەوێت ئەو ڕاستیانە لەتۆ بشارمەوە: لـەبەغدا هەسـتدەکەم لـەبن چاودێرییـەکی زۆر خەسـتوخۆڵدام، دەمـەوێ لەسلێمانی ماوەیەک خۆم بزر بکەم..)).

مـن گـوتم: ((ئێمـە لەگـەڵ جـوامێر بـەدوورودرێژی قســەمان کردووە. رژێم نەنووسـتوەو مسـتێکی ئاسنینی ئامـادەکردووە بـۆ لێدانی (هەڵۆی سوور)، نابێ ئێمە بەردەستی بکەوین..)).

ئاشـتی: ((مـن ئەمشــەو لێـرە دەمێنمــەوە، دەتـوانین سـبەی بەیەکـەوە بـۆ سـلێمانی سـەفەر بکـەین ؟ دەترسـم نـاوم درابێتـە سەیتەرەکان.. من گیرام هیچ نەبێت تۆ ئاگاداربیت..)).

گـوتم: (( دەبـێ کارێـک بکـەین تـۆ نـەگیرێت. بەسـەرچاوان تـا سلێمانی  من رەوانەت دەکەم، لەوێوە ئیدی دەبێ خۆت مشـوری خۆت بخۆیت..)).

ئاشتی: ((لەکوێوە بڕۆین سەلامەتە ؟)).

من گوتم: ((ناسنامەت پێیە ؟)).

ئاشتی: (( دووسێ ناسنامەی جیاجیام پێیە!)).

گوتم: (( ڕێگەی جەلەولا سەلامەتە!)).

ئاشتی: (( ناسیاوت هەیە بمانگەیێنێت ؟)).

گـوتم: (( ئەگــەر ئۆتــۆمبێلی مۆدیـل بــەرز نــەبێت، گومــان دروست دەکات!)).

ئاشتی: (( لێرەوە بۆ سـلێمانی راسـتەوخۆ تەکەسـییەک بگرین چاکتر نییە ؟)).

گوتم: (( دەچینە جەلەولا و لەویوە بۆ بنگرد (کەلار) خزممان لەوێ هەیە. لەبنگرد خوشکەزایەکم ئۆتۆمبێلی هەیە و خەڵکیش دەناسێت..)).

ڕۆژی دواتر پێکەوە بۆ گەراج چووین. لەئۆتۆمبێلێکدا دوو جێگەمان دەستکەوت. سەلام بەوردی چاودێری ئەو ناوەی دەکرد، بەبێ ئەوەی لای من هیچ بدرکێنێت و باسی پەژارەو کەسەرو دڵەڕاوکێ بکات. هەر پێدەکەنێ و نوکتەی خانەقیانەی بۆ دەگێڕامەوە.

گوتم: (( بۆ نانی نیوەڕۆ لەبنگرد لەماڵی خزمێکمان دەبین. پاش نانی نیوەڕۆ، سلیمانی بمگرە و هاتم!)).

ئاشتی: (( کێشە دروست نابێ ؟)).

گوتم: (( کیشەی چی دروست دەبێت ؟ ئەوان هەر هەموو نازە دەناسن و چل پەنجا ساڵە، کەس و کاری ئێمە یەکتر دەناسن! من دوێنێ پێمگوتن: بۆ نانی نیوەڕۆ لای ئێوە دەبین..)).

ئاشتی: ((نازەخان لەسۆنگەی کاروچالاکی لە (یەکێتی ئافرەتانی کوردستان))دا کەم کەس هەیە نەیناسێت.. ئەوە جگە لەخزمایەتی و پەیوەندی کۆمەڵایەتی!)).

من گوتم: (( ویستیان بمانگرن، نابێ خۆمان بەدەستەوە بدەین. مرۆڤ بکوژرێت نەک بەزیندوویەتی دەست هێزە ئەمنیەکان بکەوێت!)).

ئاشتی: ((من ئەو راستیە دەزانم، جارێ واش هەیە، پیاوی زۆر ئازا بەکڵاو دەگیرێت!)).

گوتم: ((هەوڵی دەربازبوون چاکترە لە بەتەڵەوە بوون!)).

ئاشتی: ((مەلی زیرەک بەدەنووک پێوە دەبێت!)).

پێش ئەوەی ئۆتۆمبێلەکە بەرەو جەلەولا بئاژوێ، خەڵکی جیاجیا سواربوون و جانتاو پڕیاسکەی خۆیان لەبەر قاچی خۆیاندا دانا. من و ئاشتی بەرامبەر یەکتر دانیشتین، پیرەمێردێکی بەساڵاچوو لەتەنیشت ئاشتی دانیشتبوو، ریشێکی سپی وەکو بەفری کوێستانی بەردابووەوە. بە تەسبیحێکی ئەبڵەق هەر خەریکی ویرد خوێندن و (ئەڵڵا.. ئەڵڵا) بوو. لەپڕ وەستاو رووی کردە ئاشتی:

((کوڕم رۆژو بگرە و نوێژ بکە.. رووبکە خوا، با گوناحەکانت هەڵوەرێن!)).

ئاشتی: (( بەچیا ئەزانیت من گوناحم کردووەو عیبادەت ناکەم ؟)).

مام سۆفی: (( گوێم لێتبوو گاڵتەت بەمەلا دەکرد..)).

ئاشتی: (( مام سۆفی! بۆ خاتری خوا حەدم چییە من گاڵتە بەشێخ و مەلا بکەم! من نوکتەم گێڕایەوە بێ قەزابێت!)).

مام سۆفی: (( ژیانی سەر ئەم زەویە زۆر زۆر کورتە! ژیانی ئەو دونیا هەتاهەتایە.. ژیانی هەرمانە..)).

ئاشتی: (( تۆ دەچیتە بەهەشت ؟)).

مام سۆفی: (( بۆ ناچم ؟)).

ئاشتی: (( ئینشەڵا دەچیت.. ئینشەڵا دەچیتە بەهەشت. دوعای خێر بۆ ئێمەش بکە، بەڵکوو بەدوعاو نزای ئێوە ئێمەیش جێگامان بەهەشت بێت و لەوێش چاومان بەیەک بکەوێت.. گرنگ ئەوەیە مام سۆفی منت بیر نەچێتەوە..)).

# دوا وەڵامی ئارام
## (١٨)

پاش چەند رۆژێک ئارام (شاسوار جەلال) بەنامەیەکی (١٥) لاپەڕەیی وەڵامی نامەکەی (هەرێمی پێشڕەو)ی دایەوە. رەزامەندی لەسەر ئەوە دەربڕیبوو، کە مەلا بەختیار بەهیچ شێوەیەک پەیوەندی لەگەڵ (هەرێمی پێشڕەو)دا نەمێنێت، وێڕای پەسەندکردنی داواکەی هەرێمی پێشڕەو بەگەرمی داکۆکی لێکردبوو، کە ئەو سەرکردەیەکی کارامەو بەسوودە بۆ کۆمەڵە. ئەوەی لای ئێمە گرنگ بوو، مەلا بەختیار راستەوخۆ سەرپەرشتیاری (هەرێمی پێشڕەو) نەبێت و هاتوچۆی بەغدا نەکات، چونکە دەترساین بگیرێت و شەهید بکرێت.

دەربارەی رۆژنامەی مەرکەزی، ئارام نووسیبووی: ئێمە رۆژنامەی مەرکەزیمان پێدەرناکرێت، ئەگەر ئێوە پێتان دەردەکرێت، فەرموون ئێوە وەرن دەریبکەن، ئێمەیش دێین کارەکانی ئێوە دەکەین! سەبارەت بە (هەڵۆی سوور) داوای لە(هەرێمی. پێشڕەو) کردبوو، کە لەکاتی پێویستدا یارمەتی بدەن. (هەڵۆی سوور) هێزێکی پێشمەرگەیە و پەیوەندی راستەوخۆی بە (کۆمیتەی هەرێمەکان)ەوە هەیە. ئەم هێزە لەبەغداو بەسرەو دهۆک و شوێنەکانی تری عێراق کاری پێشمەرگانەی خۆی ئەنجام دەدات، دەبێ هەرێمی پێشڕەو، وەکو هەرێمەکانیتر پشتیوانی و یارمەتیان بۆ فەراهەم بکەن.

ماوەیەکی پێنەچوو، بیستمان مولازم جوامێر و سەلمان و سەلام و.. تاد. هەر هەموویان بۆ بەغدا گەڕاونەتەوەو یەک

کەسیشیان لەشاخ نەماوەتەوەو تەنانەت نەیانویستبوو، یان هاندرابوون چەند رۆژێک لەسلێمانی چاوەڕوانی نەکەن و بۆ ناو دۆزەخی پایتەخت بەبێ وەستان بگەڕێنەوە.

١٦/ی ئابی ١٩٧٧ لەئەنجامی پلانێکی بەرفراوانی هێزە ئەمنیەکانی عیراق و کاری خیانەتکارانەی ناسیاوێکی (سەلمان) چەند بۆسەیەک بۆ یەک بە یەکی ئەندامانی (هەڵۆی سوور) و (خوێنی شەهیدان) نرایەوەو کەسیان دەرباز نەبوون. زۆربەیان شەهید کران و بەشێکیان لەزیندان توندکران. رێکخستنەکانی (هەرێمی پێشڕەو)یش وردوخاش بوون. بێگومان ئەگەر (کۆمیتەی هەرێمەکان)* بڕیارەکانی ئێمەیان بەهەند وەرگرتبا، ئەو کارەساتە بەسەر کۆمەڵەدا نەدەهات و ژمارەیەک مرۆڤی دڵسۆزو بوێر، هەروا بەبێهوودە لەناو نەدەچوون!

* ماوەیەک پێش ئێستا (هاوینی ٢٠١٦) لەدانیشتنێکی دۆستانەدا، من و ژمارەیەک لە ئەندامانی سەرکردایەتی (ی. ن. ک)ی کۆکردەوە.. هەڤاڵێک لە هەڤاڵەکان (..........)، بەمەبەستی خۆ جوانکردنەوە، بە پەڕی خەڵک، بەبێ هیچ بۆنەیەک و پێویستیەک بۆ هەڵکێشانی خەنجەر لەکالان، بەدانیشتووانی گوت: ((ئەم مامۆستا جەعفەرە بۆ کاک ئارام راپۆرتی لەسەر نووسیوم..))! جا راستی و ناڕاستی (راپۆرتنووسین)ەکەی من، ئەم نووسراوەی (هەرێمی پێشڕەو)ە بۆ شاسوار جەلال(ئارام). هەر مرۆڤێک بە شێوەیەکی بابەتییانە رووداوەکانی چل و دوو ساڵ لەمەوپێش بهێنێتە پێش چاوی خۆی، یان ئەم لاپەڕانە بخوێنێتەوە، کە من بەکورتی نووسیومن، ئەو راستیانە رەچاو دەکات، کە ئێمە ویستومانە ژیانی هاوڕێیانی (هەڵۆی سوور) بپارێزین و تێگەیشتنەکەی ئێمە راستتر بووە. خۆشبەختانە عیماد ئەحمەد و موحسین عەلی ئەکبەر و دڵشاد مەولود و چەندین کەسیتر شایەتی ئەوە دەدەن بڕیاری (هەرێمی پێشڕەو) راستر بوو، (کۆمیتەی هەرێمەکان) ئەگەر گوێیان لەقسەکانی ئێمە گرتبا ئەو قوربانیە زۆرە و خوێنی ئەو هاوڕێیانەش لەپێناوی هەڵە و بێباکی، بەخۆڕایی، نەدەڕژا.

# مامۆستا جەعفەر

## (١٩)

## (عبدولواحید دلیر)

پیاوێکی قۆز، چاو سەوز، موزەرد، قسەزان، وت و وریا، دەم بە پێکەنین، خاوەن کارەکتەرێکی بەهێز، سەرکردەی رۆژی تەنگانەو دووربین. لە زیندانیشدا، نمونەی تێکۆشەری فیداکار و سەربەرزو دوژمنبەزێن بوو. لە بوێری و خۆڕاگری و رووبەڕووبونەوەدا ئەفسانەیەکی بێوێنەی دروستکرد. بریا ئەم شۆڕەسوارە هەروەکو چۆن بەرامبەر جەلادەکان چەقی، رۆژگار دەرفەتی بداباو لە شاخ و دۆڵ و دەشتی پان و بەرینی ئەم وڵاتەدا بەهەمان شێوە چەقیبا و بەرەنگاری کردبا.

پڵنگێک بە پێی خۆی بەبێ (دان و داو) بە تەڵەوە بێت، خرایە قەفەزەوە، ئیدی هیچی پێ ناکرێت با پڵنگیش بێت و لەدارستاندا کەس نەتوانێت رووبەڕووی بوەستێت.

ساڵی ١٩٧٢ ئەو رۆژەی بەرەو شاری (قەڵاو منارە) کەوتمەڕێ، کاکم گوتی: پێمباشە هاوڕێیەکی پێشمەرگایەتی و رۆژانی سەخت و دەربەدەری بەسەر بکەیتەوە و سڵاوی‌منی پێبگەێنیت: پشتی پێ ببەستە و هەر کێشەیەکت هەبوو موویەک هەڵکڕووزێنە، مامۆستا جەعفەر فریات دەکەوێت. پێشتر بە بەردەوامی نوکتە و قسە خۆشەکانی ئەوی بۆ دەگێڕامەوە.

جارێکیان لەگەڵ مامۆستا موحسین عەلی ئەکبەر و عەزیزی کوێخا وەلی بەناو شەقامەکانی هەولێرا، بۆ کەل و پەل کڕین دەسووڕاینەوە، لەپڕ مامۆستا جەعفەرمان بینی. پاش چۆنی

چـاکی، ئـەم پرسـیارەی لێکـردین: ((ئایـا خانووتـان گرتـووە ؟)). ئێمـەش گوتمـان: خانوویەکی گـەورەو خۆشـمان لەپشت پارێزگـا گرتووە!)).

ماموسـتا جەعفـەر گـوتی : (( بەڕاسـتی هـەولێر هـەر زۆر گەشەی کردووە! جاران تاقە ماڵێک لەو دەشتە، پەنجا کیلۆمـەتر لـە دەرەوەی شـار بوایـە، مـانگی بەهـەزار دینـار، بـە ڕەبـەن* و زگورتیان نـەدەدا! ئێستا ئەمـە گۆڕانێکی سـەیرە لێرە ڕوویداوە، لەگـەڕەکی عارەبـان خانوویـەک بـە حـەوت هەشـت خوێنـدکاری سـەڵت بدەن، ئەمە شتێکی سەیرە..)).

جـارێکی دی ئـەم بەسـەرهاتەی سـەردەمی پێشـمەرگایەتی سەرەتای شەستەکانی بۆ گێڕاینەوە:

(ئێمە لای هەڵەبجـەوە بەرەو پێنجـوێن دەچووین، دەستەیەک پێشـمەرگەیتـر لەشـلێر و ناوخوانـەوە بـەرەو سـەرتەک و بـەمۆ دەڕۆیشـتن، کوێخـا محەمـەدی گۆڕگنـووش لەگـەڵ دەسـتەی دووەمدا بوو، پرسیاری کرد: دەنگوباس چییە؟

ئێمـەش گوتمـان هـەواڵێکمان تۆزێـک لەمـەوپێش بیسـتووە: گوایە سوپای عیراق هێرشی کردووە وشاخی بەمۆی گرتـووە! کوێخـا محەمـەد بـەدەنگێکی پـڕ لەخەفـەت و کەسـەرەوە گـوتی: ((ئەگـەر بـەمۆ گریاگـە! شـیرازەی زنجیرەی شـۆڕش پچڕیاگـە و کورد فەوتیاگە..)).

مستەفا رابەر بۆی گێڕامەوە:

---

* رەبەن: پیاوێک ژنی نەهێنابێت. روهبان: راهب.

لەهەولێر پیتی (ع) دەبێتە (ح) و پیتی (ح) بە (عەین)، وا لەفز دەکرێت. بۆ نمونە (عەلی) دەبێتە (حەلی) و (حەسەن) دەبێتە (عەسەن).. تاد.

مامۆستایەکی عەرەب لەو قوتابخانەیە دادمەزرێت، کە مامۆستا جەعفەری لێدەبێت و ناوی (عمار) دەبێت. هەر یەکەم رۆژ مامۆستاو قوتابی بە (حمار) بانگی دەکەن. کابرای مامۆستای عەرەب رادەچەنێ و دۆشدادەمێنێ!

مامۆستا جەعفەر پێیدەڵێت: وەرە کاکە من هەر زۆر بەئاسانی کێشەکەت بۆ چارەسەر بکەم! ناوی خۆت بگۆڕە بۆ (حمار) بۆ ئەوەی ئێمەیش بە (عمار) بانگت بکەین و تۆش ئەوەندە تووشی (ئیحراج) نەبیت!)).

((کوڕ هەبێ تاریکە شەو زۆرە))، مامۆستا جەعفەر زۆرجار ئەم ئیدیۆمەکەی دووبارە دەکردەوە..

کۆتایی بەهاری ١٩٧٥ کاکم بەسەردان بۆ هەولێر هات. دەستودەم مامۆستا جەعفەر پێیزانی و بۆ رۆژی دواتر بۆ نانی نیوەڕۆ میوانداریی کردین. قانیعە خان سفرەیەکی شاهانەی رازندبووەوە. رێبازو رەوا هەر زۆر گچکە بوون. جارجار جوکە جوکیان دەکرد، مامۆستا جەعفەر بەشێوەیەکی زۆر میهرەبان ئارامی دەکردنەوە.

ئەو رۆژە زانیم لەڕووی تیۆرییەوە چەند شارەزایە و دەتوانێت بە بەڵگەی یەکلاکەرەوە، تێڕوانینی خۆی بخاتە ڕوو. ئەو داکۆکی لەو گۆشەنیگایە دەکرد، کە ناکۆکی سەرەکی گەلی کورد لەگەڵ رژێمی بەغدایە. گەلی کورد، دەبێ، لەبری نایەکڕیزی و پارچە پارچە بوون و پەرتەوازەیی، بەرەیەک

لەسەر بنەمای بەرنامەیەکی هاوبەش پێکبهێنرێت.. ئەوکاتە گونی گاکە توند توند دەگرین و بەئەرزیا دەدەین..

کۆمەڵە لەو ماوەیەدا بەیانێکی بڵاوکردەوە گوایە: ناکۆکی ئێمە لەگەڵ (ئیمپریالیزم) و (زایۆنیزم) و (کۆنەپەرستی جیهانییە)، واتە: ناکۆکی ئێمە لەگەڵ (رژێمی بەغدا)دا لاوەکییە و سەرەکی نییە و دەتوانرێت (بەرەی نیشتمانی) لەگەڵیدا دروست بکرێت. ئەم پشی پشی کردنە بۆ رژێمی فاشی بەغدا لەکوێ، تێگەیشتنی مامۆستا جەعفەر لەکوێ!

ئێوارەی هەمان رۆژ پێکەوە چووینە چایخانەیەک، لەقەلاوە دوور نەبوو. کاکم ئەم پرسیارەی ئاراستەی مامۆستا جەعفەر کرد: ((پێتوایە شۆڕش سەرلەنوێ هەڵبگیرسێتەوە ؟)).

مامۆستا جەعفەر گوتی: هەرەسی شۆڕش، کارەساتێکی زۆر گەورەیە و خەڵک تووشی نائومێدی و بڕوا بەخۆنەبوون هاتووە. قسە و قسەڵۆک و دەنگۆی سەیر سەیر و بێ بنەما بڵاوبۆتەوە، بەڵام هەر قسەیە و هیچ بنچینەیەکی نییە! هەر بۆ نموونە دەڵێن د. سەید عەزیزی شەمزینی سەرکردایەتی جوڵانەوەیەک دەکات و دەیەوێت بەم زووانە شۆڕش رابگەیەنێت. ئەم پیاوە تەمەنێکی هەیەو تووشی نەخۆشی (نقرس)بووە.. ئەقڵ نایگرێت کەسێک لەم ساڵ و تەمەنەدا، سەرکردایەتی شۆڕشی پێبکرێت.. یەکێکیتر کە ناوی دێت حەمە شەمێرانیە: ئەم پیاوە کادرێکی سەربازی بووە، گوایە لەدەوروبەری هەورامان و شەمێران، لەگەڵ ژمارەیەک پ. م جوڵانەوەیەکیان دروست کردووە..)).

کاکم گوتی: باشە تێگەیشتم ئەمانە شۆڕشیان پێناکرێت، ئەی ئەڵتەرناتیف چییە ؟

مامۆستا جەعفەر گوتی: ((ئەمانە و خەڵکی تریش دەتوانن شۆڕش هەڵگیرسێنن، بەڵام سەرکەوتوو نابن.. دەبێ پێشەکی حزبێکی بەهێز هەبێت و حزب بڕیاری شۆڕش بەرپاکردن بدات، نەک هەندێ کەسایەتیی کۆن جاریکی دی بێنەوە سەر شانۆ..)).

سەفەرە نهێنیەکەی بۆ شام بەمەبەستی بینینی مام جەلال هەڵەیەکی کوشندە بوو. رژێم بەدەیان بەکرێگیراوی لەوێ چاندبوو. یەکێکیان، کە دواتر ئاشکرابوو بەهۆی نزیک بوونیەوە لەمام جەلال و سەرکردەکان وەکو کەسێکی ((باوەڕپێکراو)) گورزی جەرگبری لە (ی. ن. ک) داو زۆر بابەتی نهێنیی بۆ رژێمی بەغدا ئاشکرا کرد، بەقسەی مام جەلال و نەوشیروان و عادل موراد.. تاد. یەکتر بینین لەو جۆرە ژینگەیەدا مەترسی خۆی هەیە. مام جەلال دەیتوانی ئەو یەکتر بینینە بخاتە قوبرس یان یۆنان، نەک پایتەختی دوژمنترین دوژمنی رژێمی بەغدا.

ئاستی تیۆریی، شێوەی پەیڤین و پەیوەندیی کۆمەلایەتی، لەتەمەنی سی و دوو ساڵیدا، زۆر بەرزبوو لەچاو زۆربەی ئەو سەرکردانەی دواتر، لەنزیکەوە بینیومن و ناسیومن و ئێستا زۆربەی خەڵکیش دەیانناسێت و ژیاننامەیان بە باشی دەزانێت، من هیچ پەردیشێک* نادۆزمەوە بۆ بەراورد و بەراوردکاری. لەدەستدانی ئەم جۆرە سەرکردانە بەبێ ئەوەی هیچ سوودێکیان لێوەربگیرێت، ئاستی تیۆری و فیکریی کۆمەڵەی هێنایە خوارەوە، تا پاشان بەئاسانی دەستەمۆکراو هەڵوەشێنرایەوە..

* پەردیش: پەردیز: مجال: من پەردیشم نییە! ئەم وشەیە لەشارباژێر بەکاردێت.

# غاندی

# (مەجید محەممەد کەریم)

# (٢٠)

سەرەتای ئەیلوولی ١٩٧٨ لە (وارمیوان) مام جەلال پێیگوتم: (.. لەناو کوردا من خۆم عەرەبی زانی یەکەمم، غاندی دووەمە.. بەڕاستی ئەو عەرەبییەکی زۆرباش دەزانێت. ئەوە لەناو شار چی دەکات ؟ لێرە بوایە ئیدی کیشەی زمانی عەرەبیمان لەبواری راگەیاندندا نەدەبوو ..)).

من گوتم: ئەو عەرەبی و کوردی و فارسی و ئینگلیزی یەک لەیەک باشتر دەزانێت..مام جەلال گوتی: ((تێکۆشەرێکی دێرینە، لەهەمەدانەوە لەنزیکەوە یەکتر دەناسین، ماوەیەکی تر داوای لێدەکەین با ئەویش بۆ ئێرە بێت..)).

غاندی ساڵی ١٩٦٣ لەتەمەنی پانزە ساڵیدا بۆ یەکەمین جار، زیندانی کرا. هەر دوا بەدوای کوژرانی (حەسەن سەقا)* هێڵێکی یەکێتی قوتابیانی کوردستان و پارتی ئاشکرابوو (غاندی، محەمەد یاوەر، محەمەد جەلیل،.. تاد) گیران. کۆتایی ساڵی ١٩٦٣ ئازاد کران، هەر یەکسەر رووی کردە شاخ. لەماڵوێرانی دووبەرەکیدا، ئەم لەگەڵ هەڤاڵەکانی خۆی لەناو باڵی (م.س)یان بینیەوەو لەگەڵیاندا بۆ هەمەدان چوو.

زۆرجار هەر بۆ سوعبەت، بەزمانێکی پاراو، حیکایەت و سەربردەی ناو زیندان و پێشمەرگایەتی دەگێڕایەوە: ((لەناو زیندانندا، رۆژێکیان هەر زۆر گەرم بوو، ئێمەیش لەبەردەم

---

* حەسەن سەقا: کەسایەتییەکی پارتی بوو لەشاری خانەقی و ساڵی ١٩٦٢ لەناوەڕاستی بازاڕ بەر گوللەدرا، لایەنگرانی پارتی بەکۆمەڵ بەشداریان لەمەراسیمی شاردنەوەی کرد. رژێم ژمارەیەک خەڵکی دەستنیشانکرد و زۆربەیان گیران.

پەنجەرەکەدا بۆ هەلّمژینی تۆزێک بای فێنک خۆمان تۆپەلّ کردبوو.. پیاوێک بەکەواو سەلّتەو جامانەوە، کیژەکەی دابووە بەر. کیژەکە یەکجار منالّ بوو، شێوەی هەر لەدە دوانزە سالاّن دەچوو. باوکەکە رووی کردە معاون ئەحمەد، کە پیاوێکی گەنجی قۆز بوو، گوتی:

جەنابی معاون! ئەمە کچی منە و مێردەکەی رۆژ نییە چینێک دارکاری نەکات. بەلّکو بانگی بکەیت و تۆزێک گوێی با بدەیت..

معاون ئەحمەد، واقی ورماو چاوی پەڕیە پشتی سەری: ((بۆ خاتری خواو پەیامبەر! چۆن ئەم کیژە منالّەت بەشوو داوە ؟)).

باوکی کچەکە، دەستمالّ هەوریشمەکەی دەرکرد و پێش ئەوەی ئارەقی نەوچاوانی بسڕێتەوە گوتی: ((جەنابی معاون! منالّی چی ؟ بیقەزابیت تۆ دەستەکانت بێنەو دەست لەمەمکی بدە، ئینجا دەزانیت ئەی دوێتە* منالّە یان منالّ نییە..)).

پاش نسکۆی ١٩٧٥ رۆژانە غاندی و من دانوستاندنمان لەسەر چارەنووس و داهاتووی گەلی کورد دەکرد. رۆژێکیان پێیگوتم: ((.. لەولاتانی رۆژاوا، کێشەی سەرکردەیان نییە، کێشەی بەرنامەی ئابوری و هێزی سیاسیان هەیە. میدیا (کەسایەتی) دروست دەکات و بەرەو سەرەوەی دەبات. لەرۆژهەلات، حزب: دروشم و کەرستەی سەرقالّکردن و گەرمکردنی بازاڕی سیاسیە. سەرکردەیەکی سیاسی مەزن، بزاڤی سیاسی مەزن دروست دەکات. کاتێک سەرکردەیەک دەمرێت یان دەکوژرێت، بزووتنەوە سیاسیەکەش کۆتایی پێدێت!

من گوتم: ((بۆ سەرکردە لەرۆژهەلاتی ناوەڕاستدا، دەبێتە چەق و (ناوەند)ی رووداوە سیاسیەکان، کەچی حزب ناتوانێت ئەو دەورە بگێڕێت ؟)).

---

* دوێت: دۆت: کچ.

غاندی گوتی: ((لەرۆژهەڵاتدا دامەزراوە(مؤسسات)ی ئابوری و سیاسی و فەرهەنگی بێدەست و پێیە، هێشتا دەڵەمەیە و نەمەییوە.. سەرکردەیەکی سیاسی راستەقینە دەتوانێت کاریگەری لەسەر رووداوەکان دابنێت..)).

من گوتم: ((لەرۆژهەڵاتدا سەرکردەیەکی سیاسی شۆڕش هەڵدەگیرسێنێت و بەرە بەرە دامەزراوەی پێشمەرگەیی و سەربازی و سیاسی دروست دەبێت..)).

غاندی گوتی: ((کێشەکە ئەوەیە، دامەزراوە دەبێ سەرۆک دروست بکات، نەک سەرۆک دامەزراوە دروست بکات!)).

من گوتم: ((تێگەیشتنەکەی تۆ بۆ وڵاتێک دەبێت، کە دەوڵەتی هەبێت، گەلێک دەوڵەتی نەبێت، دامەزراوەی تایبەت و (سەربەخۆ)ی خۆیی نابێت..)). غاندی کەسێک نەبوو بۆ وشە و رستە و بیرۆکە دابمێنێ، بەراشکاوانە گوتی:

((راستە ئێمە دەوڵەتمان نییە، ئێستا لەچاو چوار پێنج مانگ لەمەوپێش حزب و سەرکردەکەشمان لەسەر شانۆ رووداوەکاندا نەماون! لەمەودوا کێشەکان گۆڕانیان بەسەردا دێت..)).

من گوتم: ((دەتەوێ بڵێیت: جوڵانەوەی سیاسی بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ سڕ دەبێت..)).

غاندی گوتی: (( من باسی سڕبووون و سڕ نەبوونم نەکرد.. من پێموایە لەقۆناخی داهاتوودا تووشی تەنگژەی سەرۆک.. سەرکردە دەبین.. سەرکردەیەک بتوانێت، هەموو گەل لەبن یەک ئاڵادا کۆبکاتەوە و سەرکەوتنی سیاسی وەدەستبهێنێت..)).

من گوتم: (( ئەگەر سەرکردەیەک شانۆی سیاسی جێهێشت، کەس پڕکێشی ئەوە ناکات جێگەی بگرێتەوە ؟)).

غاندی گوتی: (( بارزانی لەبڕگەیەکی مێژوویی دوورودرێژدا، سەرکردایەتی بزاڤی رزگاری گەلی کوردی دەکرد. زانا و نەزان، خوێندەوارو نەخوێندەوار لەبن رەشماڵەکەی ئەودا کۆبوونەوە،

ویستی گەلێکی بەرجەستە دەکرد. هەرچەند تەرازووی هێزی عەسکەری لەنێوان رژێم و گەلی کورد نا بەرامبەر بوو، گەلی کورد لەشەڕگەو مەیدانی شەڕدا نەدۆڕا. لەسەر مێزی گفتوگۆ، بواری سیاسی و دیپلۆماسیدا، هەنگاوی راستی نەهاویشت، پێی لەسەر تەختەی چرووک دانا. لەهەڵبژاردەی سیاسیدا، نابێ گرەو لەسەر دووڕیانێک بکرێت، کە دەتگەیەنێتە بنبەست..

تا ئەم ماوەیە، گەلی کورد سەرکردەی هەبوو، لەمەودوا کەسایەتیەک بەدیناکەم، قورسایی ئەوی هەبێت و بتوانێت ئەو بۆشاییە پڕ بکاتەوە..)). دیاربوو هەرەس و رەنگدانەوەکانی کاریگەری قووڵیان کردبووە سەر شێوەی بیرکردنەوەی غاندی. پێیوابوو ئەو خۆی بە تیشکی ئایدیۆلۆژیاو خەون و خەیاڵاتی پێش ساڵی (١٩٧٠)وە هەڵدەواسێت و دەڵێت: رووداوەکان، خوێندنەوەکانی (مام جەلال)یان سەلماندو ئەو دەتوانێت بگەڕێتەوەو بەختی خۆی سەرلەنوێ تاقیبکاتەوە..

((.. ئەم قۆناخە کەسایەتییەکی نوێی دەوێت، بارگاوی نەبووبێت بە پریشک و بزۆزسکی* برین و جەرگ سوتانی رابردوو.. سەرکردەی سیاسی گەورە نابێ ببێتە بەشێک لەشەڕ و پێکدادانی ناوخۆ. دەبێ بێلایەنی خۆی بپارێزێت و رێگە نەدات بە دەستی ئەو، رۆڵەی کورد بکوژرێت و ماڵوێرانی بەسەر خەڵکی رەش و رووتی ئەم وڵاتەدا بێت...)).

مام جەلال پێیوتم: (( من هەڵەی مێژوویم کردووە و زۆریش لێیان پەشیمانم. سەرکردەی مێژوویی دەبێ زۆر دووربین بێت، لەهەڵە و پەشیمانی پێش روودانیان خۆی بپارێزێت و هەوێنی ئاشتی و برایەتی و یەکڕیزی بێت، نەک دۆو دۆشاو تێکەڵاو بکات!!)).

---

* بزۆزسک: پریشک (بناری بەمۆ)

# ئازادی مەلا

## (٢١)

بەناو دارودەوەن و بەردەڵان و بە ئەسپەرێدا (سەرزەل)مان جێهێشت، بەدەستە چەپدا داگەڕاین. ئەبوبەکر و ئاشتی چاوشین پێکەوە دەدوان. ئەبو بەکر (ئارام) رووی پرسیارەکەی ئاراستەی ئێمە کرد، ویستی بنەمای رەوایەتی بە بۆچوونەکەی خۆی ببەخشێت! هەموو گیانم بوو بەگوێ، چونکە دەمویست ئەو سێ کادرە بناسم، کە شانیان بەشاخی (بەرانان)ەوە داوەو دەیانەوێت لەم شاخەوە شۆڕشی سۆسیالیستی هەڵگیرسێنن..

ئەبوبەکر گوتی: ((کەی ڕەوایە هاوڕێیەک بۆ هاوڕێیەکی خۆی نامە بەم شێوەیە بنووسێت ؟)).

گوتم: (( من بەباشی گوێم لەقسەکانی ئێوە نەبوو!)).

ئەبووبەکر گوتی: (( ئەم هاوڕێیە، بەم شێوەیەی خوارەوە، نامەکەی داڕشتووە:

: بۆ ب. ک. ئا.

س. ش.

ن. گەیشت س..)).

پەکوو! پەکوو! من لەم هەموو پیتپیتێن و پیتپیتانۆکێیە* تێنەگەیشتم! ئای خودا بۆ لەم سەربانە منت بەردایەوە ؟

---

* پیتپیتانۆکی: لەسەر کێش و ئاوازی خەپخەپانۆکی دانراوە: خەپخەپانۆکێ: جۆرە نەریت و یارییەکی دەڤەری مەنگوڕایەتییە.. من نامەوێ لەمە زیاتر لەسەری بنووسم. فەرهەنگی ((هەمبانە بۆرینە)). خۆی لەم وشەیە بواردووە و فەرهەنگەکانیتریش بەلای ئەم زاراوەیە نەچوون.

پێموابوو، ئەمە هاوشێوەی بروسکەی نهێنی و پەرلەو جفرەیە، کە لەناو شۆڕشی نوێدا باوەو من جارێ ئاشنایەتیم لەگەڵیاندا پەیدا نەکردووە..

گوتم: ((تێنەگەیشتم ئەمە بروسکەیە؟ جفرەیە؟)).

ئەوان لەقاقای پێکەنینیاندا. نەمزانی بەچی پێدەکەنن؟

ئەبوبەکر گوتی: (( ئەمە نامەی هاوڕێکەیە!)).

بەڕاشکاوانە گوتم: (( تێنەگەیشتم چی دەگەیێنیت و دەیەوێت چی بڵێت؟)).

ئەبووبەکر زانی بابەتەکە بۆ من بابەتێکی نوێیە و پێویستە کۆدەکان بکرێنەوە:

((بۆ بەڕێز کاک ئارام

سڵاوێکی شۆڕشگێڕانە

نامەکەت گەیشت سوپاس.. تاد)).

گوتم: ((مەبەستی چی بوو؟ مەبەستی ئەوە بووە، ئەگەر نامەکە بەرێکەوت دەست دەزگایەکی هەواڵگری کەوت، کەس لێیتێنەگات و هیچ سوودێکی لێوەرنەگیرێت ؟)).

ئەبوبەکر: (( ناوی ئازادی مەلات بیستووە؟)).

گوتم: ((ئازادی مەلا! ئازادی مەلا هاوڕێمە!)).

ئەبوبەکر: (( زۆرباشە تۆش لەنزیکەوە وا دەیناسیت!

گوایە ویستویەتی بەرامبەرەکەی بەهیچ دابنێت و بەحساب هەر بێزیشی نەهاتووە، ناوی بهێنێیت! یان ناوی راستەقینەی بەرامبەرەکەی بنووسێت و بە هاوتای خۆی بزانێت، نەیویستووە لەچەند دێڕێک بەولاوە، هیچ وشە و رستە بداتە بەر رەشەبا، بە ئەغزی زانیوە نامەی سڵاو رێز نواندن رەوانە بکات..)).

گوتم: (( ئەوەندەی من ناسیومە، لەریزباران و گوڵباران بەو لاوە هیچ شتێکم لێی نەبینیوە، دڵ گەرد بگرێت! راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ درک و چزم لێنەبینوە. تا رادەیەک لەهەوای لووتبەرزی و خۆبەشتدانان دوور بووە. لەزیندانیشدا پیاوێکی خۆراگرو خۆنەویست و بە هەڵوێست بووە!)).

ئەبووبەکر دانی بەلایەنی ئەرێنی ئەو پیاوەدا نا:

((بەڵێ وایە! لەزینداندا پیاوێکی قایم و خۆڕاگر بووە!)).

لەشاری هەولێر ئازادی مەلام ناسی: پیاوێکی قورس و گران و دەروێشی سیاسەت بوو، جێگەی متمانەی دۆست و هاوڕێیانی بوو. من لەرێگەی مامۆستا جەعفەرەوە ناسیم. هەستم کرد شێوەی پەیوەندی هەردوولا بۆنی جەنجاڵی سیاسەت و بۆکروزی کاری رێکخستنی لێوە دەهات. بەلامەوە جوان نەبوو ئەو پرسیارە لە یەکێکیان بکەم، سیاسەت ئەوانی کردۆتە هاوڕێ، یان هاوڕێتی جۆگەلەی سیاسی لێبۆتەوە.

ئازاد، ئەگەرچی ئەندامی سەرکردایەتی نەبوو، بەلام هەروەکو کوردان گوتویانە(شێلە هیچی لە بێلە کەمتر نییە!)، خۆی لەسەرکردەی سەرکردەکان بە زێدەتر دادەنا و دەیزانی چۆن دڵی خەڵک رابگرێت و بیرورای خۆی بسەپێنێت و دەیتوانی لەناو رێکخستندا رۆڵ و کاریگەرێتی بۆچوونەکانی فراوانتر بکاتەوە.

ئاستی تیۆری و رۆشنبیریی وەکو زۆربەی ئەندامانی (کملک) مام ناوەندی بوو. رێکەوتێکی سەیر، قەت کتێب و رۆژنامە و گۆڤارم بەدەستیەوە نەبینیوە. نە رۆژێ باسی خوێندنەوەی

کتێبێکی بۆ کردم و نە حەزی دەکرد خۆی لەقەرەی بابەتە فیکری و تیۆریەکانێ بدات. ئەو بایەخی بەدەنگ و باسی سیاسی ناو خەڵک و بازاڕ دەدا. بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی بینیبوو، یان بۆی خوێنرابووەوە. هەر جارێک یەکترمان دیتبا، من باسی ئەو کتێبانەم بۆ دەکرد، کە تازە بڵاوکراونەتەوە، دەربارەی دووبەرەکێی چین و سۆڤیەت، جولانەوە سیاسیەکانی ئەمەریکای لاتین بۆ نمونە (توپامارۆس).. تاد. ئەو بە پرسیارو پرسیارۆکە بەردەبازی خۆ پەڕاندنەوەی دروست دەکرد.

دەمەوێ دەست لەسەر ئەو راستیە داگرم، کە سەرکردایەتیی کۆمەڵە، بەگشتی ئاستی رۆشنبیری و تیۆرییان، بایی ئەوە نەبووە، هێزێکی سیاسیی تۆکمە دروست بکەن، یان بزاڤێکی فیکریی نوێ پەرەپێبدەن. هیچ تێڕوانین و تیزی خۆیان نەبوو لەسەر داهاتووی وڵات، یان شیکردنەوەی سروشتی سیاسی و ئایدیۆلۆژیی رژێم. زۆرجار کەمتەرخەمی و ئەقڵ پێنەشکان تووشی هەڵەی قورس و ترسناکی دەکردن. هاوینی ١٩٧٥ سەرکردایەتی (کملک) ناکۆکی لەگەڵ ئیمپریالیزم و زانیۆزمی بەناکۆکی سەرەکی دادەنا و ناکۆکیی لەگەڵ رژێم بەناکۆکی لاوەکی دادەنا.. هەر بۆ ئەوەی رژێم داوایان لێبکات بەشداری لە حکومەت و بەرە کارتۆنیەکەدا بکەن. ئەمانە لەسروشتی رژێم تێگەیشتبان و تۆزێک سەریان لە(تیۆرییەکانی فاشیزم) دەرچووبا، هەڵەی وا زەقیان نەدەکرد و لایەنی کەم بەجۆرێکي دی بیریان دەکردەوە. حزبی مارکسی، یان بزاڤێکی چەپ بە

کەسانێک دروست ناکرێت شارەزایی تیۆرییان ئەوەندە کەم بێت*.

پاش نسکۆی ١٩٧٥ هەردووکمان لەهەولێر بوین و زوو زوو یەکترمان دەبینی. من ئەوکاتە سەرم سوورمابوو لەسەرکردایەتیی کۆمەڵە، ماوەی یەک ساڵی رەبەق نەیانتوانی، دوو سێ جار پەیوەندی بە (هەرێمی باوەڕ)ەوە بکەن. لەو ماوەیەدا بەهەزار حاڵ بڵاوکراوەیەکیان بڵاوکردەوە.

رۆژێکیان بە ئازادم گوت:

((سەرەتا پێموابوو: کۆمەڵە رێکخستنێکی رێک و پێکەو لەئۆتۆمبێلێکی مەرسیدسی مۆدێل بەرز دەچێت. ئێستا بەتەواوی قەناعەتم کردووە، عەرەبانەیەکی شەق و شڕە و بە پاڵیش ناجوڵێت..)). دوای ماوەیەک مەلا بەختیارم لەخانەقی بینی، هەمان رستەم لای ئەویش دووبارە کردەوە.

ساڵی ١٩٧٩ ئازادیش وەکو گیراوەکانیتری کۆمەڵە، بەر لێبوردنی گشتی کەوت و ئازادکرا. ماوەیەکی پێنەچوو خۆی گەیاندە شاخ و لەنێوزەنگ یەکترمان بینیەوە. زوو زوو سەردانی دەکردم و دەردی دڵی خۆی بۆ هەڵدەڕشتم.

چەند رۆژێک پێش شەهیدبوونی سەردانی کردم، تاقم و مەخزەنی لەخۆی دابوو، کلاشینکۆفێکی کردبووە شانی. باسی ئەوەی کرد، کە دەیەویت لەگەڵ مەفرەزەیەک بۆ ناو شار بڕوات. گوتم: پەلە مەکە لەکاری سەربازی و دەبێ پێشتر

---

* عەلی شامار هاوینی ١٩٧٥ بەیانی کۆمەڵەی بینیبوو، هەزاران رەخنەی توندی لەبیرکردنەوەی سەرکردایەتی کۆمەڵە گرت.

لەسەر تەقە و رەقە خۆت رابهێنیت و فێری شەڕی پارتیزانی ببیت، نەک یەکسەر مەفرەزەیەک بۆ ناو شار بکەیت.

پاش چەند رۆژێک هەواڵی شەهیدبوونی گەیشت. چیرۆکێکی زۆر لەسەر ژمارەی ئەو فیشەکانەی لە پشتەوە بەری کەوتبوون دروست کرا. لەم وڵاتەدا راستی و ناڕاستی ئەوەندە تێکەڵاو دەکرێت، کەس نازانی راستی سەری لەکوێیە و پێی لەکوێ شاراوەتەوە!

## (١)

لە١٦/ ی ئابی ١٩٧٧ بەدواوە، صادق شەریف و عیماد و بەندە، هەرسێکمان دڵنیابووین ئاشتی و جوامێر لەپۆلا پۆلاترو لەسەفین و قەندیل و کۆدۆ سەختترن و جەلادەکان رەنگە بتوانن ونجڕ ونجڕیان بکەن، بەڵام ناتوانن یەک وشەشیان لێدەربهێنن. هەرکە زانیمان (ک.ج) گیراوە، هەرسێکمان قەڵەمی ئەژنۆمان شکاو دەستمان لەخۆمان بەردا. پێشتریش تکای خوێنمان لەئاشتی و جوامێر کرد دەستبەرداری (ک.ج) ببن، چونکە بەرامبەر شمشێری ئازارو ئەشکەنجەی بەعس لاوازە و قەت ناتوانێ خۆی رابگرێت، زمانمان مووی لێهات و بنچینەی دیواری قەناعەتی ئەوان درزی تێنەکەوت..

عیماد لەهاتنە دەرەوە، بڕێک دوو دڵ بوو، ئەو بڕوای بە بەهێزکردنی رێکخستن و کاری جەماوەری هەبوو، نەک شاخ و لوولەی تفەنگ! صادق بە بەردەوامی شێوازەکانی ئازار و لێدانی جەلادەکانی دەخستە بەرچاوی، وەکو:

- راچەنینی کارەبایی.
- ئوتووکردنی پشت.
- پێچانەوەی سەروملی بە تەلیدڕکاوی و بەردانە خوارەوە لە شوێنێکی بەرزەوە..
- لەگەڵ سەگدا کەسێک دەخرێتە گوێنییەوەو بە کێبڵ و پێلەقە لێیدەدرێت..

ناوەڕاستی مانگی ئۆکتۆبەری ١٩٧٧ من و صادق دوو قۆڵی بەرەو سلێمانی کەوتینە رێ، بەهیوای ئەوەی پەیوەندی بەرێکخستنەوە بکەین و بەرەو شاخ بڕۆین. ئەو ماوەیە

لەشوقەکەی مامۆستا موحسین ماینەوەو سەردانی دۆست و ناسیاومان دەکرد. سەرو جانتامان پێبوو، یەکی دەفتەرێکمان کڕی، دەمانزانی دەبێ ڕۆژانە یادەوەریەکانمان یادداشت بکەین و ئەزموونی ڕۆژانی پێشمەرگایەتی بنووسینەوە.

ئەو ماوەیە لەگۆڤارێکی عەرەبی گفتوگۆیەکی (ریژێ دۆبرە)م خوێندەوە، کە گوتبووی: ((من بەچاوی خۆم دروستبوونی مێژووم بینی..)). مەبەستی ئەو، بەشداریکردنی لەشەڕی پارتیزانی چی گوارا و هاوڕێکانی لەبۆلیفیا ساڵی ١٩٦٧ کە زۆربەیان کوژران و ئەم دەستگیرکرا. واتە: خەڵک لەدوورەوە ئەو مێژووەی خوێندۆتەوە، ئەم بەشداری لەدایکبوونی ئەو مێژووەی کردووە. من ئەوکاتە لەگەڵ خۆمدا گوتم: ((ئەی تۆ دەتەوێ، گەلەکەت شۆڕش بکات و هاوڕێکانت شەهید بن و خۆت لەبەغدا دانیشیت و ردێن بەربدەیتەوەو چرووت بەدەمتەوە بنەیت و باسی شۆڕش و یاخیبوون و راپەڕین بکەیت! دەمەوێت دروستبوونی مێژوو ببینم و بەشداری کارا بکەم لەبناغەدانانی کۆمەڵێکی سۆسیالیستی، کرێکاران و جووتیاران رابەرایەتیی شۆڕش بکەن و رێگە نەدرێت دەرەبەگ و سەرمایەداران، بەرژەوەندی و دەسەڵاتی خۆیان بسەپێنن.

بیرم نەبوو ئەوە بنووسم: ساڵی ١٩٧٥ ـ ١٩٧٧ جووتیارێکی هاوڕێم هەبوو لەیەکێک لەگوندەکانی ئالان و سیوەیل، بەناوی حەسەن، زۆرجار یەکترمان دەبینی و من باسی (شۆڕشی نوێ)م بۆ دەکرد، کە ئەمجارەیان وەکو جارەکانی تر نابێت. هەژاران و نەداران رابەرایەتی شۆڕشیان دەکەوێتە دەست و رێگە نادرێت ئاغاو دەرەبەگ لەسەرەوە بن، ئەوان خاوەن دەسەڵات دەبن، لە مەودوا کەس ناتوانێت بەناوی شۆڕشەوە

هـەژارو رەنجدەر بچەوسێننەوە. ئەوەنـدەم رسـت کـابرا بـۆژوو بوو، بەدەستی راستی کڵاوو جامانەکەی بەرەو سەرەوە بردو گوتی: ((ئای مامۆستا گیان! خۆزگە ئەوەندە کەر نەبوویتایە!)). مـن راچـەنیم! چونکـە ئـەو جـۆرە سـوعبەتمان لەگـەڵ یـەکتـردا نـەبوو.. ئـەو لەسـەر قسـەکانی بـەردەوام بـوو: (.. تـۆ بەهـەموو ئەقڵێکتـــەوە دەتـــەوێت هـــەژار و چەوســـاوەو رەش و ڕووت شـۆڕش بکـەن و ئاغـاو دەرەبـەگ و دەوڵەمەنـدیش ببنـە ژێـر دەســـتەو کزکـــز دابنیشـــن لەســـای دیـــواران و دەســـت بەکڵاوەکەیانـەوە بگرن و زرتـەی چاویـان بێت. حەزدەکـەم دڵنیا بیت هەژارو رەش و وڕووت و چەوساوە، هەزار شۆڕش بکەن، لەدوا چرکەکانی پێش لەسەرنانی تاجی سەرکەوتن، دەرەبـەگ و دەوڵەمەندەکان دێن و تاجی سەرکەوتن لەدەستیان دەپچڕێنن و تاجەکـە لەسـەر خۆیـان دەنـێن، یـەکێکی وەکـو تـۆ هـەزاران قوربانیت دابێت و هـەزاران شۆڕشـت کردبێت، بەهـەزار عـەریزە ناگەیتـە لای سـەرکردایەتی و بەلایانـدا تێپـەڕیت سـەگت پێـوە دەنێن..

ئاغـاو دەرەبـەگ و دەستڕۆیشـتوو، چـەک و پارەیـان هەیـە، سەدان پیاویـان هەیـە، شـارەزایی تـەواویان هەیـە، چـۆن دەسـت بەسەر شۆڕشدا بگرن؟ من و تۆ هـەر لـەوە شـارەزاییمان هەیە قوربـانی بـدەین و خۆمـان بەکوشـت بـدەین و خـەڵکیتر بکەینـە کەڵەگای خۆمان و قوڕ بەسەر خۆماندا بکەین!)).

من بەخەیاڵی خۆم هەرکە ئەمڕۆ پەیوەندیمان بەرێکخستنەوە کـرد، پـاش چەنـد سـەعاتێک یـەکێک بەدوامانـدا دێـت و دەمانگەیەنێتـە لای بارەگـای سـەرکردایەتی. یـەک مـانگی رەبـەق هــەر ئــەمڕۆ و بــەیانییان پێکــردین: (لای مزگــەوتی گــەورە

چاوەڕوان بن، لای مزگەوتی بن تەبەق چاوەڕوان بن، لای مزگەوتی دوودەرگا چاوەڕوان بن..). ناونیشانی بێتام و پەیوەندی و رایەڵەی بێسەروبەر، بەتەواوی بێزاری کردین. رۆژ بەرۆژ دەنگوباسی گرتن و پەلاماردانی رێکخستنمان پێدەگەیشت، ئەگەری دانپیدانان و بەدەستەوەدان و زمان لێدان کەم نەبوو.. ئەوەندە پەستبووم، پێموتن: دیارە ماستەکە بێ موو نییە و ئەو برایانە نەتوانن یەکێک مەترسی لەسەر ژیانی دروست بوویێت دەربازی بکەن، چۆن دەتوانن رێکخستن هەڵسووڕێنن و بیخەنەگەڕ و شۆڕش درێژە پێبدەن ؟

ئەو رۆژەی رۆیشتم تەنیا بەمامۆستا موحسین و شێخ رزگاری خوشکەزام گوت: ئەوە من دەڕۆم و ئێمە ئیدی یەکتر نابینینەوە. من و صادق سەردانی حەمەئەمین ئاغای حاجی حەسەن ئاغای باریمان کرد کە رێزی مامی گەورە و برای دڵسۆزی لام هەبوو. ئێوارە چووین بۆ ماڵی ئەوان: پێشمەرگەی دێرین و خانەدان و پیاوێکی کۆمەڵایەتی و جێگای متمانەی من بوو. ئەو شەوەش لەماڵی ئەوان ماینەوەو تا درەنگانی شەو بیرەوەریەکانی خۆی بۆ گێڕاینەوە. پیاوێکی شیرین رەفتارو قسەزان و هونەرمەند بوو لەگێڕانەوەی نوکتە و سەربردە خۆش خۆشەکان.

# ڕۆژی ماڵئاوایی

## (٢)

پاش یەک مانگ لە هاڕەی دەستاڕی چاوەڕوانی و دڵەڕاوکێ ئینجا (گردە کەوتە پێمەلە)و ڕێکخستنی کۆمەڵەش خۆی ڕاتەکاند و بڕیاری مێژوویی خۆی دا: ئێمە لە چەم بە پێمەلە بپەڕێنێتەوە.

ڕۆژی چوارشـــەممە ١٩٧٧/١٢/٧ ڕۆژی پەروازو ئـــاوازو هەورازو دانە شـــەقەی بـاڵ و فـڕینە بـۆ شـاخ و داخ، کـاژی شارومار، لەسەر تەنافی دڕکاوی ڕابوردوو هەڵدەخەین، بەکاژی گـوڵاوی چیاودەشـت و کێـو خۆمـان پۆشـتەو پەرداخ دەکەیـن، هەریەکە جانتـایەکی بچـووک لەشـان دەکەیـن: کتێـب، دەفـتەر، قەڵەم، جـام، شـانە و تـاقمی ریشتاشـین جێگەیـان لەناویـا کراوەتەوە. دیسانەوە بەدڵە خورپەو دوودڵی و پەژارەوە، بەرەو بەردەرگای مزگەوتی گەورە هەنگاو دەنێین! سەعات دووی پاش نیـوەڕۆ، ڕۆژتـان بـاش! دەموچـاوی یەکترمـان خوێنـدەوە: خـۆ پاراستن لەبۆسەو تەڵە نانەوە و فریـودان، دەیان گەداو بەلەنگاز و بێـنەوا، دەستەسـڕیان ڕاخسـتووە، لەخـودا دەپـاڕێنەوە، فرمێسکی بەزەیی ڕێبواران دادەدۆشن.

مامۆستا موحسین عەلی ئەکبەر، خەمی دەربازکردن دەستۆ دەگرێـت: لەدەرگـای ڕێکخسـتن دەدات. (کەشـتی نـووح) کەی دەبزوێت و لافاو هەڵدەستێت ئێوارەی ١٩٧٧/١٢/٦ بەهەگبەی پڕ دەنگوبـاس و نوقـڵ و نەبـات گەڕایەوە، پـێش ئەوەی بگـاتە مریشکەڕەشـە: کـات، شـوێن، پەرلە، هێمـای یەکترناسـینەوە و نیشـانەی دڵنیـایی، ڕێـزان و هـاوڕێیەک خـۆی بەنێـوی (جەمـال محەمەد) دەناسـێنێت! ئێمە وامـانزانی (جەمـال) نـاوی نهێنـی ئەو پیـاوەیە، پـاش دوو سـێ سـاڵ (جەمـال دیمـوکرات) لە تـووژەڵە

سـەری دەرهێنـا، لەوێ لێمپرسـی: (نـاوی نهێنیـت (جەمـال دیموکرات)ە، ئەی ناوی راستەقینەکەت چییە ؟).

ئینجا ئەو گوتی: (من هەر ناوی راستەقینەکەم (جەمال)ە و ناوە نهێنیم نییە!).

جەمال، ئەوەندە دڵنیابوو لەرۆیشتن و ملنان و دۆزینەوەی تـوولەڕێ، پێمانوابوو، لایەنی کەم، سەدان جار بەو ڕێگایانەدا هات و چۆی کردووە، رەنگە ئەمە (تەتەر)ی نێوان شارو شاخ بێت، کەچی پاشان بۆی گێڕامەوە، یەکەمین جارە بۆ (سەرزەل) بچێت و ملی ئەو ڕێگایە بگرێت و هەرگیز لەخەونیشدا بەو ناوەدا تێنەپەڕیوە.

ئەم رووداوە سادەیە ئەوە دەردەخات، یەکێکی وەکو جەمال دیموکرات، چەنـد جـوامێرو بـوێرو بە جەرگ بـووە، ئاسـتی ڕێکخسـتنی کـۆمەڵەش لەکـوێ بـووە؟ سـێ کەسـی لاوی بێئەزموون و نە شارەزا رادەستی شمشێرو جەنجاڵی ڕێکەوت و چارەنووسی نادیار بکرین! لەشۆڕشی گەلانی تردا، پێش یەک دوو سەدەش رەنگە کارێکی هاوشێوەی ئەم کارانەی شۆڕشی نوێی کورد نەکرابێت.

جەمال، پیاوێکی قسە خۆش و دەم بە پێکەنین و بـڕوای بەخـۆی بـوو، ئـێمەش ئەوەنـدە بڕوامـان پێیبـوو، کە دەتـوانێ کەشتییەکە لەنـاو دەریـایەکی پـڕ شـەپۆلانەوە، بە سـەلامەتی بگەیێنێتە دوورگەیەکی ئارام.

سـێ قـۆڵی لەمزگەوتـی گەورەوە بەرەو چواربـاخ شـۆڕبووینەوە، لەوێیشـەوە بەلای چەپـی ئاوبـارەدا تێپەڕین، چەمی قلیاسـان ئـاوێکی روون و سـازگاری هەبوو، وەکو ئێستا تـڕی گـریس و نەوتـاو و زێـراب نەبـوو، بوارێکمـان دۆزییەوەو لەچەمی قلیاسان پەڕینەوە. سادق ئەم پرسیارەی لەجەمال کرد:

(مەفرەزەی جاش و قوات خاسە، پاش نیوەڕوان لەم ناوەدا بۆسە نانێنەوە ؟).

جەمال سەیری چەپ و ڕاست و دووری دەکردو گوتی:

(ئەم ناوە هێشتا بۆسە و مەفرەزەی پیاو خراپی تێدا بەدی نەکراوە). بە پەلە لەشار دەرچووین و ماوەی نێوان قەراخ شارو چەمی قلیاسان زۆربوو! لەهەموو دەنگە دەنگێک ورد دەبووینەوە، هەتاوی دوا ڕۆژەکانی پایز، گەرمای خۆی لەدەست نەدابوو، هەستت دەکرد سەرەتای بەهارە.

جەمال گوتی: ((هیچ نابێ، بەڵام ئەگەر بەڕێکەوت تووشی ئەمن و موخابەرات و جاش هاتین، دەڵێین: سەردانی خزمێکمان لەکۆسەی چەم دەکەین. لەم ناوەدا هیچ رووی نەداوە)). ئەو هەر زۆر بڕوای بەخۆی هەبوو، پێدەکەنی و ملی دەناو دوودڵی و شڵەژانی پێوە دیار نەبوو، لەرێزان و شارەزایەک دەچوو، کارو پیشەی تەنیا گەشتی بناری هەزارمێردو بەرانان بوو بێت، ئاسمان هەساو* و هەتاو بە پەلە بوو، ماڵئاوایی لەکۆڵان و گەڕەکەکانی شار بکات.

جەمال لەهەر کوێ گاوانێک، شوانێکی دیتبا، چۆنی و چاکیەکی گەرمی لەگەڵدا دەکردن، ئەو خەڵکەش هەر بەهەستی خۆڕسکی خۆیان، مژدەیەکی دڵخۆشکەرەیان دەداینێ: (ئەم ناوە ئارامە و هیچی لێ نییە).

زەردەپەڕ گەیشتینە(جێشانە))، هەرچەند هەوراز هەڵدەکشاین، تۆزێ پێمان هەڵگرت، لەسەر کەلەوە ئاوڕمان دایەوە، گڵۆپە زەردەکان کزکز دەسووتان و چاوەڕوانی سووڕانەوەی خێرای گەلە گورگەکان بوون.

لەوێوە بۆ ناو (سەرزەل) رەنگە هەر یەک (کم) بێت، سێ قۆڵی داگەڕاین. گوندەکە هەرچەند بچووک بوو، بەڵام دەنگی سەگوەڕێکی زۆر دەهات.

---

* هەساو: ساماڵا: بێ هەور.

# سەرزەل

## (٣)

دەوروبەری سەعات حەوتی ئێوارە گەیشتینە ناو ئاوایی (سەرزەل)ی ناوچەی قەرەداغ، گوندێکی بچووک، کە لەناوەندی شیوێکدا ئۆقرەی گرتووە، پاش و پێشی رەوەزو باسک و لووتکەی رووتەن و چەقەنە، کە باوەشیان بۆ ئاسمانی شین و پڕ لەئەستێرە کردۆتەوە. جەمال، پیاوێکی بە ساڵاچووی بینی و پرسیاری لێکرد: (مامە گیان! پێشمەرگەت لەم ناوە نەبینیوە؟).

پیاوەکە سەرەتا نەچووە ژێر، کە (پ.م) لەگوندەکەدا هەبێت، تا بەرە بەرە دڵنیابوو، ئێمە بێچەکین و نیازی خراپمان نییە و پەیوەندیمان لەگەڵ ئەواندا هەیە. پیاوەکە گوتی: (بڕۆ بۆ مزگەوت! ئەگەر لەوێ بپرسیت و پێشمەرگەی لێبێت، لەرێگەی ئەوانەوە رەنگە هەواڵێکت دەستبکەوێت!).

چووینە مزگەوت، دەیان جووتە کڵاش و پێڵاو لەبەردەرگا کەڵەکە کرابوون، پیاوی ئاوایی لەوێ جڤینیان هەبوو، کەس لەبەردەرگا پاسەوانی نەدەکرد. سێ (پ. م) ی چەکدار، پشتیان بەدیوارەکەوە دابوو، یەک لەدوای یەک، قسەیان بۆ خەڵکەکە دەکرد، جووتیارانیش گوێیان هەڵخستبوو بۆ دوا دەنگوباسی شۆڕش.

ئێمە سڵاومان لێکردن و ئەوانیش بەخێرهاتنیان لێکردین، یەکێک لەو سێ کادرە پێیباش نەبوو، ئێمە لەوێ دانیشین و حەزی دەکرد لەگەڵ یەکێک لەخەڵکی گوندەکە رەوانەیماڵێکمان

بکـات، چـووینه ماڵێـک و (جەمـاڵ دیمـوکرات) نـان و چـای لەگەڵمانـدا خـوارد و گـوتی: (مـن دەبـێ بـڕۆم کـارێکی پێویسـتم هەیە.)

پاشـان بـۆی گێـڕامەوە، دوای جیـابوونەوە لەئـێمە، وێـرای گەیاندنی پۆستی سەرکردایەتی ناوشار (کۆمیتەی هەڵمەت)، هەر بەو شەوە تاریک و ئەمووستەچاوە، بەهەمان ڕێگادا تـا سلێمانی نەوەسـتاوە، ئەمەیە نمـونەیەک لە ڕۆڵە فیـداکارە گومناوەکـانی ئەو سەردەمەی کۆمەڵە.

بەیـانی زوو، بەرچاییمـان کردبـوو، قـنج دانیشـتبووین و چاوەڕوان بووین، پێش تاریک و ڕوون ئاگادارمان دەکەنەوە و دەڕۆین، کەچـی هەتـاویش کەوتبـوو، کەس دەنگی نەبـوو (لەدڵی خۆماندا گوتمان ئەو سێ پ. م ناچـار نەبووبن بڕۆن و ئێمەیان لەگوندێکی نزیک شار جێهێڵابێت.). لەپڕ یەکێک لەو سێ (پ. م)ە بەدواماندا هـات، دوو کـادر، یـان دوو پێشمەرگەکەیتر لەنـاو دێ، لەبەردەم مزگەوتەکەدا چاوەڕوان بوون.

یەکترمـان گـرتەوەو بەرەو گەرووی دۆڵەکە شـۆڕ بـووینەوە ئەوان، هەرسێکیان کلاشینکۆفی بێقۆناخیـان بەشـانەوە بـوو، دوو دوو، دوورو نزیـک دەڕۆیشـتین. لەرێـگە، تۆزێـک لامانـداو لەبـن دەوەنێک پێکەوە دانیشـتین، ئەوەی ڕاسـتی بێت تـا ئێوارەی ئەو ڕۆژە یەکترمـــان نەنانســـییەوە. ســـەرەتا پێموابـــوو: ئەم ســـێ پێشـــمەرگەیە، یـــان ســـێ کـــادرە، تیپـــی پەیوەنـــدین لەنێـــوان سەرکردایەتی و کۆمیتەی شـاری سلێمانی (کۆمیتـەی هـەڵمـەت). کە ئەوانم بینی دڵم زۆر خۆشبوو، کادرەکانی کۆمەڵە لەرووی فیکـری و ڕۆشـنبیرییەوە هێنـدە لەئاسـتێکی بەرزدان و دەتـوانن

لەگفتوگـۆو دانوســتاندا گــوێ بگــرن و بەرســیڤی لــۆجیکی و عەقڵانی پێشکەش بکەن.

ئەوان دەیانویست دەنگوباسی ناو شار بزانن، ئێمە هەر چوار پێنج رستەیەکمان دادەڕشت و بیرمان دەکەوتەوە، نابێ لای سێ کادری سادە، ئەوەی لە بن بەڕەکەیە بخرێتە سەر بەڕە، ئەوان پرسیاریان دەکردو ئێمەیش پێمان دەچەقاند و دەمانگووت: (ئێمە تـا کـاک ئـارام و ســەرکردایەتی نەبینــین، قســەکانی خۆمــان ناکەین!).

یەکێکیان، کە بە (کاک ئەبوبەکر) بانگیان دەکرد، گوتی: (زۆر ئاســاییە! چــاوەڕوان بــن تــا دەگەیــنە لای کــاک ئــارام و سەرکردایەتی، ئینجا قسەکانی خۆتان لای سەرکردایەتی بکەن). ئــێمە گوتمــان: (کەی بــۆ لای ســەرکردایەتی دەڕۆیــن؟). کــاک ئەبــوبەکر گــوتی: (هەوڵــدەدەین بەم زووانە بــۆ لای ئەوان رەوانەتــان بکەیــن!). ئەو چــرکەیە مــن هەر بیــرم لای بــابەتە تیۆرییەکان و گەشەکردنی هێزی پێشمەرگە بوو. ئایا شۆڕش توانیــویەتی لەهەنــدێ شــوێنی دوورەدەســت بارەگــای جێگیــر دابنێت؟).

ئایا دەبێ شێوەی بارەگای سەرکردایەتی چۆن بێت؟ دەبێ بــنکەی ســوور دامەزرێنرابێــت؟ یــان بارەگاکــانی ئــێمەیش لە بارەگاکانی شۆڕشی پێشوو دەچن؟ دەبێ سەرکردایەتی چەند لەم شوێنەوە دووربێت؟

ئەبوبەکر بەژیری خۆی هەستی بەسەر سوورمانی من و سادق کردبوو، ئەو گوتی: (بەگوێرەی بۆچوون و تێگەیشتنی جیڤارا و جیاب و ماوتسی تۆنگ بێت، دامەزراندنی بارەگای

سەرکردایەتی جێگیر، خاڵی هەرە سەرەکی گەشەکردنی شۆڕشە، بەڵام وەزعی ئەمڕۆی ئێمە هەر زۆر جیاوازە، لەهەر کوێ بارەگای جێگیر دابنرێت، پاش چەند سەعاتێک رژێم دەیان هەلیکۆپتەر و سەربازو جاش رەوانەی ئەو شوێنە دەکات، ئێمە ناتوانین شەوێک لەشوێنێک بە ئیسراحەت بمێنینەوە، ئێمە ناچارین هەمیشە لە جووڵانەوەو پەلامار و کشانەوەدا بین و لە هیچ ناوچەیەک بارەگای جێگیر نەکەینەوە).

ئەو دەمە ئاشتی ئاماژەی بۆ فراوان بوونەوەی دارو دەوەنی ناوچەکەیان کرد:

(خەڵکی ئەم ناوچەیە لەسەر دارفرۆشتنو خەڵووز دروستکردن دەژین، ئێمە بۆمان سەلماندن نەمانی دارستان زیانی بۆ ئەوانیش زۆرە، ئیدی ئەوانیش بڕیاریان داوە خزمەتی دارو دەوەن بکەن، نەک لە رەگو ریشەوە هەڵیکەنن).

ئاشتی روونکردنەوەی لەسەر شێوەی خەباتی خۆیان لە ناوچەکە پێشکەش کرد:

(خەڵک سەیری کردەوە و گردار دەکەن نەک تەنیا هەڵڕشتنی دروشمی سیاسی زەردو سوور، بۆنموونە لەگوندی (گوڕباز) کێشەی کەم ئاوی گوندنشینەکانی بێزار کردبوو، کانیی دێکە نزیکەی دوو کیلۆ مەتر لەچەقی گوندەکەوە دوورە، ئێمە پیتاکمان کۆکردەوەو حەوزێکمان لەسەر کانیەکەو حەوزێکیشمان لەناو (گوڕباز) دروست کرد، هەردوو حەوزەکەش بەلوولە پێکەوە گرێدران، گوڕباز ئاوی هەیە و کێشەی ئاو هێنانی رۆژانە لەکۆڵیان بوەوە).

ئەبوبەکر دەیگوت:

(ئـێمە کـارێکی زۆرمـان لەم نـاوچەیە کـردووە، رژێـم هـیچ بەکرێگیراوێکی لەم ناوەدا نییە، دە رۆژ لەم گوندانەدا بمێنینەوە، هـــیچ مەترســـیەک نیـــیە، دەبـــێ رێکخســـتن لەسەرانســـەری کوردستاندا بەهێز بکەین، رێکخستن مێشکەو هێزی پێشمەرگە دەستە.

هێزی پێشمەرگە نـابێ، لەچالاکیو هەڵسوکەوتدا سـەربەخۆ بێت بەڵکو کـارەکەی لەگەڵ رێکخستندا دەبێ هاوئاهەنگ بێت، رێکخســـتنی بەهێزمـــان نەبـــێ نـــاتوانین لەرووی عەســـکەریەوە رووبەڕووی هێزی چەکداری رژێم بوەستین.

خەڵـک دەسـتی سـەربازو جـاش دەگرێـتو دەیهێنێـتە سـەر پێشـــمەرگەکان. ئـێمە ئەگەر لەگەڵ خەڵـــک بـــاش بـــین، کەس دوژمنمـــان نـــاهێنێتە ســـەر، بەپـێچەوانەوە دەســـتمان دەگـــرنو یارمەتیمان دەدەن بۆ لەناوبردنی دوژمن).

مـن لەنێـو کوردانـدا، خەڵکـم زۆر بینیـوە بـایەخو گرنگیـی رێکخســـتنی سیاســـی بـــزانن، بەڵام کەســـم نەبینیـــوە وێـــنەی ئەبـوبەکر بڕوای بەڕێکخســتنی سیاسـی هەبووبێـتو ئەوەنـدەی ئەو بایەخی بە رێکخستن دابێت.

ئەو پێـی وابـوو، رێکخسـتنی ئەو سـەردەمە لەچاو بارودۆخو ئەرکەکانی ئەو قۆناغەدا، لاوازو سستە.

(گەر رێکخستنی بەهێزمان هەبێت، دەتوانین بەغدا بهەژێنن).

# ڕاپەڕینی گەلانی ئێران

## (٥)

ئێمە پێمان باشنەبوو لەسەر ڕێکخستنو کێشەکانی هەرێمی پێشڕەو (بەغدا-خانەقی) بدوێین، هەندێ پرسیاری گشتیم لێیان کرد، ئەوکاتە من هەر زۆر بە زانیاری کۆکردنەوە لەسەر مانگرتنو خۆپیشاندانەکانی شارە جیاجیاکانی ئێران سەرقاڵی بووم، دیاربوو، ئەو سێ کادرە لەڕێگەی (بی.بی.سی BBC)یەوە ئاگاداری دەنگوباسەکان بوون، من گوتم: ( لەکارگە گەورەکانی شارەکانی ئێران مانگرتنو ناڕەزایی دەربڕین دەستی پێکردووەو پەرەدەسێنێ) ئەبوبەکر گوتی: (پێتوایە ئەم شەپۆلی مانگرتنو ناڕەزاییە نانیشێتەوە؟). من گوتم: (چاودێرە سیاسیەکان پێیانوایە گۆڕانێکی چۆنایەتی ڕەچاو دەکرێت: کرێکاران ڕێپێوان دەکەنو ماندەگرنو زانکۆکان چالاکی گەورە دەکەنو ڕۆژ بەڕۆژ شەپۆلی ناڕەزایی قووڵتر دەبێتەوە) ئەبوبەکر گوتی: (ڕژێمی شا گوشارێکی زۆرمان دەخاتەسەر، ئەم ڕژێمە نەمێنێت قازانجی خۆمانە)

ئێمە هەر لەیەکەم دانیشتنی ئەو ڕۆژە، زانیمان ئەم سێ کادرەی کۆمەڵە یەکێکیان ناوی(ئەبو بەکر)ە، دووەم ئاوات قارەمانیو سێیەم ئاشتی چاوشین، کە شێوەی هەر زۆر لەئەڵەمانو فەڕەنسی دەچوو. ئەبوبەکر ئێمەی دەناسی، بەڵام جارێ ئێمە ئەومان نەدەناسی، ئەو گوتی: (ئایا هیچ ناوێکتان بۆ خۆتان هەڵبژاردووە؟). هەردووکمان گوتمان: (نەخێر). ئەو گوتی: (من لایەنگری ئەوەنیم پ. مو کادر ناوی ڕێبازو ڕێناسو

ڕێبوار لەخۆیان بنێن، ئەم ناوانە زەقن و ڕەنگە جووتیارەکان هەر بەناوەکاندا، هەست بکەن، ئێمە خۆمان لەوان جیا دەکەینەوە: بۆ ناو لادێ عەزیزو قادرو حەسەن و برایم ئاساییترن و ئەوان هەست بە نامۆیی ناکەن). لەکاتی خەباتی نهێنیدا ناوم لەخۆم نابوو (پیر شالیار)، یان (برادۆست). بەجوانم نەزانی ئەوە ناوی پێشمەرگایەتیم بێت، لەبەرئەوەی چەند جارێک بۆم باسکرد من هاوڕێی شەهید جەعفەرم، ئەبوبەکر پێشنیازی کرد ناوی (مامۆستا جەعفەر) هەڵبگرم و هەوڵبدەم جێگەکەی ئەو پڕ بکەمەوە، من گوتم: (هیوادارام بتوانم جێگەکەی ئەو پڕ بکەمەوە، هەرچەند دڵنیام جێگەکەی ئەو بە کەس پڕ ناکرێتەوە). سادق ناوی (لەتیف)ی بۆ خۆی هەڵبژارد. ئەو گوتی:(دەتانەوێ لەکوێ کاربکەن و چ بەرپرسیارێتیەک وەربگرن؟). من گوتم: (ڕاستە ئێمە هەردووکمان ئەندامی هەرێمی پێشڕەوین، بەڵام نامانەوێ هیچ بەرپرسیارێتییەک وەربگرین، چونکە هیچ ئەزموونێکی ئەوتۆمان لەشاخ و پێشمەرگایەتیدا نییە، سەرەتا دەمانەوێ وەکو (پ. م) دەستپێبکەین و لەناو ژیانی پێشمەرگایەتیدا خۆمان تاقیبکەینەوەو لەژیانی ناو جووتیاران و لادێ تێبگەین و ئینجا بڕیاری خۆمان بدەین).

# بەرەی نیشتمانی

## (٦)

تـا سـالّی ١٩٧٧ کـوردییەکەم زۆربـاش نەبـوو، لە عیمـاد ئەحمەدو عەلـی شـامار، سـۆرانی (کرمـانجی خـواروو)م باشـتر دەزانـیو ژمـارەیەک چیرۆکو نووسـینی کـوردیم هەبـوو، بەڵام هێشـــتا بـــاش نووســـینەکانی مەســـعوود مـــحەمەدم بـــۆ نەدەخـوێنرایەوەو سـەرم لەکـوردیەکەی هەژارو هـێمنو شـکور مســـتەفا دەرنەدەچـــوو! ئەدەبیـــاتی کۆمەڵەشـــم بە پەلە بـــۆ نەدەخوێنرایەوە، راپۆرتی شـوباتو رۆژنـامەی (ئـاڵای شـۆڕش)م خوێنـدبووەوە، بەڵام ئاسـۆی بۆچـوونی کـاک ئـارامم دەربـارەی بەرەی نیشتمانی لا روون نەبوو.

مـن گـوتم: (ئەگەر کۆمەڵە سـالّی ١٩٧٤ــ ١٩٧٥ هەوڵـی بدایە لەگەڵ پ.د.ک بەســـەرۆکایەتی بـــارزانی بەرەیەکـــی نیشـــتمانی پێکبهێنـایە، باشـتر نەبـوو). ئەبـوبەکر ئەزمـوونی خـۆی هەبـوو، مرۆڤێکی زۆر زیرەکو قسـەزانیش بـوو، یەکسـەر گـوتی: (لەگەڵ کاک شیهابی شێخ نووری ویستمان موقابەلەی ئیدریس بـارزانی بکەین، رێگەیان نەداین سەردانی بکەین، ئیتر پارتی چۆن رێگەی ئەدایـن لەگەڵ ئەوانـدا بەرەیەکـی یەکگرتـوو دروسـت بکەیـن؟) ئەوکـاتەش هەر تێنەگەیشـتم ئەم پیـاوە کێـیە وا لەگەڵ شـیهابی شێخ نوری ویستویەتی سەردانی ئیدریس بـارزانیی بکـات، لەدڵـی خۆمـدا گـوتم رەنـگە کـادرێکی پێشـکەوتووی کـۆمەڵە بێـت و مـن نایناسـم، هەر بەڕاسـتیش وابـوو مـن خەڵکـی زۆر کەمـم لەنـاو (کملک) دەناسی.

# گفتوگۆ

## (٧)

ئەبو بەکر هەروەکو کەسێک زۆر تینووی دەنگوباسی ناو شار بێت، یان بیەوێت ئێمە بدوێنێت، ئەم پرسیارەی رۆتینیەی لێکردین:

(دەنگوباسی ناو شار چییە؟).

من گوتم: (باس باسی سەردانەکەی کاک عەلی عەسکەرییە بۆ بەغداو گفتوگۆی ئەو لەگەڵ حکومەتی بەغدا!).

ئەبو بەکر: (خەڵک مفاوەزاتی پێباشە؟).

گوتم: (کورد پێویستی بە پشووە. پێویستی بەهەناسەدان و هەلێکە ئەو گوشارە قورسەی لەسەر لابچێت!).

ئەبو بەکر: ( پێتوایە رژێم هیچ دەدات؟).

من گوتم: (من بڕوام نییە رژێم هیچ بدات، بەڵام ئێمە هەرچیمان هەبووە لەدەستمان داوە، تەنیا راگەیاندنی گفتوگۆ بەرەسمی پەردیش* بۆ خۆ رێکخستنەوە و خۆ بەهێزکردنەوە دەرەخسێنێت)).

ئەبو بەکر گوتی: (ئەم رژێمە ئەوەش ناکات، خۆی بەسەرکەوتوو دەزانێت، براوەیە، بەهێزە، چۆن دێت پەتی دەربازبوونت بۆ شۆڕدەکاتەوە؟)

گوتم: (ئەگەر سەرکردایەتی دەزانێت، رۆیشتنی کاک عەلی بۆ بەغدا هیچ سوودێکی نییە، ئەی بۆ رەزامەندیان لەسەر ئەوە دەربڕیوە بۆ بەغدا بچێت؟)

---

* پەردیش: مجال: لەشارباژێر بەکاردێت.

سادق گوتی: (ئایا حکومەتی بەغدا دەیەوێت کێشەی گەلی کورد چارەسەر بکات؟)

ئەبوبەکر: (رژێمی بەغدا نە بڕوای بەچارەسەرکردنی کێشەی گەلی کوردو نە پێشوازی لەشاندی شۆڕش بۆ سەلماندنی مافی گەلی کورد دەکات، چونکە ئەو بڕوای بە ماف و چارەسەر نییە، سیاسەتی ئەو توانەوەو نەهێشتنە و پاکتاوی نەژادی پەیڕەوی دەکات).

سادق: (دەنگۆی ناو شارو بازاڕ دوو بەشە: یەکێکیان دەڵێت کاک عەلی عەسکەری بۆ گفتوگۆ لەگەڵ سەدامدا رووی کردۆتە بەغدا، دووەمیان ئەوەیە: عەلی عەسکەری لەگەڵ سەدامدا، رێکەوتووە بە یەکجاری لەبەغدا بمێنێتەوەو جارێکی تر بۆ شاخ نەگەڕێتەوە!)

هەر ئەوکاتە دەزگای هەواڵگری و پڕۆپاگەندەی رژێم دەنگۆی ئەوەیان بە مەبەست بڵاودەکردەوە: گوایە عەلی عەسکەری تەسلیم بۆتەوە، هەر بۆ ئەوەی پشێوی و سەرلێشێوان و دووبەرکی لەریزەکانی شۆڕشدا بنێنەوە..

ئەبوبەکر، قسەکەی لەدەم سادق وەرگرت و بە توندی گوتی: ( شەڵلا خۆی تەسلیم بکاتەوە!).

من قسەی کادرەکە (ئەبوبەکر)م زۆر بەلاوە سەیر بوو، هەرچەند لەرێگەی ئازادی مەلاوە هەندێ دەنگوباسی ناکۆکی و ململانێی نێوان (بزوتنەوە) و (کۆمەڵە)م بیستبوو، بەلام عەلی عەسکەری(تەسلیم) ببایەوە، رووخانی کۆڵەیەک لەکۆڵەکەکانی شۆڕش بوو.

من گوتم: (من بیستوومە کاک عەلی عەسکەری ناو و ناوبانگێکی زۆری هەیە و بەهۆی کاک عەلییەوە جەماوەرێکی زۆر هاتوونەتە ریزەکانی شۆڕشەوە).

ئەبوبەکر وەکو کەسێک ئەوەندەی سەرە دەرزییەک بڕوای بەقسەکانی من نەبێت، هەر یەکسەر گوتی: (ئەو رۆژەی عەلی عەسکەری هاتە دەرەوە، جانتایەکی بەدەستەوە بوو هیچ کەسێکی لەگەڵدا نەبوو، دەیگوت: من بەم جانتایەوە هەر لەکێربڕ دەچم، بە پێکەنینەوە دەیگوت: بڕۆم بۆ دێهاتەکان لەدوورە بمبینن وادەزانن کێربڕ هاتووە).

ئەبوبەکر گوتی: (شێوەی بیرکردنەوەی دەسەڵاتدارانی بەغدا هەر زۆر دواکەوتووە، لەهی ئەم سەردەمە ناچێت. عەبدولڕەحمان عارف، سەرۆک کۆماری ئەوسای عێراق لەرۆژی ٥/ی حوزەیرانی ١٩٦٧ خوتبەیەکی بۆ سوپای عێراق دا: ئەگەر خاکی فەلەستینتان رزگارکرد، داواتان لێدەکەم دارو دەوەن مەشکێنن و کێڵگەکان مەشێوێنن و خانووەکان تێکمەدەن، لۆکاندنی ژنان و کچان ناڕەوایە و نابێ شتی وا رووبدات..تاد).

ئەو هەر بەم قسانەی عارف پێدەکەنی و بە بەڵگەی بێ ئاگایی لەم دونیایە دایدەنا.

# برایماوا
## (٨)

پاش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە، گوندی (برایماوا)مان جێهێشت بەکاوەخۆ ڕوومانکردە دەوەنەکانی بناری شاخ، ژیانی ناو گوندەکە زۆر ئاسایی و هێمن بوو، (ئەبوبەکر) و (ئاوات) لەماڵێک بوون و ئاشتی و سادق و بەندە لەماڵی ناسیاوێکی ئاشتی جێگەی خۆمان کردەوە. ئاشتی لەوێ خۆی پێناساندین کە لێپرسراوی ناوچەی بازیانە و گوتی کاری جەماوەری زۆر بەباشی کراوە، کێشەی ناو گوندەکان، هەر لەڕێگەی خۆیانەوە چارەسەر دەکرێن و ڕێگە نادرێت، کەس پێ خوار دابنێت.

هەر لەگوندەکە دەرچووین، ئەبوبەکر و ئاوات بە یەکتر پێدەکەنین، ئەبو بەکر دەیگوت:

(بەڕاستی میوانداریەکی شاهانەیان کردین).

ئاشتی ڕووی کردە ئەوان و گوتی:

(لەدوێنێوە بەڵێنی دەعوەتی کەڵەشێری کوردیتان پێدراوە، عافیەتان بێت، هەرچەند ئێمەتان ئەفەرۆزکرد)

ئەبوبەکر بەقسەکانی ئاشتی پێدەکەنی و گوتی:

(گرنگ ئەوەیە ئێمە میوانداریی شاهانەی خۆمان خوارد).

ئاوات گوتی: (کەڵەشێرەکەمان بووە هێلکەی کوڵاو).

ئاشتی گوتی: (کابرا قسەکەی خۆی بردۆتە سەر، کەڵەشێر لەهێلکە نییە؟ چەند مانگێک چاوەڕوانتان بکردایە ئەو هێلکانە دەبوونە کەڵەشێر، ئیتر بۆ گلەیی لەبەختی خۆتان دەکەن؟).

ماوەی نیو سەعاتێک دوورکەوتینەوە، سێ کادرەکە حەزیان دەکرد، تۆزێک زیاتر زانیاریان لەسەر چارەنووسی (هەڵۆی سوور) دەست بکەوێت، ئێمەیش مەبەستمان بوو، زانیاری پێویستمان لەسەر ((شۆڕش)) دەستبکەوێت، ئەبوبەکر، هەر لە تاقیکردنەوەی خۆی بۆی دەرکەوتبوو، رژێم لەرووی تەکنیکیەوە، بەتایبەتی تەکنیکی سەربازی، زۆر چۆتە پێشەوە، سوپای عیراقی ١٩٧٧ هەمان سوپای عیراقی ١٩٦١ نییە! هەر بۆ نمونە: کاریگەری هەلیکۆپتەر، بەرامبەر دەستەی چەکداری بچووک بچووک، کە تەنیا چەکی سووکیان پێیە. دەبێ شۆڕش رێکخستنێکی زۆر چڕوپڕ دروست بکات تا بتوانێت باری خۆی بەرامبەر رژێم راست بکاتەوە. رێکخستن، دەتوانێت بە کۆکردنەوەی زانیاری، بەدروستکردنی پردو رایەڵە، چەک و تەقەمەنی و توانای دارایی هێزی (پ. م) بپارێزێت.

باسی رۆژنامە هاتە پێشەوە، لەو ماوەیەدا (ئەیلوولی ١٩٧٧) یەکەم ژمارەی (ئاڵای شۆڕش) بڵاوکرابووەوە. ئەبوبەکر گوتی:

(بڵاوکردنەوەی رۆژنامەی ناوەندی هەر زۆر پێویستە، بەڵام تایپ و رۆنیۆ، یان چاپخانە، کاغەز، مەرەکەب لەکوێ دەپارێزرێت ؟ هێزە چەکدارەکانی رژێم، بە بەردەوامی کێومالّی ناوچە جیاجیاکان دەکەن، لەتێ کاغەز بە کەسێک بگیرێت چی لێ دەکەن! هەر زۆر بەزەحمەت ژمارەی یەکەمی ((ئاڵای شۆڕش)) بڵاوکرایەوە. ئێستا سەرقاڵی ژمارەی دووەمی رۆژنامەکەین).

ئەوەی راستی بێت، من هەر زۆرم بەلاوە سەیر بوو: چۆن سێ کادری کۆمەڵە، بەشێوەیەکی نیمچە - ئاشکرا، نیمچە -

نهێنی، بە چەکی سووک، بەبێ پشت و پەناو پارێزگاری، لەپەنای شاری سلێمانی دەسوورێنەوەو بەرۆژی نیوەڕۆ خۆیان بەدێهاتەکاندا دەکەن؟

من پرسیارەکەم بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ داڕشت:

(ئایا ئێرە لەهێزەکانی رژێمەوە زۆر نزیک نییە ؟).

ئەبوبەکر، خۆی کردبووە دەمڕاستی ئەو دەستەیە:

((راستە ئێرە لەشارەوە نزیکە، ئێمە لەپێناوی بەهێزکردنی رێکخستن، ناتوانین لەدەوروبەری شار زۆر دوور بکەوینەوە، ئەوان بەئاسانی دەتوانن بگەنە لامان، یان ئێمە دەچین بۆ لایان، رێکخستن، ئێمە دەپارێزێت: لەهەر کوێ مەترسییەک هەست پێبکرێت، ئەوان بە باڵی مەلیش بێت ئاگادارمان دەکەنەوە، رێکخستنمان نەبێت، هەر لەگەمییەکی بچووکی شەق و شڕی ناو گەرووی دەریایەکی پڕ شەپۆلان دەچین، بە سەلامەتی بە کەناری هیچ دەریایەک ناگەین)).

هەرچەندە ئەو نە پلە وپایەی خۆی درکاندو نە هێزو پاسەوانی بەدەورەوە بوو، نە کەس پێناسەی دەسەڵات و توانای بۆ کردین، ئێمە هەستمانکرد((ئەبوبەکر)) یەکێکە لەبەرپرسیارە گەورەکانی شۆڕش، بەڵام ئەمە کێیە و پلەو پایەی چییە؟ ئەوە لەدڵی خۆماندا هێشتمانەوە تا لەقسە و باسدا لەیەکتر ئاشکرا دەبین.

من و سادق رەخنە بارانی کارەکانی (کۆمیتەی هەرێمەکان)مان کرد! ئەبوبەکر خۆی تێکنەداو نەیگوت: ئێوە کێن رەخنە لەسەرووی خۆتان دەگرن! بەتەواوی گوێی بۆ شلکردین، ئەو حەزی دەکرد بزانێت چی روویداوە؟ من پێمگوت: ((کوشتنی

بەکرێگیراوێکی وەکو عوسمان محەمەد فایەق، ئەو هەموو زیان و قوربانی و کارەساتەی نەدەهێنا، کە بەسەر کۆمەڵەدا هات! پاشان ئێمە بەروونی داوامان لەجوامێرو سەلام و .. تاد کرد بەزووترین کات بگەنە لای سەرکردایەتی، جارێکیتر بۆ بەغدا نەیەنەوە، چونکە زانیاری زۆر وردمان لابوو، کە حکومەت سەرەداوی دۆزیوەتەوەو لەماوەی مانگێکدا هەر هەموویان دەگیرێن و دەکوژرێن. کەچی سەرکردایەتی پێیوابوو، هەموو جارێ گۆزە بە نەشکاوی لەکانی دەگەڕێتەوە).

ئەبوبەکر هەر زۆر بەگەرمی داکۆکی لە (کۆمیتەی هەرێمەکان) کرد:

((کوشتنی عوسمان محەمەد فایەق، لەسەر ئاستی ناوخۆ و جیهانی دەنگدانەوەیەکی زۆری هەبوو، ئەمە کارێکی سەرکەوتوو بوو، بەڵام ئەمەی ویستیان لە ١٦ی ئاب بیکەن هەڵە بوو، بیرت نەچێت خیانەتی کەسێک لەهەڤاڵەکانی سەلمان و هەڵەکانی رێکخراوی خوێنی شەهیدان، کەمەر شکێن بوون)

سادق گوتی: (لەبری کوشتنی عوسمان محەمەد فایەق، دەتوانرا، دەیان کاری گرینگ ئەنجام بدەین وەکو بانکبڕین و پارە رفاندن، پیتاک کۆکردنەوە و ئەمانە چاکتربوون لەکوشتنی بەکرێگیراوێک، کە ئەو هەموو زیانەی لێبکەوێتەوە).

سادق ویستی ئاماژە بۆ بڕینی بانکێک بکات، کە ئەگەر سەرکەوتوو بوایە دوو ملیۆن دیناری ئەو سەردەمە دەست کۆمەڵە دەکەوت، هەروەها رفاندنی(١٨٠٠٠٠) سەدو هەشتا هەزار دیناری کۆمپانیایەکی ئۆروپی، کە بەئاسانی ئەنجام دەدرا.

ئەبوبەکر گوتی:

(بریــا لایەنــی کەم ئەو ســەدو هەشــتا هەزار دینارەمــان دەستکەوتایە، ئینجا بزانە بەو بڕە پارەیە چۆن گەشـەمان بە شۆڕش دەداو چ هێزێکمان پێ دروست دەکرد؟).

(جەمال دیموکرات) پێش ئەوەی بڕوات سێ پارچە قوماشی زۆر تەنکی رادەستی مـن کـرد، منیش لەنـاو جانتاکەمـا جێگەم کردنەوە، (پاشتر زانیم ئەو سێ پارچە قوماشـە بۆ چاپکردنی رۆژنامە سوودی لێوەرگیراوە) لەو شوێنە پێمگوتن:

(کاک جەمال پێش ئەوەی ماڵئاواییمان لێبکات، پریاسکەیەکی دامێ و گوایە رادەستی (کۆمیتەی هەرێمەکان)ی بکەم.

ئەبوبەکر گوتی:

(رادەستی منی بکە، من دەیگەێنمە ئەوان).

پریاسکەکەم رادەستی ئەبوبەکر کرد، ئەویش لێیوەرگرتم و سـەیرێکی کـردن و هەسـتایە سـەر پێ و پـارچەیەک قوماشـی مـۆری کـاڵ بـوو، بەدەسـتی راسـت چمکێکـی قوماشـەکەی بەرزکردەوەو گوتی:

(ئەمە بۆ پشتێن هەر زۆر چاکە).

قوماشـەکەی بە پشـتیەوە بەسـت، ئەبـوبەکر سـێ پـارچە قوماشەکەی چەند جارێک لەپشتی خۆی ئاڵاند، ئەمەی لەپشتی دەکـردەوەو ئەوەکەی لەپشـتی خـۆی دەئاڵانـد. زۆری نەمـابوو پێیبڵێم: کـاک ئەبـوبەکر ئەم سـێ پارچە قوماشـە، مـن هەر زۆر بەرێک و پێکی رادەستم کردن، تۆ بۆ چرچ و لۆچت کردن و لەخۆڵـت وەردان، خەریـک بـوو بەرە بەرە هەڵـدەچووم، لەم چرکەیەدا ئاشتی بەگوێمدا چپاندی:

(ئەرێ مامۆستا ئەم پیاوەت نەناسی، کە ناوی لەخۆی ناوە ئەبوبەکر؟).

گوتم: (نەخێر قەت لەژیانمدا نەمبینیوە!).

ئاشتی: (ئەمە کاک ئارامە).

من زۆر سەرم لەوە سوورمابوو بۆ لەدوێنێوە خۆی لێمان ئاشکرا نەکرد، یان ئاوات و ئاشتی هەر لەسەرەتاوە، بە ئێمەیان نەناساند؟ ئەوەی راستی بێت، نەدەبا ئەو خۆی لێمان نەبان کردبا و هەق بوو هەر لەسەرەتاوە یەکترمان ناسیبا. ئێمە تۆزێک میلۆدیاو ئاوازی قسەکانی خۆمان گۆڕی، وێڕای ئەوەش بەردەوامبووین لەسەر رەخنەکانی خۆمان و تۆپبارانی بڕیارەکانی سەرکردایەتی.

من گوتم: (ئێوە ئەگەر دەتانزانی شۆڕش ئەوەندە قورسە و ئەوەندە بەربەست و گوشارتان لەسەر کەڵکە دەبوو، بۆ پەلەتان لەهەڵگیرساندنی شۆڕش کرد؟).

ئارام گوتی: (ئێمە بە پەلە نەبووین و بەتەماش نەبووین شەڕی پارتیزانی بەرپا بکەین، بە پێچەوانەوە دەمانویست بە شێنەیی خۆمان ئامادە بکەین و رێکخستن لەشارو لادێ بەهێز بکەین و ژمارەیەک ئەندام و دۆست و لایەنگر پڕ چەک بکەین و پاش ماوەیەکی دوورودرێژ شۆڕش رابگەێنین، کاتێک دڵنیا بین، هەلومەرجی شۆڕش پێگەیشتووە. بەڵام مام جەلال لەسوریاوە کردیە هەڵڵایەک دونیای لێتێکەیاندین، رژێمی بەغداش بەئاگا هاتەوە، بەهەموو هێزێکیەوە کەوتە لێدانمان..).

سـادق گـوتی: (لەنێـوان سـەرکردایەتی دەرەوەو نـاوەوەدا هاوئاهەنگی هەبوایە، دەتوانرا پلانێکی تۆکمە و ورد بۆ کات و شوێنی هەڵگیرساندنی شۆڕش دابنرایە).

ئـارام: (نـامە گـۆڕینەوە هەبـوو، ئەوان لەدۆڵێـک بـوون و ئـێمەیش لەدۆڵێکـی تـر، بەم جـۆرە پەیوەنـدییە ناگوترێـت هاوئـاهەنگی، لەمەودوا دۆخەکە دەگۆڕێـت مـام جەلال گەڕاوەتەوەو بەچاوی خۆی وەزعەکە دەبینێت).

سـادق: (پێتـوایە بەهـاتنەوەی مـام جەلال کێشـەی نێـوان سەرکردایەتی دەرەوەو ناوەوە فراوانتر دەبنەوە، یان بەرتەسکتر دەبنەوە؟).

ئارام: ( بەشێک لەکێشـەکان چارەسـەردەبن و رەنگە کێشـەی نوێ سەرهەڵبدەن).

سـادق: (ئایا کۆمەڵە توانیویەتی کێشـە ناوخۆییەکانی خـۆی چارەسەر بکات؟ ئێمە هەستدەکەین چەندین کێشـەی رێکخستن و پەیوەنـدی نێـوان رێکخسـتنی شـارو شـۆڕش پێویسـتیان بەدەستکاریکردنە).

ئارام پارچە قوماشی دووەمی کردەوەو لەسـەر پشتێنەکەی بەستی بە پشتیەوە و گوتی:

(ئەم پارچە قوماشەش بۆ پشتێن هیچ عەیبی نییە).

ئاشـتی گـوتی: (دەنێـرین بـۆ شـار قوماشـیترمان بـۆ رەوانە بکەن).

ئـارام سـەیری لـوتکەی شـاخەکانی دەکـرد، کە چـاوەڕوانی لەئامێزگرتنی زەردەی خۆراوابوون، دووکەڵی زۆپای دار لەماڵە

تاک و تەراکانەوە، بەرەو ئاسمان هەڵدەکشان، ئەو، وەکو یەکێک بیەوێت راستیەک بدرکێنێت و بە دەنگێکی تۆزێک بەرز گوتی:

(ئـێمە هێزێکـی زۆر بچـووک و کەم ئەزمـوونین و شـەڕمان دژی رژێمـــی بەغـــدا راگەیانـــدووە، رژێمـــی ئێـــران تەنگمـــان پێهەڵـــدەچنێت و پاڵەپەســـتۆمان دەخـــاتە ســـەر. لەگەڵ پـــارتی کۆمۆنیســـتی عیـراق ململانـێ و زۆرانبـازی فیکـری و تونـدمان هەیە. بەرامبەر (بزوتنەوە) و عەلی عەسکەری بەردەوام لەکێشـە و بێـنەو بەرەدایـن، ئـێمە تەنـانەت لەمـام جەلالـیش دان جیـڕ دەکەینەوە، دەتانەوێ چیتر بکەین؟ هەر ئەوەندەمان پێدەکرێت).

# گەڕەزیل
## (٩)

لەنــاو دەوەنە چڕەکــانەوە، بۆســـەمان بــۆ ئــاوابوونی دوا گزنگەکــانی پــێش زەردەی خــۆراواو داهــاتنی تاریــک و لێــڵ نـــابووەوە، بەرە بەرە، بەهەنگـــاوی قـــورس، بەرەو گونـــدی (گەڕەزیل) داگەڕاین، کە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی (برایماوا)وە، ئەم دوو دێیە مـاوەی نیـو سـەعاتێک بە پێیـان لەیەکتـرەوە دوورن گـاگەل و رانەمەڕ، بە بـۆڕە بـۆڕو بـاعە بـاع لەخـوار ئـاواییەوە، خۆیان بە دێکەدا کردو خاوەن مەڕەکانیش بە پیریانەوە چوون، بەبێ پرسـیارو چـاوەڕوانکردنی دابەشـکردن، ئەوان مـاڵی شـێخ مارفیان بۆ ئەو ئێوارەیە هەڵبژارد، هەر پێنجمان لەدیوەخانی ئەو مــاڵە گەورەیە گیرســاینەوە. کەس چــاوەڕوانی لەدەرگــادان و فەرمـوو، فەرمـووی نەکـرد، خـانەخوێ (شـێخ مـارف) لەمـاڵەوە نەبوو، خاوخێزانی لەو سەرەوە بوون و نەیان دەهێشت هەست بکرێت خانە خوێ لەماڵەوە نییە. ئەمان وەکو خـاوەن مـاڵ، لەنـاو دیوەخانـدا جێگەیـان گـرت، دیوەخـانەکە رووتەڵە و ساردوسـڕ نەبـوو، مـافوور و دۆشـەک راخرابـوون و ژمـارەیەک سـەرینی کــوردی زل زل ریزکرابــوون، ئاشــتی بــووە کــوڕە گەورە و سـەماوەری دەمکـرد، ویسـتی زۆپـای دارەکە داگیرسـێنێت، بـووە تەپە دووکەڵ و ئـاگر دووســێ جـار کـوژایەوە، هەرچـی کـرد بێئەنجام بوو، رووەمکردە ئاشتی و گوتم:

(ئـاگر کـردنەوەش ئەزمـوون و لێزانـی دەوێـت، لەوەدەچێـت تاقیکردنەوەیەکی دەوڵەمەندت لەم بوارەدا نەبێت؟)

بەخێرایی، بەشێکی دارەکانم دەرکرد، بڕێک پووش و پەڵاش و وردەداری وشکم لەسەر یەکتر هەڵچنی و ئینجا گوتم:

(هاوڕێ ئاشتی ئێستا ئاگری پێوەنێ دەیگرێت).

پاش نان و چاو گفتوگۆی جۆراوجۆر، لەپڕ سیروان تاڵەبانی هەروەکو پڵنگ خۆی بەژوورا کرد، پیاوێکی بەسامو هەیبەتو سمێڵ رەشو کەڵەگەت، لەناو کلاشینکۆفو مەخزەنو تاقمو دەمانچەو دووربین نوقمبوو، عەلی سەرکەوت یەکێکی تر بوو لەوانەی هەر بە شێوەو دیمەن، خەڵکی سەرسام دەکرد.

ئەو هەر یەکسەر منی ناسیەوە، کە لە ساڵی ١٩٧٤ لەگوندی مەحموود قەجەر (خانەقی) یەکترمان بینیوەو ژمارەیەک بیرەوەریی خۆی بۆ گێڕامەوە.

ئەو رۆژە، بە تەنیا لەبەری نەوتیو تلەزەیتەوە بۆ بەری تیمارو قارەمان و گەڕەزیل پەڕیبووەوە، هەگبەیەک دەنگوباسو نوکتەو قسەی خۆشی شارو لادێی پێبوو. لەشوێنی پەڕینەوەی سەر رێگەی قەرەداخ- سلێمانی، بەڕێکەوت بەسەر کۆمەڵێک سەربازی رژێمی عیراقدا کەوتبوو، هەر زۆر بەگەرمیو حەماسەوە، دەربارەی ئەو هەلە زێڕینە دەدوا: ئەوان ئەو چرکەیە تازە بارو بارەگایان خستبوو، سەرگەرمی دامەزراندنی سەیتەرەیەکی نوێ بوون لەسەر رێگەی سلێمانی- قەرەداخ، نزیک گوندی تلەزەیت. ئەو گوتی: (دەستەیەک سەربازی نەشارەزا، بێ سەنگەرو بێ چادر، لەو ناوەدا بوون، چەند جارێک ویستم تەقەیان لێبکەم، لەبەرئەوەی تەنیابووم، بە باشمنەزانی تەقەیان لێبکەم، ئای خۆزگایە چەند پێشمەرگەیەکی ترم لەگەڵ بوایە، نەماندەهێشت کەسیان دەرباز بن).

ئەو ئێوارەیە، سیروان تاڵەبانی دەیان نوکتەی گێڕایەوە، کە بەشێکیان کاتی بڵاوکردنەوەیان نەهاتوو: ئارام زوو دەهاتە دەستو دانیشتنەکەی بەنوکتەو بەسەرهاتو دەنگوباس دەڕازاندەوە.

ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم، ئەو سەردەمە هێزی پ. م لەهەموو قەرەداغ تەنیا یەک کەرت بوو، کە کاک شەماڵ (شێخ محەمەدی باخ) فەرماندەی ئەو کەرتە بوو، مامۆستا شەماڵ (م. حەمەئەمین پۆڵا) کە شەماڵ چاوشینیشی پێدەگوترا، رابەری سیاسی ئەو کەرتە بوو، رۆستەم کەرکوکی فەرماندەی مەفرەزەی بازیانو (گۆران تلەزەیتی) فەرماندەی مەفرەزەی بەری ناوچەی قەرەداغ بوو، لەسەرانسەری گەرمیاندا، هیچ دەستەیەکی پێشمەرگەی لێنەبوو. دوو سێ جار، دەستەی بچووک بچووک، گەشتی خێرایان تا گۆڕی ئەسپو داربەڕوو کردبوو.

فەرماندە پێشمەرگەییو سیاسیەکان، لەچاو ژمارەی (پ. م) زۆربوون، لەهاوینی ئەو ساڵەدا، لەقازانقایە، لەچرکەیەکی نائاگاییو بەکەمگرتنی دوژمن، پێشمەرگە زیانێکی گەورەیان بەرکەوتبوو، نزیکەی هەشت کادرو پ. م شەهید بوون. تا ئەو کاتەی من گەیشتمە ئەوێ، تاسان و تارمایی کارەساتەکەو کاردانەوەکانی بەرینەدابوون.

سیروان تاڵەبانی پێشنیازی ئەوەی بۆ ئارام کرد، کە ناوچەی گەرمیان، ناوچەیەکی گرنگو فراوانو پڕ لەخەڵکی ئازاو دڵسۆزو پاکوخاوێنە، پێویستە هێزی (پ. م) لەو ناوەدا، دەست بکاتە چالاکی، ئارام پێشنیارەکەی پەسەند کرد، سیروان هەر یەکسەر پێشنیازی ئەوەشی خستە سەر، کە: (( پێویستە (مامۆستا جەعفەر) کە هاوڕێی دێرینمەو یەکتر دەناسینو

خەڵکی ناوچەکەیەو لەزمانی جووتیاران باش دەزانێت، لەگەڵ دەستەکەی ئێمەدا بێت) ئارام لەمنی پرسی: (ئایا تۆ پێت باشە بۆ گەرمیان بڕۆیت؟). من پێمگوت: (هەر لەبەرئەوەی سیروان پێیباشە بۆ گەرمیان پێکەوە بڕۆین، من پێمباش نییە، ئەو بە تەنیا بۆ ئەوێ بڕوات. کێشەی من ئەوەیە حەز ناکەم کاک سادق لەگەڵماندا نەبێت). ئارام ئینجا رووی کردە سیروانو پێیگوت: (دەبێ هەر زۆر ئاگات لەم دوو پیاوە بێت، ئەمانە شتن‌و کادری پێشکەوتووی ئێمەن‌و نابێ دڵیان بشکێنرێت، یان هەڵسوکەوتێک بەرامبەریان بکرێت، هەستیان بریندار بکرێت).

# کوردستانی یان عیراقی؟

## (١٠)

ئەو شەوە تا درەنگانێ دانیشتین، گفتوگۆ لەسەر داروبەرد کرا.

سادق ئەو ئێوارەیە پرسیارێکی  وروژاند:

(ئایا دەبێ شۆڕشەکەمان کوردستانی بێت یان عیراقی؟)

سادق رەخنەیەکی لەسەرکردایەتی کۆمەڵە گرت، سەبارەت بە نەبوونی نووسراوێک بوو لەسەر چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەیی، لەسەرانسەری کوردستاندا و شێوەی رێکخستنی پەیوەندی لەگەڵ هێزە سیاسییەکانی عیراقدا، نەبوونی بەرچاوڕوونی و دیسکۆرس و کۆنسێپتێکی ناسیۆنال، کە بەگوێرەی ئەو تێگەیشتنە، کێشەی نەتەوەیی بۆ هەموو لایەک روون بێت، ئەوەش دەبێتە بنەمای دروستبوونی بەرەیەک لەدۆست و لایەنگرانی ئەو پرۆژەیە.

ئارام گوتی:

(من زۆربەی ئەو نووسینانەم لەسەر چارەسەری کێشەی گەلی کورد خوێندۆتەوە وەکو (کوردو کوردستان)ەکەی د. عەبدولڕەحمان قاسملۆ و د. عەزیز شەریف و ماجد عەبدولڕەزا..تاد.

من لایەنگری ئەوە نیم، بەشێوەیەکی دۆگما و تاک لایەنانە سەیری مەسەلەی چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەیی بکەین: هەڵگرتنی ئاڵای سەربەخۆیی و یەکگرتنەوەی هەموو پارچەکانی تر، یان هەڵگیرساندنی شۆڕش لەشاخەکانی کوردستانەوەو پەرەپێدانی بۆ ئەوەی سەرانسەری عیراق بگرێتەوە. جەختکردن

لەسـەر تـاقە یەک ڕێگـا، ڕەنـگە تووشـی هەڵـدێرو کارەسـاتمان بکات، بۆیە دەبێ بەوریاییەوە، سەیری گەشەکردنی ڕووداوەکان بکەیـن، ئەگەر بینیمـان جـوڵانەوەی جەمـاوەری و شۆڕشـگێڕانە لەناوەڕاسـت و خـوارووی عیـراق تەقیـیەوە، ئەوە ئـێمە وەکـو بەشـێک لەو جـوڵانەوەیە خەبـاتی خۆمـان دەکەیـن، ئەگەر ناوەڕاسـت و خـوارووی عیـراق کـش و مـات و بێـدەنگ بـوو، لەپارچەکـانی تـری کوردسـتان خەبـاتی جەمـاوەری و شۆڕشـگێڕانە تەقیـیەوە، ئەوە دەبـێ لەگەڵ ئەو هێـزانەدا، هاوئاهەنگی بکەین و ببینە بەشێک لەو جوڵانەوە فراوانە.. هتد).

دوو سـێ ڕۆژ پـاش ماڵئـاوایی لە (گەڕەزیـل)، هەر کاتێـک سـادق هەلێکـی دەسـتکەوتبا، قسـەکانی خـۆی و ئـارامی بیردەکەوتەوەو نـا ئومێدی خۆی بەرامبەر تێگەیشتن و ئاسـتی تیۆری ئەو دەردەبڕی! ئەو دەیگوت: (ئاستی تیۆری و شیکاری سیاسیی کاک ئارام زۆر قووڵ نییە!).

((گەلـی کـورد لەگەڵ سـێ پـارچەکەی تـری کوردسـتان گرێبدەین، یان چارەنووسی خۆمان لەگەڵ عەرەبی ناوەڕاسـت و خـوارووی عیـراق گرێبـدەین؟ چـاوەڕوانی، وەکـو کـاک ئـارام دەیەوێـت بیکـاتە سـتراتیجی خـۆی، جـوڵانەوەکە تووشـی سـەر لێشـیوان و پشـێوی و پەرتەوازەیـی دەکـات! هێـزی سیاسـی ناتوانێت لەسەر دووپەت یاری بکات و خۆی ستراتیجی ڕەوونی نەبێت: خۆ ئامـادەکردن بۆ یەکگرتنەوەی نەتەوەیی ستراتیج و پلان و جۆرە هاوپەیمـانێتییەکی دەوێـت، کـارکردن لەگەڵ هێـزە سیاسیەکانی عیراق ستراتیج و پلان و هاوپەیمانی و دروشمێکی جیاوازی دەوێـت و لەگەڵ ئامـانجی نەتەوەییدا یەک نـاگرێتەوە.). سادق لەسەر قسەکانی خۆی و شیکاری تیۆری بەردەوام بوو.

# ماوزەتۆن و ریڤیژینیزم
## (١١)

هەر لە (١٩٧٠/٦/١٠)ە وە تـــا رۆژی (١٩٧٦/١/١)، کـــۆمەڵە بەتەواوی لەبن هەژموونگەریی ئایدیۆلۆژیاو ئەندێشەی ماویزم بـوو، کە رابەرەکەی لەچـین نـاوی (مـاوزەتۆن) و لای خۆشـمان پێمانـدەگوت: (ماوتسـی تۆنـگ). ئەو کەسـەی لەبـن کـاریگەرێتی هەر ئایدیۆلۆژیایەک بێت، هەروەکو دەروێش دوای شـێخەکەی دەکەوێـــت و (حـــاڵ) دەیگرێـــت. کـــاریگەری ئایـــدیۆلۆژیا، لە کاریگەری حەشیشە و تلیاک و مەریوانا دەچێت.

راسـتە بە دەستپێشـــخەری ئـارام، سـتوون و کۆڵەکەکـانی هەژمـوونگەریی ئایـدیۆلۆژیای مـاویزم وردوخـاش بـوون، بەڵام رەنگـدانەوەی ئەم ئایـدیۆلۆژیایە تـا سـەرەتای هەشـتاکانیش درێژەی کێشا.

ئەو رۆژەی سـەرۆک (مـاو) لە ١٩٧٦/٩/٩ کۆچی دوایی کرد، واتە: نـزیکەی ١٠٠ رۆژ پـاش دەسـتپێکردنی شـۆڕش، چـوار کـــادری سیاســـی و پێشـــمەرگەیی لەدەســـتەیەک (پ. م) ی هەورامان، گوێ لە BBC و مۆنتیکارلۆ دەگرن و هەواڵی مردنـی ماو بڵاودەبێتەوە، شێخ عەلی و عەلی شیعە و حامیدی حاجی غـالی و مـحەمەدی حـاجی مەحمـوود یەکەمـین جـار گوێیـان لەمەرگی ماو دەبێت! بریار دەدەن، ئەو نهێنیە بپارێزن بۆ ئەوەی ورەی پێشمەرگەکان هەرەس نەهێنێت.

کاتێک بە هەورازێکی سـەخت و تـوڕدا هەڵـدەگەرێن. حـامی بارەی لێبەرز دەبێتەوە، هاوار دەکات:

(ئای باوکەڕۆ براڕۆ، سەرۆک ماومان رۆ، بەخوا نەمردایە پردی ئاسمانی لەنێوان چین و کوردستان دروست دەکرد، باوکەڕۆ، سەرۆک ماومان رۆ).

یەکەم کاری ئارام ئەوەبوو (ئەندێشەی ماوتسی تۆنگ)ی لەبەیان و بڵاوکراوەکانی کۆمەڵە سڕیەوە، بەڵام خۆی تا دوا چرکەکانی ژیانی نەیتوانی لەبیرکردنەوەو نووسین و شیکاریدا، لەبازنەی کاریگەریتی ئەو ئایدیۆلۆژیایە دەرباز ببێت.

ئەو ئێوارەیە تێبینی ئەوەم کرد، لەدەفتەرێکی ئەستووردا بەروسی سەرنج و تێبینیەکانی خۆی دەنووسێت.

من پرسیارم کرد: (بە چ زمانێک تێبینی و سەرنجەکانت دەنووسیت؟).

ئارام: (من بەروسی هەندێ تێبینی خۆم تۆمار دەکەم).

گوتم: (ماوەیەکی زۆر لەروسیا ژیاویت؟).

ئارام: ( من تەنیا یەک ساڵ لەروسیا ژیاوم).

گوتم: (روسی زمانێکی قورس نییە ؟).

ئارام: (من ژنەکەم روسە و ئەو بڕێک فێری کوردی بووەو منیش هەوڵێکی زۆم دا تا ئەو زمانە فێربووم).

گوتم: (ئەو یەک ساڵەی لەوێ بوویت، پێتوایە سیستێمی سۆڤێت سۆسیالیستیە، یان ریڤیژینستیە (تحریفی) و لادەرە؟).

ئارام: (راستە ئێمە لەم دوورەوە رەخنەمان لەسۆڤێت هەیەو مۆری ریڤیژنیستی و لادەرمان پێوەناون، بەڵام من ئاواتەخوازم ئەگەر ئێمە بتوانین سیستمێکی وەکو سیستێمەکەی ئەوان دابمەزرێنین).

گوتم: (پێتوایە خەڵکی رووس لە بن سێبەری حوکمی پارتی کۆمۆنیستدا بەختەوەرن؟).

ئارام: (سۆڤیت هەموو پێویستیەکانی ژیانی بۆ خەڵک دابینکردووە: ئاو، کارەبا، پەروەردە، زانکۆ، تەندروستی، خانەنشینی... تاد. رەنگە ئەمە لەئاستی رۆژاوادا نەبێت و سەد لەسەد بەدڵی هەمووان نەبێت. خەڵک ژیانیان باشە و کەموکورتییان پێوە دیار نییە. بریا ئێمەیش نیوەی ئەوەی ئەوانمان هەبوایە).

سادق وەکو پاشتر قسەی ناو دڵی خۆی بۆ کردم، پێیوابوو: دەوڵەت و سیستێمی سیاسی شتێکە و ژیوارو چۆنێتی و ئاستی ژیانی خەڵک شتێکیتر. ئەو دەیگوت: پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیت، لەپرنسیپ و بنەماکانی تیۆری مارکسی لایانداوەو کرێکاران لەمۆسکۆ دەسەلاتیان بەدەستەوە نییە.. تاد.

یەکێک لەو باسانەی بۆمگێڕانەوە، گوشاری رژێم بوو بۆ سەر پارتی کۆمۆنیستی عیراق (حشع). گوتم: (ئێستا لەشارەکاندا، رژێم شالاوێکی توندی تیرۆرو تۆقاندنی دژی کۆمۆنیستەکان دەستپێکردووە، ئایا دەبێ هەڵوێستی ئێمە چۆن بێت؟ لەئامێزیان بگرین، یان دەموچاوێکی گرژیان پیشانبدەین؟ من بەراشکاوانە بیرورای خۆم دەڵێم: دەبێ بەهەر نرخێک بووە، بەرەی نێوان رژێمو کۆمۆنیستەکان هەڵبوەشێنینەوەو رژێم لەهێزە سیاسییەکانیتر دابڕین).

ئارام شێوەی بیرکردنەوەی منی پێباشبوو، گوتی (ئێمە پەیوەندیمان لەگەڵ پارتی کۆمۆنیستی عیراق باشە، من دوو نامەم لەرێگەی (حشع)ەوە رەوانەی یەکێتی سۆڤێت کردووەو

داوام لێکـردوون بە سیاسـەتی خۆیـان لەعیراقـدا بچـنەوە). مـن پرسـیارم لێکـرد: (ئایـا سـۆڤیێتیەکان وەڵامیـان نەداوەتەوە) ئەو گـوتی: (ئێمە لەپەیوەندیدا دەبین لەگەڵ ئەواندا، تـا قەنـاعەت بە بۆچوونەکانمـان دەکەن‌و هەڵوێسـتی خۆیـان لەرژێمـی عیـراق دەگۆڕن).

پاشـتر ئەو رازەی درکانـد کە مـاوەی یەک سـاڵی لەسـۆڤیێت بەسـەر بردووە، ئەو خـۆزگەی بەوە دەخواست، لەبری رژێمـی بەعسـی شـۆڤینی فاشـی دواکەوتـوو، رژێمێکـی وەکـو یەکێتـی سۆڤیێتیمان هەبوایە.

# سۆسیالیزم

## (١٢)

ئارام گوتی: (ئێمە بڕوامان بە سیستێمی سۆسیالیزم هەیەو هەرکەسێک بەم ناوەدا تێپەڕێت، دەبێ لەبن ساباتی سۆسیالیزمدا سەری خۆی بقەبڵێنێت. ئاشتی و ئاوات لەقاقای پێکەنینان دا، ئێمە باش تێنەگەیشتین بەڵام زانیمان لەبن کەواو سەڵتەی ئەم پێکەنین و سوعبەتەدا (نوکتە)یەک خۆی مەڵاسداوە.

سادق گوتی: (دیارە ڕێگای دووری سۆسیالیزم کورتکراوە).

ئاشتی گوتی: ( کارەکە هەر زۆر سوک و ئاسان کراوەتەوە).

ئارام گوتی: ( پیاوی سۆسیالیست و مارکسی نابێ پوول و پارەی زۆری هەبێ، ئەگینا حیسابی بۆرجوازی بۆ دەکرێت، هەرکەسێک پارەی زۆری پێبێت دەعوەتێکی قەلی پێدەکەین).

ئاشتی هەر بەپێکەنینەوە گوتی: (ئێوە تازە لەشارەوە هاتوون، دەبێ وەزعی گیرفانتان چۆن بێت).

سادق بەبێ سێ و دوو گوتی:

(من چل دینارم پێیە و قەلێک دەکڕم).

من گوتم: (من تۆزێ زیاترم پێیە و من ئینکارترم).

لەو ڕۆژگارەدا نرخی یەک قەلی کوردیی نایاب بە پێنج دینار بوو!

# هەر هەموومان قۆزین
## (١٣)

سیروان تاڵەبانی سەیری دەموچاوی دانیشتوانی کردو گوتی: (ماشەڵڵا.. ماشەڵڵا.. بەڕاستی کادرەکانی کۆمەڵە زۆر قۆزن).

ئارام هەر زوو قسەکەی لەدەم وەرگرت و گوتی:

(ئەرێ وەڵڵا هەر هەمووومان زۆر قۆزین).

(نەوەڵڵا.. ئەمەیان شمولی تۆ ناکات و مەبەستم تۆ نەبوو).

دانیشـــتوان لە قاقــای پێکەنیانــدا و مــن و ســـادق هەر زۆر هەوڵماندا دڵی ئارام رابگرین و گوتمـان: (ماشـاڵڵا ئەویـش قـۆزە) بەڵام قسەکانی ئێمە هیچ سوودی نەبوو.

جارێکیان پێشمەرگەیەک بەئارام دەڵێت:

(ئەرێ ئێوە بۆ لێرە دانیشتوون و هیچ ناکەن؟).

ئارام دەڵێت: (ئەی چی بکەین ؟).

پێشمەرگەکە دەڵێت: (یەک قەمەم بدەرێ من بۆ شـار دەچـم و لەوێ دوو کلاشینکۆف دەهێنمەوە).

ئەویـش هەر یەکســەر پێـی دەڵێت: ((هـانێ فەرمـوو ئەوە دوو کلاشینکۆف تۆ بڕۆ لەشار یەک قەمەمان بۆ بێنەوە).

## مام جەلال

## (١٤)

سیراون ئەو پرسیارەی لەئارام کرد:

(بەتەمای سەردانی مام جەلال بکەیت ؟).

ئارام: (جارێ لەم ناوە کاروبارمان زۆرە، هەر تۆزێک سەرم سووک بوو، دەمەوێ سەردانێکیان بکەم).

سیراون: (پیر نەبووە؟).

ئارام: (بیستوومە هەروەکو خۆی ماوەتەوە، بەس تۆزێک لاجانگی سپی بووە).

سیروان: ( ئەمە سی ساڵە خەریکی کاری سیاسییە و دەتەوێت تۆزێ لاجانگیشی سپی نەبێت؟).

ئارام: (بیستوومە دەیەوێت یەکێتی بکاتە حزب، یەکێتی نیمچە بەرەیە، دەبێ بکرێتە بەرەیەکی تەواو، نەک حزب!).

سیروان: ( ئەی کاک نەوشیروان لەمەودوا لەگەڵ کۆمەڵەدا دەبێت؟).

ئارام: ( ئەو سەرەتا ماوەیەکی زۆر کورت کۆمەڵە بووە، پاشان هەر زوو کشاوەتە دواوە، ئێستا ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتیە و نازانم بەتەمایە لەگەڵ ئێمەدا کار بکات یان نە؟ ئێمە دەبێ سەرەتا لەگەڵ ئەودا دابنیشین و گوێی لێبگرین و بزانین خۆی بەتەمایە چی بکات ؟).

پەراوێزەکان

*هەساو: سامال، بێهەور، سایەقە

*رەوەز: چین چینە بەردی زلی سەر کێوان.

*چەقەن: زەوی رەقەن، بەرزایـــی پـــڕ لەبەردو رەقەن، کە بەکەڵکی کشتوکاڵ نایەت.

*کملـک: کـۆمەڵەی مارکسـی–لینینـی کوردسـتان ئەندێشـەی ماوتسی تۆنگ.

*پەردیش: مجال.

* لۆکـان: ( لۆکانـدن، لۆکانـدی، لۆکانـدبوویان..) ئەم وشـەیەم لەکەسانی سەدەی نۆزدەیەمی خەڵکی داڵەهـۆ و دەشـتی زەهـاوم بیسـتووە، بەرامـبەر دەسـتدرێژی سێکسـی بەکاردێت، بەعەرەبـی (اغتصـاب) بەئەڵمـانی Vergewaltigung ( عەزە لەنـاو چەم خەجێی لۆکاند) .دیاردەی لۆکاندن دیاردەیەکی نامرۆڤانەیە.

* گۆران حسەین تلەزەیتی

# سیروان
# (١٥)

ئەو نیوەڕۆیە هەر شەشمان پێکەوە لەدیوەخانەکەی ماڵی شێخ مارف نانی نیوەڕۆمان خوارد. دەوروبەری سەعات دووی پاش نیوەڕۆ بوو سیروان زۆر پێداگری لەسەر ئەوە کرد، من و صادق بۆ گەرمیان بڕۆین و سەرپەرشتی رێکخستنەکانی ناو شار و لادێکانیش بکەین. ئارام زۆر جەختی لەسەر ئەوە کرد، کە ئێمە چیمان دەوێت و دەمانەوێت چی بکەین؟ حەزدەکەین لەکوێ کاربکەین!

من گوتم: ((ئێمە هەر پلە و پێگەیەکمان لەناو رێکخستنی شاردا هەبووبێت، ئەوە قۆناخێک بووە لەژیان. پێشمەرگایەتی و رێکخستنی ناو شۆرش زۆر جیاوازە و ئێمە هیچ ئەزمونێکمان نییە و دەمانەوێت لەبنی بنەوە دەستپێبکەین. دەبینە پ. م لەیەکێک لەدەستەکان و دەمانەوێت لەوێوە فێر بین، نەک بەرپرسیارێتیەک وەربگرین و سەرکەوتوو نەبین، ئەوە دەبێتە شکانێکی گەورە..)).

سیروان بە بەردەوامی دەیگوت: ((بۆ گەرمیان دەچین و رێکخستن بەهێز دەکەین. لەوێشەوە رێکخستنی ناوچەکە و ناو شارەکان بەهێز دەکەین.. ئەمانە شارەزایی زمانی جووتیارانن و دەبێ گەرمیان بکەینە ئاگر..)). سێقوڵی ماڵئاواییمان لە هەرسێکیان کرد. گەرەزیلمان جێهێشت، هەر بەسەر رێگای چەورێژدا، کە ئۆتۆمبێل هاتوچۆی بەسەردا دەکات، بەرۆژی نیوەڕۆ بەرەو تیمار ملی رێگامان گرت. لەملەی نێوان هەردوو

دێ شۆڕبووینەوە. لەپڕ لەسەر گردێک پیاوێکمان بینی. سیراون هەر بە چیچکانەوە دانیشت و بەدووربین، لەو کابرایە ورد دەبووەوە.

صادق گوتی: ((هیچ بەدی دەکەیت ؟)).

سیروان: ((ئەوە شوانێکە و لەسەر ئەو گردە وەستاوە..)). من گوتم: ((ئەگەر ئەوە شوانە، ئەی پەزەکانی لەکوێن؟)).

سیروان: (( لەوانەیە بەڕووکاری ئەودیوی گردەکەدا بلەوەڕن!)).

ئێمە هەر هەموو گیانمان بوو بەچاو. یەکێکیان بە خشکەیی، لەپشت دەوەنەکانەوە، دەیەویست پشتمان لێبگرێت، بەلای راستدا دزە بکات، دووانی تر، هەر زۆر لێمانەوە نزیک بوون، دیوی سەرەوەی رێگاکەیان لێگرتین. سەرەتا، سیروان چەکدارەکانی بینی، ژمارەیان کەم بوو، گوتی: ((ئەوە هاوڕێیانی خۆمانن! بەڵام بۆ کەسیان لێناناسمەوە؟)).

ئەو بۆ چرکەیەکیش دووربینەکەی لەسەر چاوی لانەداو ناوە ناوەش قسەیەکی دەکرد: ((نەخێر دیارە ئەمانە ڕاوچین! دەیانەوێت لەبن دەوەنەکان کەروێشک دەرپەڕێنن، بەڵام بۆ تولەوتانجی بەدی ناکەم ؟ بۆ گوێمان لەوەڕین و قووزە قووز نییە؟)).

بەوردی سەیری ناو دارو دەوەن و سەرگردەکانی کرد. بە چیچکانەوە بەدووبین دەیڕوانی. پاش چەند چرکەیەک گوتی:

((ئەمانە هەر یەکجار زۆرن! ئێمە مەفرەزەی وا گەورەمان نییە! بەخوا جاشن، با پەلە بکەین و بچین ئەو یاڵە بگرین..)).

بەچوار قەڵەمباز خۆمان گەیاندە سەر یاڵ، لەوێندەرێ، ئاوڕمان دایەوە، لەبن هەر دەوەنێکەوە تۆپەڵێک چەکدار

قووتبوونەوە. دیارە ویستویانە بچینە بەردەستیان و بواری هەڵاتن و دەربازبوون نەمێنێت. سیروان گوتی:

((لەم گردەوە، بەناو ئەم شیوە پێچاوپێچانەدا دەڕۆین و دووردەکەوینەوە. ئەم دیو بۆ ئەوان نەدیوەو کاتیش عەسرێکی درەنگە، ئەو چەکدارانە، هەر کەسێک بن، ناتوانن دوامان بکەون و بێنە سەرمان.

ئەو، کون بەکونی قەرەداخ و گەرمیان و شارەزووری دەناسی. لەهەر دێیەک چەندین دۆست و هاوڕێ و ناسیاوی هەبوو. ئێمە لەهیچ کوێ لامان نەدا، هەر بە پشتی بەرانانەوە هەڵگەڕاین و بەرەو رێگای سلێمانی ـ قەرەداخ ملمان دەنا.

لەگوندی (سوێراو) ماڵی جووتیارێک ناسیاوی بوو، بە ئاسپایی لەدەرگاکە نزیک بووەوە و بانگی کردن، کابرا هاتە دەرەوەو سیراون هەواڵی ناو دێ و جموجۆڵی ناسروشتیی لێپرسی.

ئەو گوتی: وەزع ئارامە و هیچ لەئارادا نییە! لەسەر رێگای (تلەزەیت) حکومەت سەیتەری داناوە. ئێوە رێگای پشت دێ بگرن و لەدێی(نەوتی) لامەدەن. دەوروبەری نیوەڕۆ چوار پێنج ئۆتۆمبێل جاش بەرەو (تیمار) رۆیشتن..)).

سیراون: ((گەڕانەوە یان هێشتا لەو ناوەن ؟)).

جووتیارەکە: ((پێش خۆرئاوابوون هەر هەموو گەڕانەوە!)).

سیروان: ((ئەی هیچ تەق و تۆق لەگەڵ پێشمەرگە رووینەداوە؟)).

جووتیارەکە: ((لەولای تیمار گوایە چەکداریان بینیوەو هەندێ تەقەکراوە، بەڵام کەس نەکوژراوە!)).

جووتیارەکــە زۆر حــەزی کــرد بچینــە ژوورەوەو نــان و چایــەکمان پێشــکەش بکــات. ئێمــە تــەنیا داوای ئاومــان کــردو سوپاسـی جووتیارەکـەمان کـردو ماڵئـاوایی کـراو درێژەمـان بـە ڕۆیشتن دا. ئەو شەوە پتر لە هەشت سەعات بەردو قوڕو دڕک و داڵمـان شـێلاوە. ڕەنگـە ڕێگاکـە خـۆی ئەوەنـدە دوور نـەبێت، ئەگـەر کەسـێک بەشـاڕێدا بەسـواری ئەسـپ بـڕوات بـەڵام ئێمـە لەترسی بۆسـەو تەڵەو داو، خۆمان لـەئاوەدانی لا دەدا و بەسـەر ئەسـپەڕێ و تووڵـەڕێشـدا نەدەڕۆیشـتین، لاپاڵەکـەمان کردبـووە نیشانە و ئەم دەوەن رادەستی ئەو دەوەنی دەکردین.

ســــەعات دووی شــــەوێ گەیشــــتینە(دووکەرۆ). ســــیروان، ناونیشـان و شـوێنی حەوانـەوەو پاسـەوانی دەستەکانی دەزانـی. ڕەنگە ڕێکەوتنێک لەنێوان هـەردوولادا هـەبووبێت، پاش ئەوەنـدە ڕۆژ لەکوێ یەکتر بگرنەوە.

ژمارەیەک پ. م لـەماڵێکی پـەڕی ئـاوایی چاوەڕێی سیروانیان دەکرد. هـەر ئەوەنـدە فریاکـەوتین دوو سـێ سـەعات چاو گـەرم بکەینەوە. سەعات پێنج بەئاگایان هێنایەوە. بەرچایمان لـەو ماڵـە کـردو ڕوومـانکردە نـاو شـاخ و دەوەنـەکان، تـا نیـوەڕۆ لـەوێ ماینەوە.

ئـەو ڕۆژە ڕۆسـتەم کـەرکوکی و ئـازادی سـەگرمە و ڕزگـار بەکربایەفی و مامۆستا ئەنوەرم ناسی. کابرایەکی خانەقیشم لێرە بینی ناوی عەبدوو (عەبدولخالق غەفوور زەهاوی)بوو پاڵتۆیـەکی درێـژ و تفـەنگێکی غـەدارەی سـەقەتی پێبـوو، وتـی: ((مـن نـاوم سـەلامە!)). ئەمانـە هەریەکـە چیرۆکێـک و داسـتانێکیان هـەبوو. صادق پیاوێکی زۆر کۆمەڵایەتی بوو و حەزی دەکرد یەکە یەکە پێشـمەرگەکان بـدوێنێت. ئـەو ڕۆژە وا ڕێکـەوت لەگـەڵ ئـازادی

سەگرمە لەماڵێک بووین. صادق پێیوابوو: (ئازاد) جووتیارە، یان وەرزێرە، یان کرێکارە. ئەو جامانەیەکی زلی بەسەریەوە بەستبوو، کلاشینکۆفێکی بێقۆناخ و تاقم و دووربین. صادق لای من گوتی: زۆربەی پێشمەرگەکان جووتیارن و ژمارەی خوێندەوار هەر زۆر کەمە.. ئاماژەی بۆ (ئازاد) کردو گوتی: ((ئەم کوڕە هەموو ژیانی بەجووت و دروێنە و مەڕ بەخێوکردن بەسەر بردووە!)). هەر بۆ ئەوەی دەرگای گفتوگۆ لەگەڵ ئازاد بخاتە سەر پشت پێیگوت: ((ئەرێ کاک ئازاد تا پۆلی چەندت خوێندووە ؟)). چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد، ئەو یەکسەر بڵێت: ((خوێندەواریم نییە، من خەڵکی گوندی قەلاسێوکەم و خەریکی جووت و مەڕداری و ماڵ و مناڵ بەخێوکردنم.. تاد)). صادق چاوی ئەبلەق بوو، کاتێک ئازادی سەگرمە گوتی: ((من مەعهەدم تەواو کردووە..)).

ئیدی بە پێکەنینەوە بەمنی گوت: ((سەیری ئەم کلاوجامانەیە بکە! تو خوا لەوە دەچێت یەک تۆز خوێندەواری هەبێت؟ هەر لەکەڕە جاف دەچێت!)).

ئیدی ئەو چەند رۆژەی هەموومان لەقەرەداغ پێکەوە بووین، صادق بەم تێکەوتنە پێدەکەنی و بەپشتا دەکەوت.

مامۆستا ئەنوەر (رەفیق عەبدوڵلا سەبری) پیاوێکی بەڕێز و قورس و گران و کادرێکی چالاک و شارەزا لەکاروباری رێکخستن و خۆ قایمکردن لەدێهات و دەشت و کێو. لەناو شار دەمانچەیەکی دەدەنێ و داوای لێدەکەن کابرایەکی بەکرێگیراو تیرۆر بکات. دەچێتە نێو ماڵی کابراوەو میلی لێ دەهێنێتەوەو پەنجە بە پەلەپیتکەدا دەنێت، کەڵەکە دەکات. دیارە لەبەر ئەوەی دەمانچەکە سەقەت بووە و پێشتریش تاقی نەکراوەتەوە، تەقە

ناکات. بەکرێگیراوەکە پەلاماری مامۆستا ئەنوەر دەدات و دەبێتە لەیەکتردان و زۆرانبازی و ئەندامانی خێزانی کابراش هەریەکە لەلایەکەوە دەیکەنە گەلەکۆمەو مەسەلەی تیرۆرەکە سەرکەوتوو نابێ..

من بە بینینی عەبدوو (سەلام) هەر زۆر بێتاقەت بووم، بەڵام دەرمنەبڕی. ئەو هەر بەتورکمانی قسەی دەکرد. مرۆڤێکی بزێو هارو هاج و کەمتر تێکەڵاوی کەسانی رۆشنبیر و سیاسی و کۆمەڵایەتی دەبوو. برای باقی غەفوور (عبدالباقی غەفوور زەهاوی) بوو، کە لەیاوەرانی نازم گزار بوو، هەر پێکەوەش لەناوبران.

# (١)

کۆمەڵێک پ. م لەئاوایی (حەمەی کەرەم) و (کانی هەنار)بوون. ئێمە بۆ لایان چووین. چەمی دێوانە، ئاوایی حەمەی کەرەم لەشاخی (دەلووجە) جیا دەکاتەوە، شاخێکی بەرزو سەخت، سەرتاپا سەوزی پۆشیوە. کانی هەنارو دەلووجەو قەڵا قایمەز، بەهاران، لەسۆنگەی دارستان و لێرەوارەوە، بەچاو نابینرێن. ئێوارە سیروان و صادق و من لەماڵی شێخ مستەفا بووین. ئەو زۆر رێزی لێگرتین. سیروان گوتی: ((لەم ناوە، لەهەر کوێ لەیەک دابڕاین، یان هەر لێقەومان و رووداوی نەخوازراو بوو، خۆت بگەێنە ماڵی خاڵە شێخ مستەفا. خۆی پێشمەرگەی دێرین و پیاوێکە قوربانی زۆری لەپێناوی کورد داوە. پێنج کوڕی هەیە. پەیوەندیمان لەگەڵ شێخ جەعفەردا هەیە، بە تەمایە پاش چەند مانگێکي تر بێتە ریزی شۆڕشەوە..)).

من هەر زۆر شادو دڵخۆش بووم، کۆمەڵە لەزۆر شوێنی قەرەداخدا، شوێنی بۆ یەکتر دۆزینەوە دیاری کردووە. لەئاوایی ژمارەیەک کادری سیاسی و پێشمەرگەییم ناسی وەکو هەردوو شەماڵ. مامۆستا شەماڵ (حەمەئەمین پۆلا) و شێخ شەماڵ و زۆراب بەردەکەڕی و ئازای شێخ رەئوف (ئامۆزای شاسوار جەلال).. هتد ئازا لەچاو پێشمەرگەکانی تردا، مناڵترو قەڵەوتر بوو. لە هەورازەکەی دەلووجە بینیم بەجێماوە، ئارەقی شین و مۆری دەرداوەو هەناسەی سوار بووە.

گوتم: (( هەورازەکە زۆر سەخت و رژدە پاشا!)).

ئازا(پاشا) گوتی: (( قەڵەوی و سەد عەیب!)).

من گوتم: (( یەک دووجار بکەویتە بۆسەی جاشەوە قەڵەویت نامێنیت!)).

پێشمەرگەکان گوتیان: ((شێخ شەماڵی باخ فەرماندەی کەرتەو مامۆستا شەماڵ رابەر سیاسی کەرتە..)). لەدڵی خۆمدا گوتم: ((ئەی خودا دەبێت ئەم (کەرت) و مەرتە چی بێت ؟ صادق پرسیاری زۆری دەکرد، دەربارەی (تەشکیلات)ی هێزی پ. م. من پێویستیم بە چەند رۆژێک بوو بۆ تێگەیشتن لەپلە و پۆستی ناو هێزی پێشمەرگە. دەسەڵاتی رابەری سیاسی لە رابەری سەربازی زۆرترە. واتە: کادری سیاسی دەسەڵاتی سەرووی کادرە عەسکەریەکان بوو، بەگوێرەی (پەیڕەوی ناوخۆی هێزە چەکدارەکان). صادق گوتی: ((ئەمە یەکێکە لەجیاوازیە گەورەکان لەنێوان ئەم شۆڕشە و شۆڕشی پێشوو..)).

پێشمەرگەیەکی قسە خۆش گوتی: ((سەرەتا دەمانگوت: هەر هەموو یەکسانین، کەس لێپرسراو نییە! هەموو لەکین وەکی یەکین. فەرماندەی دەستەکە بە پێشمەرگەیەکی گوتبا: هەڕە تۆ بۆ سەر ئەو بەرزاییە پاسەوان بەو بە دووربین سەیری دەوروبەری خۆت بکە! پێشمەرگەکە دەیگوت: ئەی خۆت بۆ ناچت؟ ئێمە یەکسانین. ئەمە شۆڕشی پێشوو نییە!)).

رۆژێک جووتیارێک لەپێشمەرگەیەک دەپرسێت: ((ئەرێ برا ! کێ لێپرسراوی ئێوەیە؟)).

پێشمەرگەکە گوتبووی: ((کەس لێپرسراو نییە، ئێمە هەمووومان لێپرسراوین..)).

جووتیارەکە گوتبووی: ((پەز بەبێ شوان نابێ! دەبێ شوانێکتان هەبێت. بەبێ شوان گەلە دوور دەکەوێتەوە..)).

کادرو پێشمەرگەکانی کۆمەڵە لەنێوان فەلسەفەی (یەکسانی) و (دادپەروەری) دەکەونە ناکۆکی و ئاژاوە و سەر لێشێوانەوە. ئەوان نایانەوێت، ئەزموونی رابوردوو دووبارە بکەنەوە، ناشتوانن شتێکی نوێ دابهێنن! لەم قۆناخەدا لەڕووی بیروباوەڕو فەلسەفەی سیاسییەوە زۆر بایەخ بە پەروەردەکرنی پ. م دراوە، بەڵام پێشمەرگەکان توانای وەرگرتنیان کەم بوو. سەرکردایەتیش نەیتوانیبوو کادرو پ. م بەگوێرەی پێویست پەروەردە بکات.

لەسەر پەروەردەکردنی پ. م دەمەوێت تۆزێک بوەستم: کۆمەڵە کۆڵەکەیەکی بنەڕەتیی شەڕی پارتیزانی پشتگوێ خستبوو. دروشمی شۆڕشی نوێ بەرزکرابووەوە، بەڵام بە کردەیی و خۆ رێکخستن و پەروەردە، لەشۆڕشی پێشوو دواکەوتووتر بوو.

پێشمەرگەکان زۆربەی هاوڕێ و ئاشنای مولازم جوامێر بوون. ئەو هەموو رۆژێک بۆ مەشق و راهێنان بردبوونی: (چەک بەکارهێنان، چەک داژەنین، نیشان شکاندن، راکردن، زۆران، شناو، سکەخشکێ، هێرش بردن، کشانەوە.. تاد)). ئەوەی لە کۆلیجی سەربازی فێرببوو، بە پێویستی زانیبوو، پێشمەرگەی نوێ هەر لەیەکەم رۆژەوە بە باشترین شێوەی زانستی سەربازی مەشقیان پێبکرێت. پێشمەرگەکان بۆیان گێڕامەوە، بەراشکاوانە بە جوامێریان گووتوە: ئێمە تاقەتی مەشق و راهێنانمان نییە. ئێمە خۆمان هەموو شتێک دەزانین و پێویستمان بە راکردن و زۆران و سکە خشکە نییە.. تاد.

گۆران تلەزەیتی پیاوێکی لادێی بەهێزبوو، ئەو دەیگوت: ((مولازم جوامێر بەخوا بەڵلایەکبوو بۆ خۆی. بەهەردوو دەست بەرزی دەکردمەوە بۆ سەر تەپڵی سەرو هەروەکو کاڵەک ئەیدام وەزەویا. دوو کیلۆ خورمای دەخواردو پانزە سەعات ئەڕۆیشت. هەر هەمووی مانی پروکاند.. کەس لەگەڵی دەرنەئەچوو..)).

پێشمەرگەکان هەر هەموویان لەمولازم جوامێر یاخیببوون. ئەو یەکێک بووە لەوانەی بڕوای بە نوێگەری لەمەشق و راهێنانی (پ. م) هەبوو. پەیڕەوینەکردنی بنەماکانی مەشق و راهێنانی پ. م زیانێکی گەورەی لەمەسەلەی رزگاری و سەربەخۆیی کوردستان داوەو نەتوانراوە هێزێک دروستبکرێت وەکو (یەپەگە) کە دەتوانێت شەڕی هێزی زۆر گرنگ و ترسناک بکات.

رۆستەم کەرکوکی گوتی: (( کابرایەک رۆژێک بە رێگادا دەڕوات مارێکی زل دەبینێت بەدوایدا دەڕوات، ئەم رادەکات و مار شوێنی دەکەوێت. ئەو هەر رادەکات و مار وازی لێناهێنیت. ئیدی ماندوو دەبێت و بەسەر بەردێکدا دەکەوێت و دەڵێت: ئەی مار فەرموو وەرە بمخۆ! باش ئاوڕدەداتەوە سەیر دەکات پشتێنەکەیەتی! ئێمەیش تا ئەمڕۆ لەم لا بۆ ئەولا رادەکەین و پێمانوایە حکومەت بست بە بست بەدوامانەوەیە، هەر رادەکەین بابێت بمانخوات..)).

دوای قسەکەی رۆستەم کەرکوکی لەسەرووی دێی سێوسێنان، شێخ شەماڵ کۆبوونەوەیەکی بە پێشمەرگەکان کرد، کە چۆن دەبێ هەڵس و کەوت بکەن! بەتایبەتی لەناو دێهاتەکاندا، دەبێ دڵی جووتیارەکان رابگرن و بەزمانی گوڵ و بە

نەرمونیانی لەگەڵیاندا بدوێن. ئینجا بەوردی باسی زوڵموزۆری ڕژێمی کرد، لەراگواستن و وێرانکردنی دێهاتەکان. باسی ژمارەیەک شەڕو پێکدادانی کرد، کە هێزی پ. م سەرکەوتوو بووە. تیشکی خستە سەر شەڕی قازانقایە، کە لە ١٩٧٧/٩/٣ روویدابوو، هەشت کادرو پ. م شەهید کرابوون.. ئەوە برینێکی سەخت بوو، تا ماوەیەکی دوورودرێژ ئەندامانی کۆمەڵە لەناو شارو لەدەرەوەی شاریش پێیەوە دەیانناڵاند!

ئەو زەمانە نەمدەزانی گوندی باخ لەکوێیە، لەشێخ شەماڵم پرسی: ((گوندی باخ لەکوێیە ؟)).

شەماڵ گوتی: (( باخ گوندێکە لای پیرەمەگروون!)).

ئەو زەمانە پێموابوو، پیرەمەگروون وەکو هەورامانە و دۆڵ و شیوەکانی دەیان دێ و شارۆچکە لەئامێز دەگرن، دێی (باخ) دراوسێی(زێوێ)یە!

شەماڵ کادرێکی پێشمەرگەیی ـ سیاسی ـ کۆمەڵایەتی، باڵابەرز، بەڕێزو بەهەیبەت بوو. پیاوێکی زمانپاراو، قسەزان. لەناو پێشمەرگە و خەڵکدا زۆر قورس و گران بوو، دەیتوانی کێشەی سەخت و ئاڵۆز بەچوار قسە چارەسەر بکات.

ئەم نوکتەیەی ئەوم لەبیرماوە: رۆژێکیان پێیگوتم: ((مامۆستا جەعفەر! دەزانی هەموو مامۆستاکان کەرن ؟)).

منیش گوتم: ((ئەی چۆن نازانم یا شێخ!)).

ئەو بەتۆن و ئاوازی بەرسیڤەکەی من، یەکسەر بیری کەوتەوە: منیش مامۆستام و هەق نەبوو ئەم قسەیە بڵێت.

شەماڵ: ((مامۆستا گیان! هەر زۆر داوای لێبوردن دەکەم! تۆ لای من پێشمەرگە و سەرکردەی نەک مامۆستا..)).

من گوتم: ((کاکە شێخ لەمەودوا، لەحوکمی رەها (موتڵەق) خۆت بپارێزی قازانج دەکەیت: لەمەودوا بڵێ:

زۆربەیان..

بەشێکیان..

هەندێکیان..

بەڵام هەر هەموویان و کەسی لێدەرنەکەیت، ئەوە بەهەڵەدا دەچت..)).

ئیدی لەو رۆژەوە هەر منی دەبینی و ناوی (مامۆستا)ی وەبیر بهاتایە لە قاقای پێکەنینی دەدا..

# گۆران تلەزەیتی
# (٢)

یەکێک لەقسە خۆشەکانی ئەو ڕۆژگارە بەسەرهاتێکی گۆران بوو. ئەو ساڵی ١٩٧٦ دەبێتە پێشمەرگە و لەگەڵ مەفرەزە سەرەتاییەکاندا دەست بەچالاکی دەکات، لەبەری قەرەداخدا ڕەنگە یەکەم جووتیار بووبێت، کە هاتبێتە ڕیزەکانی کۆمەڵەوە. ڕژێم باوک و دایک و کەس و کاری دەگرێت. دوای ساڵێک زیندانی بەڕەڵلایان دەکەن و بۆ دێکەی خۆیان دەگەڕێنەوە. گۆران سەردانی دایک و باوکی دەکات و گوێ لەخەم و ئازاری یەکتر دەگرن.

باوکی گۆران دەڵێت: (( ڕۆڵە حسێن من بەرگەی ئەم هەموو زیندان و ئازار و بەدبەختیە ناگرم. بیکە راهی خوا دەست لەپێشمەرگایەتی هەڵبگرە و خۆت تەسلیم بکەرەوە و دەست بەکڵاوەکەی خۆتەوە بگرە..)).

گۆران: ((باوە عەیبە قسەی وا مەکە لای خۆی تۆ مارکسیت..)).

گۆران پێیوابووە، ئەگەر ئەو بڕوای بە مارکسیەت هێنا، ئیدی بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دایک و باوک و کەس و کارەکەیشی دەبنە مارکسی!

ئێواران، کە بەیەکەوە دادەنیشتین، هەریەکە نوکتەیەک یان قسەیەکی خۆشی دەگێڕایەوە. باس هاتە سەر باسی (باوە لای خۆی تۆ مارکسیت چۆن قسەی وا دەکەی ؟)

ئێمە هەر گوێمان لەگفتوگۆکان دەگرت و بەشداریمان لەبیرورِا گۆرِینەوە نەدەکرد: پێشمەرگەیەک گوتی: ((چۆن چۆن: ئەگەر وتمان کۆمەڵە رێکخراوێکی مارکسیە، هەڵەیە؟)).

زۆراب گوتی: ((بابە ناوی کۆمەڵەی ئێمە مارکسی نییە!)).

پێشمەرگەکە: ((ئەی چییە ؟)).

زۆراب بەردەکەرِی: ((نەنە! مارکسی نییە، مارکسی ــ لیلیلیە..)).

سالار جاف گوتی: ((نەخێر وانیە ئەو مارکسی ـ نیلیلیە..)).

زۆراب: ((مارکسی ـ نیلیلی چییە؟ ئێوە هەر لەخۆتانەوە قسە دەکەن. من سەد لەسەد دڵنیام مارکسی ـ لیلیلیە..)).

پێشمەرگەکان بوونە دوو بەشەوە، لەسەر ناوی راستەقینەی کۆمەڵە هەردوولا روویان کردە صادق و سیروان و من و گوتیان:

((تۆ خوا کامەیان راستە مارکسی ـ لیلیلیە، یان مارکسی نیلیلی ؟)). یەکێکی تر لەولاوە دەنگی بەرزکردەوە و گوتی:

((ئەو قاوە قاوە چییە ئێوە لای خۆی هەمووتان ماسکرین!)).

# مچەکوێر
# (٣)

مچەکوێر دێیەکە لەناو خڕێک، دیواری ماڵەکانی بە بەرد هەڵچنراون. ژمارەی بەردی لە (خڕی نێوزەنگی) زیاترە. لەناو مزگەوتەکەیدا، دار توویەکی گەورە، لەدوورەوە ببووە نیشانەی گوندەکە. سیروان لای مزگەوتەکە بۆ لام هات و گوتی:

((پیاوێک لەم دێیە هەیە ناوی حاجی شەریفە و زۆر قسە خۆش و قسە لەڕووە، ئەم ئێوارە من و تۆ و صادق لەماڵی ئەو دەبین..)).

ئەو ئێوارەیە لەوێ بووین. بەڕاستی مرۆڤێکی بەڕێز و قسەزان و پیاوێکی بە ئەزموون بوو.

سیروان لەهەموو دێیەک دەیگوت: ((ئێمە ئەم شۆڕشەمان لەپێناوی هەژار و چەوساوە کردووە. ئێمە هاتووین خزمەتی جووتیاران، کرێکاران و ڕەنجدەران بکەین.. تاد)).

حاجی شەریفیش گوتی:

((کاک سیروان ئێوە ئێستا دە دوانزە پێشمەرگەی داماوی لات و پات و چوار پێنج تفەنگی ژەنگاویتان بە شانەوەیە، هەردەبێ قسەی جوان بکەن و بەڵێنی گەورە بەخەڵک بدەن و خۆتان بەخزمەتکاری جووتیار بزانن. ئێوە ئێستا دەسەڵاتێکی ئەوتۆتان نییە، هەر ئەم کاک سیروانە با دوو سێ هەزار چەکداری بەدواوە بێت، ئینجا بزانە چۆن قسە دەکات ؟)).

سیروان گوتی: ((حاجی شەریف منیش وا دەبم ؟ منیش لەخۆم دەگۆڕێم ؟)).

حاجی شەریف: ((ئەریَ وەڵلا تۆ لەوان خراپتر دەبیت! با دوو سێ هەزار پ. م بەدواتەوە بن، ئینجا دەتبینم. با من بوێرم و بڵێم جەنابی کاک سیروان، سەرووی چاوت برۆی پێوەیە. دەڵێیت: ئەم گەماڵ باوکە، کەرامباوگایە بگرن دوو هەزار جووتە شەقی مزری تێهەڵدەن..)).

سیروان: (( ئەم شۆڕشە جیاوازە.. ئێمە بیروباوەڕمان هەیە!)).

حاجی شەریف: (( ئەوانەی پێش ئێوەیش شۆڕشیان بەرپاکرد، سەرەتا وەکو ئێستای ئێوە قسەیان دەکرد. هەر زۆر نەرمونیان بوون. کاتێک دەسەڵاتیان پەیداکرد. پیاو هەبوو لەپەرێزیاندا بکۆکێت ؟)).

# بەردەباز

## (٤)

هەورە رەشەكان سەريان بەيەكەوە نا، رێژەی شێ و پرزە پرزی باران هەستی پێدەكرا. دەترساين لەو دەشت و كێوە باران دابكات و ببينە ئاو. لەخوار سۆڵەوە بەرەو ناو چەم داگەڕاين. لەدوورەوە لەسيروانم پرسی: ئەو گوندەی رووومان تێكردووە ناوی چييە ؟ ئەو گوتی: (( دێی كەڵۆشە!)).

لەژێلاوە بڕوانيت، كەڵۆش لەهێلانەی داڵێك دەچێت، كە لەسەر لاشانی كاوێك يان تاتە بەڕێك هەڵيچنيبێت. كەڵۆش لەدامێنی چيا، يان لەسەر چەم دروستنەكراوە، لەسەر لاشانی باشووری رۆژهەڵاتی كێوی دەلووجە، لەسەر قوتەيەكی بەرز گيرساوەتەوە.

گەيشتينە سەرچەمی ديوانە. لەدڵی خۆمدا گوتم: ئەگەر رۆژێك لەرۆژان كوردستان ئازادكرا، لەم شوێنەدا هەقە بەربەستێكی بچووك دروستبكرێت و ئاوی چەمی دێوانە تێيدا پەنگبخواتەوە، ديمەنی ئەم ناوە تەڕوبڕتر دەكاتەوە. لەناو چەمەوە بۆ ناو دێ، هەورازو كووڕ بوو. باران دايكرد، سەرەتا بە نمە دەباری و پاشان لە پرزە پرز و نمە نم دەرچوو، بووە لێزمە و رەهێڵە و بەخوڕ دەباری.

مامۆستا شەماڵ چاوشين گوتی:

((ئەم توولە ڕێيە تا ناوچەم دەچێت، با زوو بچينە خوارەوە تا خز نەبووە!)).

سیروان گوتی: (( تۆزێ پێ هەڵبگرین چاکترە، دە دەقیقەی تر بەم شێوەیە ببارێت، ناو دەممان لەهەموو شوێنێکمان وشکتر دەبێت!)).

صادق گوتی: (( مامۆستا ئاگات لەخزان بێت، شوێنێکت بشکێت، نە دکتۆر هەیە، نە دەرزی، نە دەرمان..)).

شەماڵ گوتی: (( ئایا دەزانیت! ئەم بەردانەی لەناو ئاوەکەدا بەڕیز دانراون و ئێمە بەسەریاندا باز دەدەین، چییان پێدەگوترێت ؟)).

من بە سوعبەتەوە گوتم:

(( پێیدەگوترێت: قۆناخی پێش پرد!)).

شەماڵ چاوشین لە قاقای پێکەنیندا و گوتی: (( ئەمە پێیدەڵێن: بەردەباز!)).

مامۆستا شەماڵ چاوشین، پیاوێکی مووزەردی وتووریا بوو. مرۆڤێکی قسەزان و زۆر حەزی لە نوکتە و قسەی خۆش بوو.. شیعری دەنووسی و شارەزاییەکی باشی لەزمانی کوردیدا هەبوو، لەگەڵ مامۆستا جەعفەر عەبدولواحید زۆر شتی هاوبەشیان هەبوو. بەسەر بەردەبازەکاندا پەڕینەوە. بەلێزمە دەباری، پێشمەرگەیەک پاڵتۆیەکی ئەستووری باشی پێبوو بۆ مامۆستا شەماڵی هێنا، بە حیسابی خۆی بۆ ئەوەی شەماڵ تەڕ نەبێت، بەڵام کار لەکارترازبوو، پێنج دەقیقە لەبەر ئەو بارانە بوویتایە، لەتەپڵی سەرتەوە تا پەنجەی پێت دەبوو ئاو. شەماڵ گوتی: (پاش باران کەپەنەک! کاکە بڕۆ خۆت لەبەری بکە با سەرمات نەبێت. دواتر زانیم ئەو هەورازە هی ئەوە نەبوو پاڵتۆت لەبەر بێت.)

دەوروبەری عەسر گەیشتینە ناو دێ کەڵۆش: ژمارەی ماڵەکانی زۆر کەم بوون. هەردوو سێ ماڵێک بوون، (تایەری فەقێ محەمەدو کوڕەکەی و براکەی) کە لەجوامێری و سەربەرزیدا بێوێنە بوون. بە چرکەیەک دابەشیان کردین. سیروان بەبێ چاوەڕوانی هیچ خانە خوێیەک، پێشمانکەوت بۆ ماڵێک لەماڵەکان. باران بەخوڕ دەباری. جلەکانمان شلپەی دەهات. سیروان و شەماڵ و صادق و بەندە بەر ماڵێک کەوتین. ژوورەوە گەرم بوو. کەڵکی دانیشتنمان پێوە نەبوو. سیروان زوو خۆی گۆڕی و لەچاوترووکاندنێکدا جلی وشکی بۆ ئێمەیش هێنا. ئەو ماڵە حەمامیان هەبوو. یەک لەدوای یەک خۆمان شت. ماوەی دوو سەعاتێک هەتاو دەرکەوت. پێشمەرگەکان داوای ڕێگە پێدانیان کرد، بەشێکیان بۆ ماسیگرتن بچن و بەشەکەی تریان گرەویان لەسەر نیشانە شاکاندن کردبوو. زۆپای دار داگیرسابوو، ئێمەیش ئەوەندە داربەڕوومان پێوەنا، سوور سوور بووەوە، نێڵە نێڵی بوو. هەر ریزە چای گەرم دەهێنرا، ئێمەیش فرمان دەکرد. گۆران تلەزەیتی و سالار دەردۆینی(سالار جاف) گرەویان لەسەر جگەرە هەڵگرتن کردبوو.

هەڵس و کەوت و رەفتاری سیروان، لەژووری میوانەوە بۆ ژوورەکانی تر، لەهەڵس و کەوتی میوان نەدەچوو! تەنیا خزمی زۆر نزیک یان خانەخوێ بەو شێوەیە دەجووڵێتەوە. منداڵێکی شەش حەوت ساڵانی شەرمن، بەتاسەوە سەیری سیروانی دەکردو دەگەڕایەوە. شەماڵ بانگی کرد: ((حەمە گیان وەرە!)). حەمەگیان وەرە. ئەو نەهات و پاشەکشەی کرد.

سیروان گوتی: ((ژن و منالەکەم لەئاوایی قۆپی بوون، جاش و سوپا چواردەورەی گوندەکەیان گرتبوو. ماڵ بەماڵیان پشکنیبوو، ئینجا هەموو خەڵکی دێکەیان لەیەک شوێن وەستاندبوو. پێیانگوتبوون: ئێمە دڵنیاین ژنەکەی سیروان و پۆلای کوڕی لەناو ئێوەن! با خۆیان بێنە دەرەوە، ئەگینا هەر هەمووتان دەکوژین. لێپێچینەوەیان لەگەڵ منال بە منال کردبوو. شێوەی دەم و چاو و جلو بەرگی پۆلا جیاواز بووە، پێیان گووتوە: ناوت چییە ؟ گوتویەتی: حەمە! کوڕی کێی ؟ ناوی کابرایەکی هێناوە.. زۆر هەڕەشەیان کردبوو، قسەی زۆر ڕەقیان بە خەڵکەکە گوتبوو، بە خراپترین شێوە تۆقێنرابوون. کەس ورتەی لێوە نەهاتبوو..)).

شەماڵ لەنوکتە گێڕانەوەو قسەی خۆش هونەرمەندبوو. باران تا بەیانی بەلێزمە دەهاتە خوارەوە. شەماڵ گوتی: ((گەنجانی شار ئێستا بیجامەیان لەبەرکردووە و لەبەر تەلەفزیۆن دانیشتوون و شکۆلادەو نەستەلە دەخۆن و شەربەتی پرتەقاڵ دەنۆشن و لەپەنجەرەوە سەیری دەرەوە دەکەن و دەڵێن: ئەمشەو شەوی پێشمەرگەیە و خۆیان بەشاردا دەکەن و حکومەت تەخت دەکەن. شەو شەوی پێشمەرگەیە.. نازانن بەم باران و قوڕو چڵپاوە دێو بەدێوی خۆی دەرناچێت..)).

حەمە تۆزێ دەشەلی. سیروان بانگی کرد:

((حەمەگیان وەرە! حەمەگیان وەرە! ئەو تۆزێ سەیری دەکردو بەخێرایی دەگەڕایەوە..)).

حەمە هەر سەیری دەم و چاوەکانی دەکردو دەیویست شتێکیان لێتێبگات. زۆر سەیری سیروانی دەکرد، یەک وشە لەدەمی نەدەهاتە دەرەوە. سیروان سەرلەنوێ بانگی کردەوە:

((حەمەگیان وەرە! ئەمانە هاوڕێی منن! ئەمانە مامی تۆن! ئەمانە پێشمەرگەن، لەمانە مەترسە!)).

ئێوارە سفرەو خوان رازێنرایەوە، کەڵەشێری سوورکراوە، ماسی، پلاو، شلە و نانی تەنوور.. ئەوەمان بینی وامانزانی کورد رزگاری بووە و ئێمە لەشارین. ئەوکاتە خواردنی لادێ بریتی بوو لە خورما و رۆن، هێلکەی کولاو، ساوەر، ئارد و هێلکە لەناو تەشتێک ئاو و دۆشاو پێکەوە دەکوڵێنرا (ئەو زەمانە پێمان دەگوت: ئیسفەنج).

مامۆستا شەماڵ دەیگوت: ((دیلێژە مەملەکەتە).کۆچەرەکان بەلای (دیلێژە) دا تێدەپەڕن، هەندێک ماڵ دەبینن بەزستان حەمامیان گەرمکردووە و بەشێک لەماڵەکان لەناوەوە بە گەچ، گەچکاری کراون و یەک دوکان لەوێ هەیە، ئیدی دیلێژە لای ئەوان دەبێتە مۆنتیکارلۆ و فلۆرەنس و بەرشەلۆنە.. ئەوان وتویانە (دیلێژە مەملەکەتە قوروان). ((کاک شەماڵ بلا صدگ وین أکو قاعدە مال بنات))*. کوردێک کە کوردی باش نەزانیوەو تازە دەیەوێت ببێتە پێشمەرگە ئەم پرسیارە بە عەرەبی لەمامۆستا شەماڵ دەکات و دەیەوێت بزانێت بنکەی کیژانی شۆڕش لەکوێیە؟

ئەو شەوە لەبەر رووناکی لۆکس، سیروان بەیانێکی (ی. ن. ک) ی بۆ خوێندینەوە کە بەعەرەبی نووسرابوو، مانگی ئەیلوولی ١٩٧٧ بلاوکرابووەوە. واتە: تەنیا دوو مانگ پاش گەڕانەوەی مام جەلال لەشام. لەو بەیانەدا جەخت لەسەر ئەوە کرابووەوە خەبات دەکەین بۆ ئەوەی یەکێتی ببێتە پارتی پێشڕەو. من

---

*بنکەی کیژان لەکوێیە ؟

کاتێک گوێم لەم بڕگەیە بوو، بەهەرسێکیانم گوت: ((ئەم بەیانە چی دەگەیێنێت ؟ دەیەوێت یەکێتی لەنیمچە بەرەوە لەنێوان سێ هێڵی سیاسی، حزبێکی سیاسی بگۆڕێت و هەر سێ باڵەکە لەناو یەک ڕێکخستندا بتوێنێتەوە، نەک یەکێتی لە نیمچە بەرەوە بۆ بەرەیەکی نیشتمانی بگۆڕدرێت.. ئەمە ڕێک پێچەوانەی قسەکانی کاک ئارامە کە پێنج شەش ڕۆژ لەمەوپێش گوێمان لێبوو. لەنووسراوەکانیشدا، جەختی لەسەر ئەوە کردووە، یەکێتی نیمچە بەرەیە، دەبێ بیکەینە بەرە، نەک بیکەینە حزب..)). هەرسێکیان گوتیان ئەم بڕگەیە پێچەوانەی بۆچوونەکانی ئارامە و کێشەی گەورەی لەسەر دروست دەبێت. ئێمە کۆمەڵەین و نامانەوێت کۆمەڵە لەناو یەکێتی دا بتوێتەوە، دەبێت سەربەخۆیی کۆمەڵە بپارێزرێت..

## مەلا ئەحمەدی مەسۆیی

## (٥)

مەلا ئەحمەدی مەسۆیی، یان مەلا ئەحمەدی حەمە ئەمینی خەجێ (١٩٤٣ـ ١٩٧٧). پێش ئەوەی ئێمە بگەینە قەرەداخ ئەو وێڕای حەوت پێشمەرگەیتر لەقازانقایە شەهید کرا. ئێمە بۆ هەر کوێ دەڕۆیشتین یادەوەری و شوێن پەنجە و تارمایی مەلا ئەحمەد بەدی دەکرا. هەر ئەندامێکی کۆمەڵەت دەبینی، یەکسەر دەیگوت: ((من ڕێکخستنی مەلا ئەحمەدی مەسۆییم!)). بەشێک لە پێشمەرگەکانیش دەیانگوت: ((بەهۆی هاندان و ئامۆژگاری و ڕوونکردنەوەکانی مەلا ئەحمەدەوە بڕیارماندا بێینە ڕیزەکانی شۆڕشەوە))..

مەلا صەباری چرچەقەڵا پێیگوتم:

(( یەکەمین جار کە مەلا ئەحمەدی مەسۆیی بۆ گەرمیان هات، پەیوەندی بە من و شێخ عەبدولعەزیزی داربەڕووەوە کرد. مەلا ئەحمەد پێیگوتم: دوو کەسی چالاک و قورس و گران بۆ ناوچەیەک بەسە، فراوانکردنی ڕێکخستن و پەلە پەل پشێوی دروست دەکات.. تاد)). مامۆستا عەلی عەبدوڵلا بۆی گێڕامەوە: (( مەلا ئەحمەد خزمی ئێمەیە و خەڵکی مەسۆیی قەردەاخە. ساڵی ١٩٧٦ هاتۆتە ڕیزەکانی شۆڕشەوە. تۆڕێکی فراوانی لەماوەیەکی کەمدا دروست کردووە. مام تۆفیقی تەپەگەڕووس و حەمەمینی تیلەکۆی قەلەندەر و لالە مارفی میلقاسم و مام باپیری زەرین و شێخ عەبدولعەزیزی داربەڕوو.. تاد. پەیوەندی سیاسی و ڕێکخراوییان لەگەڵ مەلا ئەحمەد دا هەبووە..)).

لەپەلاماری ئەنفالی ساڵی (١٩٨٨)دا:

ـ عەلی و ژنەکەی و چوار منالی ئەنفال دەکرێن.

ـ گەردە کەریمی ژنی و شیرینی کچی بەر شالاوی ئەنفال دەکەون.

# هۆمەر قەلا

## (٦)

هۆمــەر قــەڵا: گونـدێکی بچـووک و پـاک و خـاوێن و دووره دەست بوو. لەسێ وەرزی ساڵدا، سەوزایی دایدەپۆشی. ڕێگای ئۆتۆمبێلی نـەبوو، توولـە ڕێگایـەکی بـەردین، پێپلیکانـەی خودایی، لەبناری (زەردە)وە تا ناو دێ هەڵدەکشێت، لەسـەر لاشـانی شاخ و هەڵـەمووت و بەرزاییـەکانی ڕۆژهـەڵاتی زەردە گیرسـاوەتەوە. هۆمـەر قـەڵاو چرچـە قـەڵا، ئەمدیو و ئـەودیوی شـاخ کـەوتوون. عەشـایەری ئـەو نـاوە دەڵێن: پشـتیان بـە پشـتی یـەکترەوە داوە. چرچەقـەڵا گـەورەتر و ئـاوەدانتر بـوو، سـاڵی ١٩٧٧ شەسـت و پێـنج مـاڵ لـەوێ نیشـتەجێبوون، دێکـە ڕووی کردۆتـە خـۆراوا. هۆمەرقەڵا، لەئامێزی ڕەوەز و تاشەبەردی زل زل خۆی گرمۆڵـە کردووە. چرچەقەڵا لەبناری شاخەکەیە، وەکو هۆمەرقـەڵا بـەرەو ناوەڕاسـتی شـاخ هەڵنەکشـاوە. لـەناو چرچەقـەڵادا دوو کانیـاوی گـەورە هەیـە: یـەکێکیان بـەر مزگـەوت و ماڵـە شـێخان کـەوتووە، ئەوەکەی تر پشکی بەشەکەیتری دانیشتوانی گوندەکەیە. لـەخوار ئاواییش(چەمـــە گـــەورە) هەیـــە، کـــە لای (زەردەلیکـــاو) ەوە هەڵدەقووڵێت و بەوێدا تێدەپـەڕێت و بـەرەو (دەرەدۆیـن) دەڕوات و مەرەزەی لەبەردا دەکرێت.

هۆمەرقەڵا و چرچە قەڵا و قـەڵای تـەپەگـەڕووس، ناوەکانیـان ئامـاژەن بـۆ ئـەوەی، کـە لەسـەردەمانی زۆر کۆنـدا ئـاوەدانی و قـــەڵاو ژیـــاری لـــەبناری (زردە) و(ســـەگرمە) دا هـــەبووە. مـــن لـــە(هۆمەرقـــەڵا)و قـــەڵای (تەپەگـــەڕووس)، پرســـیاری ئـــەوەم

نەکردووە، ئایا جێگای (قەلا) لەدەوروبەری دێدا بەدیدەکرێت!
ئەوکاتە ئێمە بیرمان لای هێرشی رژێم و وەدەستهێنانی پشتیوانی کۆمەلانی خەلک بوو. بەلام بەرێکەوت لەخەلکی چرچەقەلام پرسیوە: ئایا شوێنەواری شوورەو قەلاو ژیاری لەدەوروبەری ئەم گوندەدا هەیە؟ هەموو گوتویانە: بەشێک لەشوورەو دیواری بەرد و قسل تا ئەمڕۆش ماون، هەرچەند پاچ و خاکەنازی دزی ـ شوێنەوار، پێش دەزگا ئەرکیۆلۆژیەکان فریاکەوتن و زۆربەی زۆری شوێنەوارەکانیان تێکداو هەرچییان بەردەست کەوت تالانیان کرد.

شوێنەواری پەیکۆلی* و قەلای (باوەکرۆ) و (دەربەند گەور) لەسەر ئاستی جیهانیش ناسراون. داخی داخانم، دەستی دزانی شوێنەوار زۆر درێژە و مێژووی ولاتەکەی شێواندووە. بوونی ئەم ژمارە زۆرە لە شوێنەوار بەلگەیە لەسەر ئەوەی مرۆڤ لەزۆر کۆنەوە لەم دەڤەرەدا ژیاوەو لەهەر قۆناخێک لەقۆناخەکانی گەشەکردنی مرۆڤایەتیدا شوێندەست و جێگەی ژیان و مانەوەی ئەو مرۆڤانە ماوەو پێویستیان بە زانستکارو پسپۆری بواری ئەرکیۆلۆژی هەیە تیشک بخەنە سەر شوێنەوارە دێرینەکان.

ناسراوترین پیاوی ئەم دێیە (حاجی حەمە سالحی هۆمەرقەلا ١٩٢٧ـ ١٩٩١) بوو. پیاوێکی خوێندەوار، بەئاگا، قسەزان و

* پەیکۆلی: شوێنەوارێکی مێژوویی زۆر گرنگە و لەسەردەمی (نەرسی) کە یەکێک بووە لە شاکانی دەولەتی ساسانی لەسالی (٢٣١ز) دروستکراوە. بەدوو زمان(پارتی و فارسی ناوەڕاست!) لەسەر بەردەکان تێکستێک هەلکەنراوە. بایەخی خۆی هەیە بۆ تێگەیشتنی مێژووی ناوچەکە و دەولەتی ساسانی. کتێبە دوو بەرگیەکەی هێرتسفێلد یەکێکە لەباشترین کارەکان، کە لەسەر ئەم شوێنەوارە بە ئەلەمانی نووسراوە.

دەیزانی چۆن لەگێرەو کێشەی لابەلا خۆی دەرباز بکات! تەمەنی لەساڵی ١٩٧٧ پەنجا ساڵ دەبوو.

دەمەو ئێوارەی ١٩٧٧/١٢/٢٥ گەیشتینە دێی(هۆمەرقەڵا) بە گوێرەی داب و دەستووری دێهاتیتر، لەناو دێ بەسەر ماڵاندا دابەش نەبووین. هەر هەموومان (١٥ پ. م) لە دیوەخانەکەی ئەو پیاوەدا دامەزراین. مام کوێخای زیرەک و بە ئەزموون دەموچاوی سیروانی خوێندەوە: نە بزەیەک، نە چۆنی و چاکی گەرم و نەرێگە درا پ. م بەسەر ماڵاندا دابەش بن. قسەکانی سیروان لەگەڵ ئەودا دۆستانە و (تعارفات)ی ئێرانی نەبوو. لەکۆیە بەو جۆرە گفتوگۆیە دەگوترێت (چەق بەردۆکی). دیارە لەچەقە چەقی بەرد بەیەکدا کێشاندا هاتووە:

سیروان گوتی: ((سەردانی دەربەندیخانت کردووە ؟)).

حاجی حەمە ساڵح: (( بەڵێ قوربان سەردانی دەربەندم کردووە!)).

سیروان: (( سەردانی ئەمنت کرد ؟)).

کوێخا: (( تۆزێک نا ساغ بووم سەرادنی دکتۆرم کرد!)).

سیروان: (( دەنگوباست گەیاندە ئەمن..))، سیروان ئەم قسەیەی کرد، هەروەکو ئەوەی گوێی لەقسەکانی مام کوێخا نەبووبێت!

مام کوێخا: (( من کوێخام! من نوێنەری خەڵکم لای میری و ئەوان داوام بکەن، ناتوانم نەڕۆم.. من ماڵ و منداڵم هەیە و ناتوانم لەحکومەت یاخی ببم! ئەی ئێوە دەمپارێزن، ئەگەر رژێم ویستی بمگرێت؟)).

سیروان: ((کوێخا تۆ کەشیدەت بەستووە! چۆن زانیاری ناڕاست بەمن دەدەیت و داوای کوشتنی خەڵکم لێدەکەیت! تۆ خەریک بوو من بەهەڵەدا بەریت!)).

ئینجا حاجی حەمە ساڵح هەروەکو گوێی لەقسەکانی سیروان نەبووبێت، رووی کردە مامۆستا شەماڵ:

کوێخا: ((مامۆستا شەماڵ! نازانیت پەیوەندی ئەلدۆ مۆرۆ* لەگەڵ پارتی کۆمۆنیستی ئیتاڵیادا گەیشتە کوێ؟ ئەم دیموکرات مەسیحی و ئەوان کۆمۆنیست دەتوانن هاوپەیمانی ببەستن؟)).

مامۆستا شەماڵ: ((با جارێ کێشەی تۆ و کاک سیروان چارەسەر بکەین، ئینجا دێینە سەر ئەلدۆ مۆرۆ!)).

سیروان: (( حاجی تۆ خەریک بوو من تووشی هەڵەیەکی گەورە بکەیت.. ئەمە تاوانە.. تۆ ریشت سپی بووە!)).

کوێخا شیعرێکی سەعدی بەفارسی دەخوێنێتەوە. ئێستا من شیعرەکەم بیر نەماوە، بەڵام ئەو ناوەڕۆکەی بۆ کوردی وەرگێڕا.

حاجی: ((کاک سیروان! تکات لێدەکەم بەچاوی پڕ لەغەزەب سەیرم مەکە! چاوی پڕ لەغەزەب هەرچی جوانی و مەحەبەت هەیە، هەر هەمووی ناشیرین دەکات..)).

سیروان: ((تۆ چیت بەمن وت ؟)).

حاجی: ((کاک سیروان بێ قەزابیت من بەقازانجی شۆڕش قسەم کردووە. من ئامادەم لەپێناوی ئەم شۆڕشە پیرۆزەدا سەرو ماڵم بەخت بکەم..)).

---

* ئەلدۆ مۆرۆ Aldo Moro (١٩١٦ـ ١٩٧٨) دووجار سەرۆک وەزیرانی ئیتالیابوو، ئەندامانی رێکخراوی چەپڕەوی رفاندیان و لەرۆژی ١٩٧٨/٨/٩ کوشتیان....

سیروان: ((تۆ زانیاری ناڕاستت بۆ من هێنا. من لەسەروژێری قسەکانی تۆ لێپێچینەوەم کرد ، ئینجا ڕاستیەکانم بۆ دەرکەوت)).

حاجی: ((کاک سیروان! برا شیرینەکەم! بەتووڕەیی هیچ کێشەیەک چارەسەر ناکرێت. تۆ جارێ چاکەت بخۆرەوە، ئەوسا هەموو شتێکت بۆ ڕوون دەکەمەوە..)).

ڕوودەکاتە مامۆستا شەماڵ:

((مامۆستا شەماڵ گیان! بۆ ڤیلی برانت خەڵاتی نۆبلی ئاشتی پێبەخشرا؟ ئەم پیاوە نایەوێت پەیوەندی نێوان ڕوس و ئەمەریکا تێک بچێت. ئێوەیش دەبێ کێشەی خەڵک بەشێوەیەکی ئاشتیانە چارەسەر بکەن، بە تووڕەیی و بەهەڵچوون زیان بەخۆتان و بە شۆڕش دەگەیێنن! ئێوە چەکتان بۆ خەڵک هەڵگرتووە، یان بۆ ڕاوە سوێسک بۆ ئەم شاخە هاتوون؟)).

سیروان: ((تۆ نەتگوت: ئەمە کابرایەکی جاسوسە و هەر خەریکی خراپەکاریە..)).

حاجی: (( کاک سیروان! من وتم: چاوی لێ سوور بکەنەوەو گوێی با بدەن و ئامۆژگاری بکەن..)).

حاجی حەمە سالح* ڕووی کردە دانیشتوانی دیوەخانەکە و ویستی ئاراستەی (چەقبەردۆکێ)کەی نێوان خۆی و سیروان بۆ( چەلەحانێ) فرە ـ جەمسەر بگۆڕێت.

حاجی بەردەوام بوو لەسەر گوتاری شیرینی خۆی:

---

* حاجی حەمە سالح کوڕی حامیدی فەقێ ڕۆستەم. عەلی وەیس، کە هۆمەر قەڵای ئاوەدانکردۆتەوە، دەبێتە باوکی فەقێ ڕۆستەم. (محەمەدی حەمە ڕەئوف محێدین)ی دانیشتووی سەروچاوە لەهەمان بنەماڵەیە، یان لقێکی ئەو بنەماڵەیەن و سەروچاوەیان ئاوەدانکردۆتەوە.. تاد.

((کادرەکان! پێشمەرگەکان!

ئەی ئێوە بۆ دوو قسە ناکەن.. دەتانەوێ ئەو بە تەنیا قسە بکات.

مامۆستا شەماڵ!

مامۆستا جەعفەر!

مامۆستا لەتیف!

بۆ ئێوە بێدەنگن ؟ بۆ ئێوە قسەی خێر ناکەن؟

سەرەتا کە ئێوە ئەم شۆڕشە پیرۆزەتان هەڵگیرساند و لەهەموو شوێنێک دەتانگوت: ئەم شۆڕشە شۆڕشێکی دیموکراتیە! ئێمە دیموکراتین و دیکتاتۆر نین.. من هەر زۆر شادو بەختەوەر بووم و وتم: خوایە هەزار شوکر، شۆڕشی ئەم جارەمان دیموکراتیە. دیموکراتی ئەوەیە: بڕیار بەدەست تاکە کەسێکەوە نەبێت، بڕیار بە راوێژبێت و بەدەست هەمووانەوە بێت. من لەم دانیشتنەدا ئەوە دەبینم تەنیا کاک سیروان قسە دەکات و ئێوە قڕوقەپ دانیشتوون و دەنگتان لێوە نایەت. ئەمەیە دیموکراسیەکەی ئێوە، یەک کەس قسە بکات و هەڕەشە لە پیاوێکی ریش چەرمگی وەکو من بکات؟ ئەی جیاوازی ئێوە لەگەڵ شۆڕشی پێشوودا چیە ؟ ئێوە دەڵێن: ئەوانەی پێش ئێمە دیموکرات نەبوون بۆیە شۆڕش داڕووخا! ئێوە هەر لەئێستاوە، جارێ چوار پێنج کەسێکن دیموکراتی جێبەجێ ناکەن، ئەی ئەگەر شۆڕش سەرکەوتنی وەدەستهێنا، ئەوکاتە دەبنە دیموکراتی ؟)).

برایەک بۆی گێڕامەوە لەهەشتاکاندا دوو دەستە پ. م و کادری کۆمەڵە و شۆڕشگێڕان رێیان دەکەوێتە هۆمەر قەڵاو حاجی حەمەساڵح دەبینن:

حاجی حەمە سالح دەڵێت: ((من وەکو ئەندامێکی کۆمەڵە پێمباشە لەگەڵ حکومەتی عیراق رێکەوتن بکرێت..)).

کادرەکەی کۆمەڵە تۆزێک توورە دەبێت و دەڵێت:

((تۆ بۆت نییە بەناوی کۆمەڵەوە قسە بکەیت..)).

حاجی بەبێ وەستان و پرس و پرینگانەوە و بەخۆداهاتنەوە یەکسەر لەرووی سیاسیەوە، بەدیوی ئەودیودا بادەداتەوەو دەڵێت:

(( من وەکو ئەندامی شۆڕشگێران پێمباشە لەگەڵ حکومەتی عیراق رێکبکەوین..)).

هەموو کەسێک ئەوەندە بوێرو حازر بەدەست نییە، لەیەک چرکەدا هەڵویستی سیاسی خۆی (١٨٠) دەرەجە بگۆڕێت..

# مەفرەزەی گەرمیان
## (٧)

سالانی ٧٦ و ١٩٧٧ مولازم جوامێر سایەمیر(مولازم هیوا) و مەلا ئەحمەدی مەسۆیی و.. تاد. سەردانی دەڤەری گەرمیانیان کردووەو سەرقاڵی دامەزراندنی تۆڕی ڕێکخستنی کۆمەڵە بوون. سەرەتا ئەم کەسایەتیانە پەیوەندییان بە مەلا ئەحمەدەوە هەبووە (شێخ عەبدولعەزیزی داربەڕوو، شێخ بەهادئەدینی داربەڕوو، مەلا صەباری چرچەقەڵا، حەمەی تەلە (شاهۆ)، نەجم دەرەدۆینی (سالار جاف)، مام ساڵحی گۆڕپێئەسپ.. تاد) پاش شەهید بوونی مەلا ئەحمەد من لیستی ناوی ڕێکخستنی گەرمیانم لەمامۆستا ئەنوەر وەرگرت. هەر کەسێکم دەبینی دەیگوت: ((من ماوەیەکە پەیوەندیم لەگەڵ مەلا ئەحمەددا هەیە)).. بەڵام نە مولازم جوامێرو نە مەلا ئەحمەد دەستەی (پ. م)ی تایبەت بە گەرمیانیان دروست نەکردووە، کە بە بەردەوامی لەوێ بمێننەوە و چالاکی بکەن.

دەستەکەی ئێمە هەر هەموویان گەرمیانی بوون. راستە جارجار لەبناری شارەزوور و قەرەداخیش چالاکیمان هەبوو، بەڵام ناوەندی کارو خەباتمان دەشتی گەرمیان بوو. دەستەکە پێش ١٩٧٧/١٢/٢٧ دروستبوو، لەم رۆژەدا، ئەوانەی لە (پەیکوڵی) هاتنە ئەمدیو بریتی بوون لەمانەی خوارەوە، کە بەتەمابووین بە هێجگاری لەگەرمیان بمێنینەوە و تەنیا بۆ هاوئاهەنگی بۆ دیوی قەرەداخ بگەڕێنەوە:

١. سیروان: فەیسەڵ ڕەشید شێخ حەمیدی تاڵەبانی ـ فەرماندەی پێشمەرگەیی دەستەکە ـ فەرمانبەر ـ کەرکوک.
٢. هەژار: حسێن ڕەحیم ـ جووتیار ـ قەڵای تەپەگەڕووس ـ جێگری فەرماندەی پێشمەرگەیی دەستەکە.
٣. دلێر: حەمە جان حەمە سەعید مەحموود ـ جووتیار ـ قەڵای تەپەگەڕووس.
٤. نەریمان: صەبار حاجی تەقی ـ جووتیار ـ قەڵای تەپەگەڕووس.
٥. ڕزگار: حەمە ئەمین شێخ ساڵح مەعرووف ـ جووتیار ـ بەکر بایەف.
٦. فریاد گەرمیانی.
٧. حەمید گەرمیانی.
٨. مامۆستا لەتیف: صادق شەریف ـ ئەندازیار ـ خانەقی.
٩. مامۆستا جەعفەر: فازیل کەریم ئەحمەد ـ مامۆستا ـ خانەقی.

# سەروچاوە
# (٨)

دێی سەروچاوە:دێیەکی دە پانزە ماڵی بوو: لەرۆژاواوە دراوسێی ژمارە یەکی هۆمەر قەڵایە.

نەوەکانی (عەلی وەیس) ئەم گوندەیان ئاوەدانکردۆتەوە. ئێرەش دێیەکیتری بناری زەردەیە، لەچاو هۆمەر قەڵاو چرچە قەڵا پیدەشت و تەختاییە. ئەمە ئەگەر لەگەرمیانەوە بەسەر ملەی پەیکوڵیدا تێپەڕیت، ئێرە دەروازەی قەرەداخە، ڕەنگە لەزەمانی زۆر کۆنیشدا یەکێک بووبێت لەشارێکانی (مەداین)ی پایتەختی دەوڵەتی ساسانی و پاشان بەغداو کاروان بەرەو ئێران و باکوری کوردستان بێرەدا تێپەڕیوە.

ئێوارەی ١٩٧٧/١٢/٢٦ صادق و سالار دەرەدۆینی و بەندە، پێکەوە لەماڵێک دامەزراین. من لەسالارم پرسی: ((دەرەدۆین ئەکەوێتە کوێوە ؟)).

سالار: ((لێرەوە دوور نییە. لەملەی پەیکوڵییەوە شۆر دەبیتەوە بەدیوی چەپ دا یەکەم گوند (بەرکەل)ە. دەرەدۆین دەکەوێتە نێوان بەرکەل و بانیخێڵان. ئەم دێهاتانە دەکەونە باشووری شاخی گوڵانەوە)).

سالار* یەکێک بوو لەوانەی هەر زۆر بەزەحمەت لەشەڕی قازانقایە ١٩٧٧/٩/٣ بەرێکەوت دەرباز ببوو. پیاوێکی سوور و سپی، گیانێکی پتەوی هەبوو، هەر لەجەستەی وەرزشکارو زۆرانباز دەچوو. مرۆڤێکی چاونەترس و بوێر و پەیوەندی

---

* سالار: نەجم حاجی حەمە سالح حسێن سوارە (دەرەدۆینی)

لەگەڵ هاوڕێکانی دۆستانە بوو. ((لەناو حەوزو ئاوەکەی مزگەوتی قازانقایەدا خۆمان دەشت و سەروڕیشمان دەتاشی و جلە تەڕەکانمان لەسەر دارو بەرد هەڵخستبوو. ئاگامان لەهیچ نەبوو. شەڕەئاومان دەکرد. جاشەکان گەمارۆیان داین. ئەوان لە بەرزایی بوون و ئێمە لەبەر دەستیاندا بووین. پاسەوانەکەمان (عەزیز) بەرۆژی نیوەڕۆ لەشیرینی خەودا گیرابوو. هەر یەکسەر بەدەسترێژ دایاندوورین. فریا نەکەوتم خۆم لەبەر بکەم. تاقمەکەم لەسەر گۆشت بەست، کلاشینکۆفەکەم بەدەستەوە گرت. چوومە سەنگەرەوە، فیشەک لەهەر چوار لاوە وەکو تەرزە دەباری.)) سالار زۆربەی کات خەمبار دەهاتە بەرچاو، بیری دەڕۆیشت و کەم قسەی دەکرد، هەرچەند دەیزانی بەجوانی بیروڕای خۆی دابڕێژێت. صادق پرسیارێکی داخراوی لێکرد، بەلام ئەو پرسیارە، دەرگای خستە سەرپشت، چەند گرێیەک لەگرێ شاراوەکانی ناو قوولایی دەروونی ئەو بکرێتەوە:

((کاک سالار! لەکەیەوە لەدەرەوەیت ؟)).

سالار گوتی: (( حەمەی تەلە (شاهۆ) پیش دەستپێکردنەوەی شۆڕش لەدەرەوە بوو، شۆڕشی خۆی ڕاگەیاند! ئەو ساڵی ١٩٧٤ لەدەرەوە بوو، هەرەس روویدا و چەک دانرا، شاهۆ گوتی: من ناتوانم چەک دابنێم و بەشاخی زەردەوە دەمێنمەوە... ئێمە پەیوەندیمان بەیەکەوە هەبوو..)).

صادق: ((ئەی تۆ و شاهۆ پێکەوە لەشاخ بوون ؟)).

سالار: (( شاهۆ پورزامە، ئەو ساڵی ١٩٧٤ پێشمەرگە بوو، من لەناو ڕێکخستنی (پ. د. ک) ئەندام بووم و پشتیوانیم لەشۆڕش کردووە. من نەمتوانی وەکو شاهۆ بکەم. ئەو رەبەنە،

من چوار کوڕو کچێکم هەیە و زەحمەتە خێزانێک رادەستی چارەنووسێکی نادیار بکرێت!)).

صادق پتر تووشی سەر سوورمان هات، چۆن کەسێک دێتە ریزی شۆڕشەوە پێشتر پێشینەیەکی سیاسیی قووڵی نەبێت..

ئەو گوتی: ((تۆ پەیوەندیت بە رێکخستنی کۆمەڵەوە نەبوو ؟)).

سالار: ((لەگەڵ شاهۆدا پەیوەندیم هەبوو، یارمەتیشم دەدا.. چەند جارێک مەلا ئەحمەدی مەسۆیم بینی و ئەویش قەناعەتی بە شاهۆ کرد بێتە ریزی شۆڕشەوە. نەک بەتەنیا بەشاخەوە بێت..)).

صادق: ((پەیوەندیت بە مەلا ئەحمەدەوە هەبووبێت، کەواتە: پەیوەندیت بە کۆمەڵەوە هەبووە!)).

سالار: ((ئەوە راستە، بەڵام من کێشەیەکی گەورەم هەیە، خوێنێک بۆ ناو خوێنێکیتر رادەکێشێت! بڕوا ناکەم ئەمە هەروا بوەستێت..)).

صادق: ((من تێنەگەیشتم کاک سالار! تووشی کێشەی خوێن هاتووی؟)).

سالار: ((چەند ساڵێک لەمەوپێش باوکم بەدەستی بن ئامۆزایەکی خۆی، بەناهەق و لەسەر هیچ خوێنی رژێنرا. بکوژەکە و کەسوکارەکەی کێشەی گەورەیان بۆ نامەوە..)).

من گوتم: ((خوێنی ناو ماڵ، لەخوێنی نامۆ زۆر سەختترە..)).

سالار: ((من سەرەتای ئەمساڵ هاتمە ریزی شۆڕشەوە. شۆڕش بەڵێنی لێوەرگرتم بەدوای خوێنی باوکمدا نەڕۆم و بە چەکی شۆڕش نابێ تۆڵە بسێنرێتەوە. دەبێ هەموو چەکەکان

رووبەڕووی رژێمی بەغدا بکرێنەوە نەک لوولەی تفەنگەکان روویان لەیەک بێت..)).

صادق: ((خوێنبەست ئەمڕۆ بکرێت لە سبەی چاکترە..)).

سالار: ((چەند مانگێک لەمەوپێش بکوژی باوکم، لەلایەن کەسێکی نەناسراوەوە کوژرا. کەسوکارەکەی یەکسەر تاوانەکەیان خستە ئەستۆی من!)).

صادق: (( نازانرێت کێ کارەکەی ئەنجامداوە ؟)).

سالار: (( من سوێند دەخۆم بەخوای گەورە من نەبووم و ئاگام لێی نییە! بەڵام کێ بڕوا بە من دەکات؟ من چەکم بەشانەوەیە و وەکو هەڵۆ بەئاسمانی (زەردە) و(گولان)ەوە دەسووڕێمەوە. خوێنی بکوژی باوکم رژاوە*. بکوژی بکوژەکەی باوکم نەناسراوەو کەس نازانێت کێیە و بۆ ئەنجامی داوە؟ بن ئامۆزاکانی باوکم، بە بێ لێکدانەوەو شیکاری، تاوانەکەیان خستوتە ئەستۆی من. من نیم و من بەڵێنم بە شۆڕش داوە، دوای ئاگری تۆڵە سەندنەوە نەکەوم، بەڵام کێ بڕوام پێ دەکات؟)).

* ئەم بنەماڵەیە (١٠) کەسیان لەیەکتر کوشتووە.

# شەوكوت

## (٩)

شەوی ١٩٧٧/١٢/٢٦ لەسەروچاوەماینەوە، هەرچەند ئەم دێیە زۆر لەدەربەندیخانەوە دوور نییە. شاخی گولان لەرۆژاواوە بەسەر دەربەندیخاندا دەڕوانێت. سەروچاوە چەند شەقاوێک لەگولانەوە دوورە.

دیوەخانێک ئێمەی کۆکردەوە. دیوەخانێکی چوارگۆشەی گەورە، دیوارەکانی گەچکاری کرابوون، دوو پەنجەرەی چێوەدار بەسەر رۆژهەڵاتدا دەیڕوانی، چوارچێوەکانیان بەرەنگی شینی ئاسمانی رەنگکرابوون. صادق و من لەگۆشەی باشووری رۆژاوا دانیشتبووین و صادق لەگەڵ (دلێر)** گفتوگۆی دەکرد:

صادق: ((ئەریّ دلێر تۆ بۆ مفاوەزات لەگەڵ رژێمی بەغدا بە باش دەزانیت ؟)).

دلێر: ((هەر بۆ ئەوەی لەپێشی جێب دابنیشم و بوتڵێک پیبسی کۆلا وە سەرەوە بنێم و تەپ و دووکەڵ لەکونە لووتمەوە دەربچێت..)).

ئەو شەوە صادق هەر بەقسەکانی دلێر پێدەکەنی. چونکە چاوەڕوانی ئەو وەڵامە نەبوو.. گەلێک دەست بداتە چەک و هەزاران قوربانی بدات و ئەمەش کرۆکی داواکاریەکانی بێت..

صادق: ((پێموابوو دەڵێیت: گفتوگۆ باشە بۆ ئەوەی شۆرش خۆی رێکبخاتەوە، چەک پەیدا بکات، گوشار لەسەر خۆی کەمبکاتەوە.. بەڵام بۆ پیبسی کۆلا خواردنەوەو لەپێشی

---

** دلێر حەمەجان ـ خەڵکی قەڵای تەپەگەڕووس بوو.

ئۆتۆمبێل دانیشتن، ئەوە نەمرم پێبسی کۆلات بۆ دەکڕم و لەپێشی جێبیش دابنیشە..)).

سەلام دەمی لوولەی تفەنگەکەی دەکردە پێشمەرگەکان. من و صادق، سەرەتا، لەسۆنگەی قسە خۆشەکانی دلێر ئاگامان لە بەشی ئەوبەری دیوەخانەکە نەمابوو. صادق بڕێک لەو کارە پەست بوو. گوتی:

((سەلام ئەمە کاریکی جوان نییە! رووی تفەنگ مەکەرە ئەو خەڵکە! لەناو عەشایەر ئەمە بەعەیبە دادەنرێت.. تۆ کابرایەکی شاریت و داب و نەریتی لادێ نازانیت!))

پێشمەرگەکان هەر هەموویان رەخنەیان لێگرت و ئەو کارەیان پێناخۆش بوو.

(سەلام) لەبری ئەوەی رەخنە لەخۆی بگرێت و شەرم بیگرێت.. سەرلەنوێ لوولەی تفەنگەکەی کردە ئەو پێشمەرگانە و دەستی بەخێرایی بە پەلەپیتکەی تفەنگەکەدا دەنا. من ناچار بووم بەدەنگێکی بەرز بڵێم:

((سەلام رێزی خۆت بگریت باشترە. ئەم پێشمەرگانە ئەم جۆرە سوعبەتەیان پێناخۆشە. غەدارە میلیش نەهێنیتەوە فیشەکی هەمیشە لەبەرە. دەی ئەو چەکە لادە تا کارەساتێکی ناخۆش رووی نەداوە..)).

ئەو چوار مەشقی دانیشت و پێشمەرگەکان بێدەنگ بوون.

ئەم چرکەیە سیروان هاتە ژوورەوە و گوتی:

((ئێمە بۆ گەرمیان دەچین! ئەمە یەکەم مەفرەزەی پێشمەرگەیە، کە روودەکاتە ئەم ناوچەیە. پێشتر چەند جارێک دەستەی پێشمەرگە، سەریان لەپاژێکی ئەم دەڤەرە داوەو گەڕاونەتەوەو لەوێ نەماونەتەوە. ئەم ناوچەیە ناوچەیەکی زۆر

بەر فراوانە، سەدان ئاوایی لێیە و زۆر دڵسۆز و کورد پەروەرن، لەزۆربەی دێهاتەکاندا فێرگە و ناوەندی تەندروستی لێ نییە! رژێم گەرمیانی پشتگوێ خستووەو دەیەوێت ئەم ناوچەیە بشێوێنێت و چۆڵی بکات. تۆری جەردەو رێگرو شەوکوتی دروستکردووە. شەوانە دەستە دەستە دەچنە سەر دێهاتەکان و تەقە لەو خەڵکە هەژارو داماوە دەکەن بۆ ئەوەی دێهاتەکان چۆڵ بکرێن.

ئەمڕۆ پێشمەرگەکان یەکێک لەشەوکوتەکانیان گرتووەو ناوی حسێنە! ئەم حسێنە ژنی رووتکردۆتەوەو سوکایەتی پێیان کردووە.

شۆڕش دەبێ دەسەڵاتی خۆی بسەپێنێت و گەرمیان لەدزو* رێگرو** جەردەو*** شەوکوت**** پاکبکاتەوە.. یەکەمین هەنگاوی ئێمە لەناوبردنی باندی دزو جەردەو شەوکوتە. پاشان ئێمە دەتوانیین بڕوای کۆمەڵانی خەڵک وەدەستبهێنین. تا گەرمیان پاک نەکرێتەوە لەم باندانە، ناتوانین بیر لەشۆڕش بکەینەوە، چونکە دێهاتەکان کۆچ دەکەن و ناوچەکە چۆڵ دەبێت..)).

---

* دز: کەسێکە، بەنهێنیماڵی خەڵکی تر دەبات و ناهێڵێت بناسرێتەوە.

** رێگر: کەسێکە یان چەند کەسێک بەچەکەوە دەچنە سەر رێگەی کاروان و هات و چۆی خەڵک، بە مەبەستی رووتکردنەوە و دەست بەسەراگرتنی ماڵی ئەو خەڵکە.

*** جەردە: رێگر یان کەسانێکن دەچنە سەر ماڵی خەڵک و بەگوندەیی و بە زۆرەملێ تالانی موڵک و ماڵی خەڵک دەکەن و رەنگە بیانکوژن، ئەمانە گوندەیی و بێباکی خۆیان بەئاشکرا دەنوێنن و بەشاراوەیی کارەکانیان ناکەن.

**** شەوکوت: بەشەو دەچنە سەر ماڵی خەڵک و تالانی دەکەن و بۆ کوشتن و دارکاری دەستکراوەن..

# پەیکوڵی

## (١٠)

پەیکوڵی: شوێنەوارێکە وەکو سەکۆیەکی گەورەیە و دەقێک بەدوو زمانی (پارثی و فارسی ناوەڕاست) لەسەر بەردەکانی نووسراوە، دەکەوێتە نێوان هەردوو شاخی (زەردە) و(گولان) سەرووی گوندی (بەرکەل) ە. ئیدمۆندز، کە ماوەیەک راوێژکاری وەزارەتی ناوخۆی عیراق بووەو لەسەر کوردیش کتێبێکی نووسیوە، پاژێکی کتێبەکەی نێوی (پەیکوڵی)یە و بۆ ئەم شوێنەوارە تەرخانکراوە..

ملەی پەیکوڵی هەر نیو سەعاتێک بە پێ لە (سەروچاوە)وە دوور دەبێت. لەسەردەمانی پێشوودا شوورەیەکی مەزن لەنێوان(گەرمیان) و (کوێستان)دا بەرزکراوەتەوەو لەسەر ملەی پەیکوڵی دەرگایەک هەبووەو خاڵێکی پاسەوانی پۆلیسی(جەندرمە) دانراوە. لەسەردەمی عوسمانیدا رەوەندەکان، لەکاتی گەرمیان و کوێستاندا، رێگەیان پێدراوە بەم دەرگایەدا هاتوچۆ بکەن و باج و سەرانەیان لێوەرگیراوە. شوێنەواری ئەم شوورەیە تا ئەمڕۆش هەر ماوە، بەدەستی چەپدا، بەرەو (گولان) و بەلای راستیش دا بەرەو (زەردە) دەڕوات.

رۆژی ١٩٧٧/١٢/٢٧ بەیانی زوو لەدێی (سەروچاوە) دەرچووین، بەرەو ملەی پەیکوڵی کەوتینە ڕێ. ئەمە دەروازەی گەرمیان و رێگای کۆنی کاروان و لەشکرکێشی بووە. لێرەوە شاری دەربەندیخان بەئاسانی دەبینرێت. مۆڵگای سوپای عیراق

بەڕوونی جیا دەکریتەوە: تانک و تۆپ و ئۆتۆمبێلی سەربازی و چادری سپی ریزکراون، هەریەکە لەجێگەی خۆی .

سیروان گوتی: ((ئەمە هەمووی دەشتی گەرمیانە: هەمووی هەردەڵان و توون و شیوی پێچاوپێچە، شوێنی شەڕی پارتیزانی و دامەزراندنی رێکخستنی جەماوەرییە..)).

ملەی پەیکوڵی بەسەر شوێنەوارێکی دێریندا دەڕوانێت، کە لەسەکۆیەکی گەورە دەچوو، بەشێک لەبەردە داتاشراوەکان دارمابوون بۆ چواردەوری سەکۆکە و پەزدارەکان بۆ خوێدانی مەڕەکانیان بەکاریان دەهێنا.

((ئەمە کەلاوەیە، یان شوێنەوارێکی کۆنە ؟)).

سیروان گوتی: (( ئەمە شوێنەوارێکی زۆر کۆنە و نووسینێکی زۆر لەسەر بەردەکان هەڵکەنراون و لەناو خەڵکدا بە شوێنەواری پەیکوڵی ناسراوە..)).

سیروان ئاوڕیدایەوەو قسەکانی پچڕاند:

لەو سەرەوە:

دوو پ. م کابرایەکیان چنگ لەسەرشان دابووە بەر. سیروان گوتی:

((ئەمە حسێنە و لای ئێمە زیندانیە!))).

ئەوە یەکەمین جار بوو ئەم جۆرە زیندانیکردنە ببینم. بۆ هەر کوێ دەڕۆیشتین ئەم پیاوەشمان لەگەڵدابوو.

پێش نیوەڕۆ گەیشتینە گوندی بەرکەل. دێیەکی ئاوەدان، بەسەر شیوێکی قووڵدا دەڕوانێت. بەسەر چەندماڵێکدا دابەشکراین. سیروان، صادق، بەندەو حسێن لەدیوەخانی ماڵێک جێگامان بۆ کرایەوە. سیروان گوتی: (( بۆ یەک دوو سەعاتێک تا دێیەکی ئەم نزیکانە دەڕۆین و ئێوە لێرە بمێننەوەو ئێرە

جێمـەهێڵن.. ئاگاتـان لەحسـێن بێـت، هـەوڵـی راکـردن نـەدات! جووڵایەوە بەمەبەستی راکردن، بەر گوللەی بدەن..)).

ئـەو رۆیشـت و ئێمـەیش لـەو ماڵـە ماینـەوەو خـەریکی چـا خواردنـەوە بـووین. نیـو سـەعاتی پـێ نـەچوو، دوو چەکـداری نەناسراو خۆیان بەژووردا کرد. هەر هاتنە ژوورەوەو باوەشیان پێداکردین و بووە دەستمۆچان و چاکی و چۆنی:

یەکـەم گـوتی: (مـن حەمـەی حـاجی سـابیرم و کـادری شارەزوورم. ئەمیش کاکە حەمە نەگرەییە..)).

منـیش گـوتم: ((مـن مامۆسـتا جەعفـەرم و ئـەویش مامۆسـتا لەتیفە و ئەویش حسێنە، لەسەر رێگری و شەوکوتی زیندانیە..)).

هەردووکیان بەقسەکانم زۆر پێکەنین:

حەمـەی حـاجی سـابیر: (( بـەخوا زۆر جوانـە، دوو مامۆسـتا کاری پاسەوانی زیندانیان پێسپێردراوە..)).

حەمە نەگرەیی لەحسێنی پرسی: ((تۆ خەڵکی کوێیت ؟)).

حسێن: ((من دزی و رێگری و پیاو خراپیم نەکردووە..)).

حەمە نەگرەیی: ((دزو پیاو خراپ دەستی ئێمە بکەوێت بواری هەناسـەدانی نـادەین! نـاوی تـەواوی خـۆتم پـێ بڵـێ و خـەڵکی کوێیت؟)).

حسێن ناوونیشانی خۆی پێشکەش کرد.

حەمـە نـەگرەیی گـوتی: ((کـاری ناشـیرین لەمـەودوا مەکـە و گـوێم لێبێـت هـەڵاتووی، یـان دووبـارە خـەریکی رێگـری و شەوکوتیت، لەبن زەویش دەتدۆزمەوەو.. دەزانی من کێم و ناوم چییە؟)).

حسێن: ((بـەڵێ قوربـان! دەزانـم تـۆ کێیت و حـەدم چییە پیاو خراپی بکەم!)).

حەمە نەگرەیی پیاوێکی ئازای هەڵکەوتوو بوو. هەموو گیانی جموجۆڵ و گورجوگۆڵی بوو. پیاوێکی بە هەیبەت و بوێرو کوڕی رۆژی تەنگانە و ناوەڕاستی شەڕگە و پەلاماری دوژمنان بوو. لەرێکردن و هەڵمەت و پەلاماردا لەپڵنگ دەچوو. دیمەنێکی سەیری هەبوو، کە لەهیچ پێشمەرگە و سەرکردەیەکدا نەمبینیبوو..

دەنگی تەقە بەرزبۆوە و شەڕ بەخەستی دەستیپێکرد. هەر بیست و هەشت پێشمەرگەکەی شارەزوور کۆبوونەوەو بەرەو ئاقاری تەقەکە بەڕاکردن رۆیشتن. دوو سێ پ. م لەناو دێکەدا بوون گوتیان: ((دەبێ لەناو دێ دەربچین! رەنگە هەلیکۆپتەر هەڵبسێت و بیەوێت لێرە سەرباز دابەزێنیت و پشتی پێشمەرگە بگرێت)).

ئەوان سەرگردێکیان گرت. بە ئێمەیشیان گوت:

((ئێوە بڕۆن بۆ لای شوێنەوارەکە و ئاگامان لەیەک دەبێت و حسێن لەگەڵ خۆتان بەرن!)).

لای سەکۆ بەناوبانگەکەی (نەرسی) دانیشتین، تانک بناری گولانی تۆپباران دەکرد. تۆپەکان سەریان دەکرد و لەنزیک پەیکولی تەپ و تۆزیان بەرز دەکردەوە.

حسێن بەدەنگێکی پڕ لەنزاو پاڕانەوە گوتی:

((مامۆستا تۆخوا مەمکوژن! مامۆستا بۆ دەتانەوێ بمکوژن؟)).

من گوتم: (( تۆ لەبری پیاوەتی و یارمەتیدانی هەژارو لێقەوماوان، دەچیت دزی دەکەیت و خەریکی شەوکوتیت؟)).

حسێن: (( ماموٚستا توخوا مەمکوژن! بەڵێن دەدەم لەمەودوا هیچ پێیەکی خوار دانەنێم! مەمکوژن ماموٚستا! ئامادەم ببمە کوٚیلە و توٚبە بکەم و هەناسەش نەدەم..)).

حسێن چەند جارێک بە پاڕانەوە ویستی لێم نزیکببێتەوە. من بوارم نەدا. بەصادقم گوت: ((ئاگادار بە! ئەمە رەنگە نیازی خراپ بێت، بەگریان و پاڕانەوە لێمان نزیک ببێتەوەو چەک لەدەستمان بڕفێنێت و ئینجا ئێمە لای ئەو دەبینە زیندانی..)).*

---

* دیمەنی حسێن و شێوەی هەڵسوکەوتی خۆم و صادق بووە هەوێنی چیروٚکی(هەلاتن)،کە چەند جارێک بلاوکراوەتەوەو بەزمانی ئەڵمانیش لەروٚژنامەیەکی ئەڵمانی بلاوکراوەتەوە. هەندێ پاژی چیروٚکەکە سوودم لەرووداویتری ژیانی پێشمەرگایەتی وەرگرتووەو لەشوێنی جیاجیای تەلاری چیروٚکەکەدا بەکارمهێناون

# تا دوا رۆژی ژیان
# ئەو ڕووداوەم بیرم ناچێتەوە
# (١١)

تەقە کۆتایی پێهات. پاش نیو سەعات پێشمەرگەکان هاتنەوە. هەموو بە سەلامەتی هاتنەوە و هەریەکە و باسی لایەنێکی شەڕەکەیان دەکرد و چۆن سوپای رژێم و تانکەکانی، بەسەرشۆڕی هەڵاتوون.

حەمە نەگرەیی*، هەر لەدوورەوە دەم بە پێکەنینەوە گوتی: ((ئەم سەربازەم بەدەست گرت و ئەم قەناسەم بە دیاری لێوەرگرت..)).

سەربازەکە رەنگی نەمابوو، وەکو بیی ناو ئاو دەلەرزی و خەریک بوو دەتۆقی. صادق، کەوتە دڵدانەوەی سەربازەکە و دڵنیای کردەوە، کە لەدەستێکی ئەمیندایە و بەم زووانە ئازاد دەکرێت. سەربازەکە یەک وشە لەدەمی دەرنەدەچوو. صادق بینیی ئەم کابرایە ئەوەندە هەڵدەلەرزێت، پاڵتۆکەی خۆی پێشکەش کردو بەدەم ڕێگاوە بەرەو (چرچە قەلا) بەبناری (زەردە)دا قسەی بۆ کابرای سەرباز دەکرد. من بینیم کابرا لەقسە کەوتووە وەکو رادیۆیەک پیلی تیا نەمابێت، نقەی لێوە

---

* حەمە نەگرەیی: لەعەشیرەتی گەلالی و دانیشتووی دێی(سەیدە)بوو، ئەو منی چاک دەناسی و منی لە (سەیدە) بینیبوو. پیاوی ئازای وەکو حەمە نەگرەیی هەر زۆر کەم بوو. کاتێک بیستم شەهید بووە، هەستم کرد کەسێکی زۆر نزیکی خۆمم لەدەست داوە..

نەدەهات. لەدڵی خۆمدا گوتم: (( کابرا قسەی لەگەڵدا نەکرێت چاکترە و لەوانەیە نەترەی چووبێت!)).

صادق بۆ لام هات و گوتی:

((هەر زۆرم سەرمایە و خەریکە رەق دەبمەوە..)).

من گوتم: (( تۆ پاڵتۆکەی من لەبەربکە و من سەرمام نییە..)).

پاڵتۆ شینەکەی خۆمم بە صادق دا. لەناوەوە فەروویەکی قایمی پێوەبوو. ماوەیەک رۆیشتین. هەستم کرد، تا بەشێکی شەو تێدەپەڕێت سەرما هێرشێکی توندتر دێنێت. حەمە نەگرەیی بەلاماندا تێپەڕی و بینیی پاڵتۆم لەبەردا نییە، هەر یەکسەر گوتی: ((مامۆستا سەرمات دەبێت ئەم فەرووە خورییەی من لەبەربکە!)).

هەرچیم کرد، نەمتوانی قایلی بکەم، فەرووەکەی بەری دانەکەنێت، سوودی نەبوو. ئەوەی راستی بێت، چاک بوو ئەو فەرووەی دامێ و تۆزێ گەرمی کردمەوە..

شەوێکی تاریک و ئەمووستەچاو، هەر هەموو ماندوو، برسی، تینوو، بەرەو (چرچەقەڵا) ملمان دەنا، هەنگاوەکانمان بە بەردی کەنار توولە رێگاکەوە گرێدرابوون، هەنگاوێک بەرەو پێشەوە، دوو هەنگاو بەرەو دواوە. پێشمەرگەکان بڕیاریان دا پشوویەک بدەن.

لەشوێنێک لەنێوان (چرچە قەڵا) و (بەرکەل)، کە پێیدەگوترێت (کانی کەڵان) پێشمەرگەکان پێنج و شەش، دەستە دەستە، بەتەنیشت یەکەوە، دانیشتبوون و بەسەرهاتی شەڕەکەیان بۆ یەکتر دەگێڕایەوە..

من و صادق بەتەنیشت یەکەوە دانیشتبووین. من دەستی ڕاستم لەسەر شانی چەپی صادق دانابوو. عەبدوو (سەلام)* شانی بەشانی صادقەوە بوو. صادق دڵنەوایی سەربازە عەرەبەکەی دەکردو دڵنیای دەکردەوە، کە بە سەلامەتی ئازاد دەکرێت. ((سبەی زوو ڕەوانەت دەکەین.. دڵت هیچ نەکات..)).

بیرم کەوتەوە دەبێ بۆ لای حەمە نەگڕەیی بڕۆم، سوپاسی بکەم و فەروەکەی بدەمەوە. چوار هەنگاو دوور نەکەوتمەوە. ڕێژنەیەک گوللە، دیوارەکانی بێدەنگی داڕماند، هاوارێک:

((بۆسەیە! بۆسەیە! کەوتینە کەمینەوە..)).

لەپڕ گوێم لەناڵەیەک بوو، نازانم چۆن لایەک لەکێوی زەردەی دانەڕووخاند: ((بژی پێشمەرگە.. بژی کوردستان..)).

خورپەیەک بەدڵمدا هات و زانیم ئەوە دەنگی صادقە و هاوارم کرد: ((مامۆستا لەتیف.. مامۆستا لەتیف.. سەلامەتی..)).

صادق لەسەر گازی پشت ڕاکشابوو.. زوو سەیری دەم و چاویم کرد. چەند دڵۆپێک خوێن بەلای ڕاستی لووتیەوە بوو. خوێنەکەم سڕی. سەیری سەرو ملیم کرد هیچی پێوە نەبوو. هەر زۆر بەپەلە سەیری سنگ و پشت و زگیم کرد. شوێنی گوللەی پێوە نەبوو. یەک دوو گوللە بەر بەلەک و خوار ئەژنۆی

---

* بەشێک لەهاوڕێ دێرینەکانم جەخت لەسەر ئەوە دەکەن. گوللە لەدەست دەرچوون نەبووەو پلان بووە: گوایە من و صادق بەیەکەوە بکوژێت و بڵێت: نەمزانیوە و لەدەستم دەرچووە.. چونکە براکەی ئەم سەلامە وەزیری دەستەڕاستی (نازم گزار)بوو. بڕیار وابوو، تەقە لە (سەدام حسین) بکات. سەلام خۆی دواتر گیراو بە هەلیکۆپتەر بۆ سلیمانی هێنایانەوە.. سەرەتای ساڵی ١٩٧٩ لەسەر بنەمای چڕبوونەوەی گومانە زۆرەکان حوکمی ئیعدامەکەی پەسەند کرا. من گوێم لە لایحەی تاوانبارکردن نەبووە، لەبەرئەوەی ئەوکاتەی ئیعدام کرا من لەدەرەوەی وڵات بووم..

کەوتبوون، چیخی کردبوو. سەرەتا وامزانی هەر ئەوەیە. تا رادەیەک دڵم خۆشبوو، گوتم: ((مامۆستا لەتیف شوێنی مەترسی نەگرتووە هیچ نییە..)).

ئەو بانگی عەبدووی کردو ئەملاو ئەولای ماچ کرد. گوتی: ((مامۆستا من عەفوی دەکەم و نامەوێ لەبری من بکوژرێتەوە.. نەیزانیوەو لەدەستی دەرچووە..)).

من گوتم: ((بەر سەرت نەکەوتووەو بەر سینگ و پشتت نەکەوتووە.. مەترسی نییە..)).

صادق: ((من هاتمە دەرەوە بۆ پێشمەرگایەتی.. تکایە بڵێن: لەشەڕیکدا شەهید بووە. من دەمویست لەشەڕی ئازادی کوردستاندا شەهید ببم.. نەمزانی بە گوللە لەدەست دەرچوون شەهید دەبم..)).

گوتم: ((دڵنیابە نامریت و گوللەت پێوە نییە..)).

سیروان: ((دیارە تاساوە!)).

حەمە نەگرەیی: ((کەسێک یەکەمین جار گوللەی بەربکەوێت تووشی تاسان دەبێت قسەکەت راستە!)).

صادق هەر هاواری دەکرد: ((ناو سکم سووتا!)).

ئێمە سەرمان سوڕمابوو، شوێن گولە بەرسک و سنگ و بە پشتیەوە نەبوو. ئەم پیاوە بۆ ئۆقرەی لێهەڵگیراوە ؟

خوێنی لەبەر نەدەڕۆیشت و جگە لەخوار ئەژنۆی و بەلەکی هیچی تری پێوە دیار نەبوو. سەیر ئەوەبوو لەخوار ئەژنۆو بەلەکی زۆر کەم خوێنی لەبەر دەڕۆیشت. من بۆ شوێن گوللەی تر گەڕام. شوێن گوللەیەکم بەرچاوکەوت، هەر ئەوەندەی شوێنی پێداچزانی جگەرەیەک بوو، بەسەر سەرووی رانی راستیەوە و یەک دڵۆپ خوێنی پێوە نەبوو. زانیم گوللەکە بەرەو

سەرەوە رۆیشتووەو سێبەندەی* بڕیوەو لەناوەوە تووشی خوێن بەربوون هاتووە، بۆیە هەر هاوار دەکات: ((ناو سکم گڕی تێبەربوو)).

بۆچوونەکەی خۆمم بۆ سیروان و حەمە نەگرەیی و حەمە حاجی سابیرو مەحموود گەرمیان گێڕایەوە و پێمگوتن:

((ئەم پیاوە زۆر قایم و بەجەرگ و خۆڕاگرە، ئەگەر لەناوەوە تووشی خوێنبەربوون نەبووبێت، هاواری نەدەکرد..))، ئەوانیش دڵنیابوون دەرچوونی زەحمەتە.

چوار پێنج پ. م بۆ چرچە قەڵا رۆیشتن و پاش سەعاتێک هێستریکیان لەگەڵ خۆیاندا هێناو گەڕانەوە، چونکە گواستنەوەی صادق بۆ ناو دێ ئاسان نەبوو. بە شەش سەعات، رێگای سەعاتە رێیەکیان بڕی. پێشمەرگەکان هەر هەموو لە صادق ماندووتر بوون. بیرمان لەوە دەکردەوە، برینەکەی کاریگەری نەبێت و دکتۆرێکی بۆ پەیدا بکەین. هەر هەموومان بیری خۆمان دەگوشی. دەرمانی برین، لەفاف، دەرزی، هیچ..!!

صادق لەناو مزگەوتەکە راکشابوو. پێشمەرگەکان هەریەکە لەشوێنێک راکشان و کەس ئاگای لەکەس نەبوو. من خۆمم هەر زۆر بەبێ دەسەڵات دەهاتە بەرچاو. تەنیا وشەی هیواو خۆڕاگریم لەسەر برینەکانی ئەو دادەناو هەرچی پرسیارمان دەکرد، وەڵامی دڵخۆشکەر و ئومێد بەخش نەبوون.

---

* سێبەندە: نێوان جوچکەی سمت و کەمبەر: (سێبەندەم شکاوە) لای عەرەب ئەم (سێبەندە) یە کراوەتە جوێن: (واحد سیبندی) بۆ (بەربووک)یش هەمان شێوەیە: لای خۆمان (بەربووک: پێخەسوو) سیفەتێکی ئاسایی ـ کۆمەڵایەتییە و لای عەرەب جوێنە..

لەپڕ صادق گوتی: ((خەوم دێ! تۆش بنوو..)). من تا بەرەبەیان بەدیاریەوە دانیشتم. هەزار پرسیارم لەخۆم کرد: ((ئایا صادق ماڵئاوایی یەکجاری لێکردین و پەپولەکان دایانە شەقەی باڵ، یان هەر بەڕاستی خەوی لێکەوتووە؟ کەسێک ئەو هەموو فیشەکەی پێوەبێت چۆن دەتوانێت بنوێت؟)).

تۆزێک دونیا روونبووەوە. جوڵەم لەصادق نەبینی. سیروان پێیگوتم: ((نەنووستووی؟)). من گوتم: ((بڕواناکەم صادق مابێت!)). ئەو هەر سەیری دەموچاوی کرد رێک لە کەسێک دەچوو، خەوی لێکەوتبێت. هەر زۆر بە ئارامی و نەرم و نیانی دەستی لەسەر شانی چەپی داناو تۆزێ جوڵاندییەوە. جوڵەی نەمابوو!

((نەماوە!)).

((مامۆستا لەتیف! کاک صادق! مامۆستا..)).

((نەماوە!)).

پێشمەرگەکان هەر هەموو رابوون و هەریەکە ویستی بەچاوی خۆی ببینێت چی روویداوە؟ دوا نیگای ماڵئاوایی بخاتە سەر کەسایەتیک نموونەی ورە بەرزکردنەوەو هیمەت و هاندانی هاوڕێکانی بوو بۆ خەبات دژی فاشستەکان. ئێستا صادق بێدەنگ راکشاوەو زۆربەی پێشمەرگەکان بارانی فرمێسکیان بەسەردا هەڵدەوەراند، جگە لە خۆم، کە هەستم دەکرد، رۆیشتنی صادق، رووخانی کۆڵەکەیەک بوو، کە دەیتوانی شۆڕش بۆ قۆناخێکی جیاواز بگوێزێتەوە . لەدڵی خۆمدا دەمگوت: ئەوە ئاشتی و مولازم جوامێر لەسەر (هیچ) و لەپێناوی کارێکی (بێ بایەخ) رۆیشتن. ئەوە صادقیش بەم شێوەیە چاوی لێکنا. ئەمانە هەر یەکەیان دەیانتوانی کۆڵەیەک دروست بکەن، بە شێوە

لەرووی ـ تەکنیکیەوە ـ لە یەپەگەی ئەمرۆی رۆژاڤا بچێت. کەچی داسی ژەنگاوی رێکەوت یەک لەدوای یەک دروێنەیان دەکات.

ئێمە پێش دەستپێکردنی شۆڕش، بەدەستی خۆمان شۆڕشەکەمان لەباربرد، جارێک هیچ دەستێکی ئەوتۆمان لەدوژمن نەوەشاندووە، کەچی نیوەی ئەو دەستەمان وردوخاش کرا. شۆرشەکەی (ئارام) و (صادق) و(جوامێر) شۆڕشێکی زۆر جیاواز بوو، لەچاو ئەم (شۆرش)ەی دواتر بینیمان و چرۆکانی نوێبوونەوە پروێنرا و رێگایەکی زۆر سەیر گیرایەبەرو (شۆڕشی چەواشە) و گازی ژەهراوی بۆ ئەودیوی سنوور راپێچی کرد. مەبەستم ئەوەیە هەر لەسەرەتاوە هێزێکی وەکو یەپەگە دروستبکرایە، هەمان چارەنووس چاوەڕێی نەدەکردین.

ئای خوایە من لەناو بیابانی شۆڕش و شەڕی پارتیزانی بەرەو کام ئاراستە هەنگاو بنێم؟ هەرچی کۆشک و تەلاری خەونی شۆڕشی نوێ بوو، لایەکی هەرەسی هێنا. نە ئارەزووی نانخواردن و ئاو خواردنەوەو هەناسەدانم هەبوو، نەمدەتوانی لەناو کۆڕو کۆبونەوەدا قسە بکەم. ریش تاشین بووە بەشێک لەرابوردوو. پێکەنین و زەردەخەنە لە لێوانم تۆران. دەمویست تێبینی و دەردی دڵ هەڵڕێژم، کێ لەمن تێدەگات؟ نازانم چۆن نامەیەکم رەوانەی کەس و کاری صادق کرد و نامەیەک، کە لەکورتە گوتارو پرسەنامە دەچوو بۆ ئارامم نووسی و نامەیەکی کورتیش بۆ عیماد! لەدڵی خۆمدا گوتم: ((هەواڵی کارەساتەکە لەخۆم ببیستن و راستیەکان بزانن، نەک هەموو رۆژێک پرسە و چەمەری و دەنگۆێکیان پێبگات..)). نامە و کەل

و پەلەکانیم رادەستی مەلا صەباری چرچەقەڵا کرد و سەردانی کەلاری بۆ ئەم مەبەستە کردبوو..

کاتێک چاوەکانی صادقیان گڵەبان کرد. چاڵێک پڕ کرایەوە، دوو کێڵ بەرزکرانەوە. جلو بەرگەکەی هەر بەخوێنەوە، لەناو جامانەیەک پێچرایەوە. چاوەکان، بزەو پێکەنین لەبن گڵ ئاوابوون، هیچ نەمایەوە بۆنی ئەوی لێبێت. کێوێک لە ورە، خەون، هیواو دڵسۆزی؛ وەکو شاخی زەردە، لەبەرچاو ونبوون. چاوم گێڕا، نە دەنگ، نە ڕەنگی ئەوم نەبینی. جامانەیەک وەکو بوخچە، جلە خوێناوییەکانی تێدا کۆکراوەتەوە. تا ئەو چرکەیە بڕوام بەوە نەدەکرد، ڕۆحی ئەو، پەپولەکان دەفڕن و من بەتەنیا رادەستی زریان و رەشەبا دەکرێم. ئیدی خۆمم پێنەگیرا، گریانێک گریام، هەرچی لەوێ بوون، ئەوانیش دایانە پرمەی گریان و براڕۆ، باوکەڕۆ... ئێمە بە چ هیواو ئاواتێک پێکەوە شارو کەس و کارمان جێهێشت: ئێمە شۆڕشێکی جیاواز دەکەین: ئێستا پاش ئەو چی جێماوە و چۆن درێژە بەو رێگا سەخت و پڕ هەڵەمووتە دەدرێت؟

لەماوەی چەند سەعاتێکدا هەموو شت لای من گۆڕا. نازانم چۆن قاچم لەسەر ئەرز دادەناو رێگای سەرەوژوورم دەبڕی. بەردو دەوەنەکان لەقاچم دەئاڵان و بەرەو دواوە رایاندەکێشام. ڕۆحی من لەڕۆحی (دووبرا) یەک دەچوو، لەبری هەوراز و پەرواز، لەناوەڕاستی ئاسمان بەچاونووقاوی بەربێتەوە. ئیدی سەر لەنوێ لەفڕین بکەوێت. چەند هەنگاوێک دەڕۆیشتم ئاورم دەدایەوە، بەو هیوایەی گۆڕ هەڵتەکێنێت و بەدواماندا بێت..)).

# ئەسپەڕێ
# (١٢)

لەبری گەشتی بناری سەگرمە و گەرمیان، سەر لەنوێ بۆ ئامێزی قەرەداخ گەڕاینەوە. یەکەم قۆناخ قۆپی بوو. قۆپی قەرەداخ و قۆپییەکانی تر، لە قەڵای سروشتی دەچن و هەر لەکۆنەوە ئێرە جێی نیشتەجێبوونی مرۆڤ بووە. ئێستاش دارستانەکانی زۆر چڕن و خەڵکی زۆر شارەزا نەبێت، ڕێگاکانی بۆ نادۆزرێنەوە. لەسەردانێکدا بۆ گوندی (گۆڕپێئەسپ) پیاوێکی بەتەمەن گوتی: ((جاران! چل پەنجا ساڵ لەمەوبەر ئەم ناوچەیە لەقۆپی قەرەداخ هەر زۆر چڕوپڕتربوو، هەر هەمووی دارستان و جەنگەڵ بوو..)). دیارە ئەو پیاوە مەبەستی بیستەکان و سییەکان بوو. من ئەوکاتە پرسیارێکم لەخۆم کرد: ((ئەی پێش پەنجا ساڵ دەبێ قۆپی چۆن بووبێت؟))..

هەژار گوتی:

(( من دڵنیام رژێم هێرش بۆ ئەم ناوچەیە دەکات و هەوڵدەدات تۆڵەی شکانەکەی دوێنێی خۆی بکاتەوە. با ڕێگەی ئەسپەڕێ بگرینە بەر. جگە لەخۆمان کەس ناوێرێت خۆی لەم ڕێگایە بدات. ڕۆیشتن بۆ قووڵایی گەرمیان بەم وەزعەوە، باش نییە و با خۆمان بزر بکەین! هەژار خەڵکی (قەڵای تەپەگەڕووس) بوو، چرچەقەڵاو تەپەگەڕووس، سەعات و چارەگێک بە پێیان لە یەکەوە دوور دەبن. ئەو لە هەموومان

بەتەمەنتربوو، هەر زۆریش شارەزای ئەو دەشت و کێوانە بوو. پێشتر ئەندامی پارتی کۆمۆنیست بوو. هەر خواردنێکی لەبەر دەستبوایەو یەکێک لەسەر خوانەکەی بوایە، دەیگوت:

((حەزت لەبرابەشە یان خوابەش؟)).

کابرا بیگوتبا: ((برابەش!))، ئەو لەناوەڕاستدا دەیکردە دوو بەشەوە.. ئەگەریش بیگوتبا ((خوابەش)). ئیدی هەر بۆ سوعبەت، لەمەلێک سەرە باڵێکی بەکابرا دەداو دەیگوت: ((خوا بتداتێ!)).

# شاژنی مەملەکەتی فەقیرە
## (١٣)

دەبوایە ناونیشانەکە کوردانەتر بنووسم(شاژنی مەزنی شانشینی فەقیرە)، ئیدی من لەبەر دڵی خوێنەرانی ئازیز پێکهاتەی رستەکەم گۆڕی. ئێمە پێش ئەوەی سەردانی (فەقیرە) بکەین، سەردانی (بەردەکەڕ)مان کرد، کە زۆراب بەردەکەڕی ماڵیان لەوێ بوو. من و سیروان میوانی زۆراب بووین. گوندەکە سەروبنی بەردەلان و شاخ و رەوەز بوو. بڕواناکەم جگە لە کورد هیچ گەلێکیتر بتوانێ بەرد بکاتە دۆشەک و سەرین، بەلێفەی ئاسمانیش خۆی داپۆشێت.

هەور بەری ئاسمانی گرت و تەمومژ مەودای بینینی کورتکردەوە. باران و تەڕوتوشیمان بەهەل زانی گەشتێکی بناری شارەزوور بکەین. سەردانی دەربەندفەقەرە، زەلە ڕەش و شەممە و وێلەکە و ئاوەکەڵەمان کرد. شەوان پاسەوانی خۆمان دەگرت. بە رۆژ، ئەگەر خۆش بوایە لەناو شیو و دۆڵ و دارودەوەن تا ئێوارە دەماینەوە. پێش خۆراوا بۆ ناو دێیەک لەدێهاتەکان شۆڕ دەبووینەوە. بەشێک لەمامۆستاکانم دەناسی، لەرێگەی ئەوانەوە دەنگوباسم رەوانەی بەشێک لەهاوڕێیانی شار دەکرد. شەوان تا درەنگانێ من و سیروان دەبووینە میوانی ئەوان.

دەمەو عەسرانێک چووینە گوندی(ئاوەکەڵە)، بە قسە و باس و هەواڵپرسین سەرقاڵبووین، بۆیە بەسەر ماڵاندا دابەشنەبووین. سیروان سێ پێشمەرگەی بۆ پاسەوانی رەوانەی شوێنێکی بەرزکردو داوای لێکردن بەدووربین سەیری هەموو

جموجۆڵێـک بکـەن و هـەر زۆر ئاگـادارین. مـن دەمویسـت تەفسـیرێک بـۆ نـاوی دێکـە بدۆزمـەوە: دەبـێ کـۆن رووبـارێکی مەزن بەناو ئەم شوێنەدا تێپەڕیبێت؟

سـاڵی ١٩٧٦ بەڕێکـەوت لە(سـیرین) مامۆسـتا عومـەری ئاوەکەڵـەم بینـی. پیـاوێکی کەڵەگـەت، مـوزەرد، بەهـەیبـەت. فەرماندەی مـەفرەزە بـوو. چۆنی و چاکیـەکی گـەرمی لەگەڵماندا کرد. بەکورتی دەربارەی شۆڕش دواو باسی هێزی پێشمەرگەی کـرد. ئـەوە یەکـەم جـاربوو لەشۆڕشـی نوێـدا چـاوم بـە پ. م بکـەوێت. سـەرم لەئازایـەتی پێشـمەرگەکان سـووڕمابوو. چـۆن وێراویانـە بێنـە نـاو دێیەکـەوە، کـە تۆزێـک سـەرووی (سـیرین)، بارەگایەکی گـەورەی سـوپای عیراقی لێبوو. لـە (شـیوەکەڵ) یش مەخفەری پۆلیسی لێبوو؟

لەسیروانم پرسی:

((بۆ عومەری ئاوەکەڵە لەریزەکانی شۆڕش نەمایەوە؟)).

سیروان: ((نازانم!)).

سیروان تۆزێک بیری کردەوە، ئینجا لەقاقای پێکەنینیدا:

((مامۆسـتا عومـەر پیـاوێکی زۆر تایبـەت و سـەیر بـوو: هـەر زۆر حەزی لەدۆ خواردنەوە بوو. زۆرجار لەگەڵ پێشمەرگەکاندا گرەوی لەسەر سەعات و قەڵ دەکرد: ئایا دەتوانێت یەک سـەتڵ دۆ بخواتەوە یان نە؟ یەک بین، سەتڵە دۆکەی بەسـەرەوە دەنـاو چۆڕی لێدەبڕی..)).

لە ئاوەکەڵەوە بۆ سەر شاخ کارێکی ئاسان نەبوو. لا پاڵێکی کووڕ، رەقەن، گابـەرد و رەوەز، بـەبێ پشـوو سـەرکەوتن ئاسـان نەبوو. سەرشاخ تەم و مژێکی چڕ بـوو. نمـە نمـە بـاران دەبـاری، لەناو فەقیرەوە زۆر دوور نەبووین. دێکـە بریتـی بـوو لـە هەشـت

ماڵ. ئێرەش وەکو سۆڵە لەدامێنی شاخ و ناو دۆڵ نەبوو، وەکو سۆڵەش سەرشاخ نەبوو، یەک تۆز نزمتر بوو. پێشمەرگەکان روویانکردە دیوەخانەکەی (خاتوو سەعدە)*. ئەو هەر زۆر بە گەرمی پێشوازی لێکردین. من هەستم نەکرد، بەرامبەر ژنێک دانیشتووم: ئەو ژنە و ئێمە پیاوین. ئەو هەر زۆر (نێرانە) هەڵسوکەوتی دەکرد، نەک وەک ژنێک، کە هەمیشە هەزاران پەردە، ژن و پیاو لەیەک جیا دەکاتەوە.

من لەژیانی پێشمەرگایەتیدا دەیان ژنم دوور و نزیک بینیوە و هەر یەکە و وێنایەکم لەسەریان هەیە. (حەلیمەخان) م بینیوە، کە جلی خاکیی پیاوانەی پێشمەرگانەی لەبەردەکرد و تاقمی دەبەست و کلاشینکۆفی دەکردە شانی، وێڕای براو کەس و کاری یەک دەستەبوون و بەناو دێهاتەکاندا جەولەی دەکرد. دەربارەی دەورو کەسایەتی ژن لەکوردەواریدا زۆر چیرۆک و داستانم بیستووە، بەداخەوە زۆر بەکەمی لەسەریان نووسراوە:

رۆژێکیان پرسیارێکم لەحاجی عەلی ماچوو کرد، کە تەمەنی سەرووی سەد ساڵ دەبوو، لایەنگری پارتی کۆمۆنیستی عیراق بوو:

((کەسایەتی مریەم خانی جموور** چۆن بوو؟)).

حاجی عەلی گوتی: ((لەناو هەموو ئاغاکانی ئەم ناوچەیەدا، ئەو لەهەر هەموویان پیاوتر بوو..)).

---

* خاتوو سەعدەی شێخ نەسرەدینی شێخ سالحی پساکان (١٩٣٨ ـ ٢٠٠٩) هاوسەری شێخ کەریمی شێخ عەبدوڵڵای فەقیرە (١٩٣١ ـ ١٩٦١).

**مریەم خانی کچی سلێمان خانی جموور ( ـ ١٩٥٩) خێزانی کاکەوڵای عەزیزخانی جموور بووە، پاش کوژرانی کاکەوڵا شووی بە پەرویزخانی کوڕی عەزیزخانی جموور کردووە. بەردەوام جل و بەرگی پیاوانەی لەبەر کردووە و دەمانچەی بەستووەو سواری ئەسپ بوو. هەر کەسێک کێشەی لای قایمقام و شارەوانی و.. تاد هەبووبێت، هەوڵی چارەسەرکردنی داوە..

قسەکەی حاجی عەلی ماچۆ رێک بۆ (خاتو سەعدە)ش دەبێت. لەگەرمیان و قەرەداخ و شارەزوور زۆر سەرۆک هۆز و شێخ و مەلا و ئاغام بینیوە، بەڵام کەسم نەبینیوە وەکو (خاتوو سەعدە) ئەوەندە دەنگی دلێر بێت و بەو حەماسەوە پشتیوانی شۆڕش بکات و هانی پێشمەرگە بدات، لەهەموو بۆنەیەکیشدا ئەوپەڕی بوێری و ئازایەتی و چاونەترسی بنوێنێت.

خاتوو سەعدە، ژنێکی کەڵەگەت و جوان و قسەزان بوو. خۆی لەسەرووی دیوەخان دادەنیشت و میوانەکانی دەدوان و بەگەرمی پێشوازیی لێکردین. سێ چوار پیاو لەبەردەم دەرگاکەدا، دەستەو نەزەر رادەوەستان و چاوەڕوانی فەرمان بوون. پیاوێک لای سەماوەر و قۆری و پیاڵە و ئاگردان دانیشتبوو، یەک لەسەر یەک چای تێدەکرد و بەسەر پێشمەرگە برسی و ماندووەکاندا دابەشی دەکرد. یەکێکیتر کولێرەی گەرمی دەهێنایە ژوورەوەو پڕ دیوەخانەکە بۆنی کولێرەی گەرم بوو. هەر کەسێک حەزیدەکرد، زوو گوێی نانێکی گەرم بپچڕێنیت و قەمچک لەماست دابگرێت. (سەعدە خان) بەزمانی فەرمان داوای لەیەکێک لەپیاوەکان کرد، زوو بەرخێک بە ئەرزدا بدرێت، تا زوو نانی نیوەڕۆ ئامادە بکرێت.

(خاتوو سەعدە) کاتێک دەدوا، هەستت نەدەکرد، ئەمە ژنێکە و بەناچاری رێگەی کەوتوتە ناو کۆڕی پیاوانەوەو هەر دەیەوێت میوان بەڕێ بکات و ماریفەتی خۆی بنوێنێت. پیاوانی ناسراوی ئەو دەڤەرە، هەریەکە پێنج شەش گەڵای تووی لەسەر زاری دادەناو قسەیەکیان نەدەکرد زەرەری بۆ پەزەکان هەبێت. هەریەکە بەجۆرێک دەدوا و قسەکانیشیان بەجۆرێک ترش و خوێ دەکرد، کەس نەیانناسیێتەوە، (خاتوو سەعدە) راست و رەوان و بەبێ پێچ و پەنا و دوودڵی پشتیوانی خۆی بۆ شۆڕش

دەردەبڕی و بەوردی بەدواداچوونی بۆ چالاکی و رەفتارو کردەوەی هێزی پ. م دەکرد.

دوو هەفتە بوو ریشم نەتاشیبوو. خەم و پەژارەیەکی زۆر بەروخسارمەوە دیاربوو.

خاتوو سەعدە گوتی:

((پێشمەرگە کەسانێکی ئازاو دڵسۆز و دلێرن. بەرەنگاری جاش و سوپای دوژمن دەبنەوە و گیانیان لەسەر لەپیان داناوە. ئەمانە داکۆکی لەخاک و شەرەف و کەرامەتی گەلێک دەکەن، بۆیە رێزیان لێدەگیرێت و گەلی کوردیش شانازیان پێوە دەکات. هەر کەسێک شەهید بوو، دەبێ هاورێکانی درێژە بە خەبات و تێکۆشان بدەن و سارد نەبنەوەو تۆڵەی شەهیدەکەیان بکەنەوە.

مامۆستا جەعفەر!

راستە جەنابت ماوەیەکی زۆر کورتە لە دەرەوەیت، خەڵک هەمووی لێت رازین و ستایشت دەکەن. هەواڵی شەهیدبوونی مامۆستا لەتیفی هاورێت، هەر زۆر کاری لەهەموو کوردێکی دڵسۆز کردووە. ئەوانەی بینیویانە باسی ئەو رووداوە جەرگبڕە دەکەن، کە ئەو کورێکی خوێندەوار و جوانخاس و قسە خۆش و رەوشت بەرز بووە. ئێمە چەند خەفەتی بۆ بخۆین هێشتا کەمە. قەدیم وتویانە: (لەپیاوان دەقەومێت). تەنیا لەتۆ نەقەماوە، لەهەموومان قەوماوە، بەڵام نابێ دڵی دوژمن خۆش بکەین. یەکێکمان شەهید بوو، پشتمان بشکێت و خەم و دڵشکانی خۆمان بنوێنین. دەبێ زیاتر بەگژ دوژمندا بچین. تۆش دەبێ کۆتایی بە پرسەو خەمباری بهێنیت))..

بانگی یەکێک لەپیاوەکانی کرد: ((برۆ تاقمی ریشتاشین بۆ مامۆستا بهێنە! با هەر ئێستا سەرو ریشی پاک بتاشێت..)). من تا ئەمڕۆش قسەکانی((خاتوو سەعدە)). لەگوێمدا دەزرنگێنەوەو

شـێوەی پـەیڤین و ئاخـاوتنی ئـەوم لای هـیچ سـەرکردەیەکی سیاسی نێرو مێی ئەم سەردەمە نەبینیوە.

قسـەوبـاس و چیـرۆک لەسـەر کەسـایەتی (خـاتوو سـەعدە) زۆرە. برای هێژا شێخ عـەدنانی کوڕی شێخ عەبدولعـەزیزی دار بـەڕوو ــ سـەنگاو ــ بـۆی گێڕامـەوە: ((سـەرەتای هەشـتاکانی سـەدەی پێشـوو، بەڕێـوەبەری ناحیـەی قـەرەداغ بڕیارێـک دەردەکات: هـەر کەسێک پـەزو مانگـاو گاوگۆتـاڵ بـەڕەڵڵای نـاو شـەقامەکانی قـەرەداغ بکـات، خاوەنەکـەی دەگیرێـت و دەسـت بەسەر دەکرێت.. بێوەژنێک، بێکـەس دەبێت و پێنج شـەش سـەر مـەڕی دەبێت. خـۆی و منداڵـەکانی ئـەو مەڕانـە پـاژێکی ژیواریـان دابین دەکات. پۆلیس بە بڕیاری مودیر ناحیە ئەو بێوەژنە دامـاوە دەگرێت و لەگەڵ پیاواندا دەست بەسـەری دەکات. ئـەم هەواڵـە بـەر گـوێی (خـاتوو سـەعدە) دەکـەوێت، یەکسـەر بـۆ قـەرەداغ دەچێت و بەردەم بەڕێوەبەری ناحیـە دەگرێت و داوای لێدەکات ئـەو بێوەژنـە دامـاوە بـەرەڵڵا بکرێت. کـەچی بەڕێـوەبەری ناحیـە سـەرەتا هـەر لەسـەر بڕیارەکـەی خـۆی سـوور دەبێت و ژنەکـە لەگـەڵ ژمارەیـەک پیـاو دەخرێتـە ئۆتۆمبێلێکـەوە. خـاتوو سـەعدە دەڵێت: ((چـۆن ئـەم ژنـە دامـاوەت گرتـووەو دەتـەوێ بـە تـەنیا لەگەڵ پیاواندا رەوانەی سلێمانیی بکەیت؟ من رێگـەت نـادەم ئـەم کارە دزێوە بکەیت. سەگ بـەژن ناوەڕێت، تۆ لەسـەگ کـەمتریت. ئـەو ژنـە هـەر ئێسـتا ئـازاد نەکـەیت سـەروپۆتەلاکت هـەرموو دەشکێنم و خۆم دەزانم چیت لێبەسەر دێنم..)).

بەڕێـوەبەری ناحیـە لەترسـا زوو ئـەو ژنـە ئـازاد دەکـات و گیراوەکانیتریش رەوانەیماڵەوە دەکات..

# شاخی زەردە بەدەرزی کون ناکرێت
## (١٤)

حەمەی تەلە (شاهۆ) خەڵکی گوندی (دەرەدۆین)ی نزیک بانی خێڵانو پیاوێکی یەکجار قسە خۆشو رۆح سووکو بەجەرگ بوو. ساڵی ١٩٧٥ شۆڕشی ئەیلوول تووشی هەرەسو نسکۆو تێکشکان بوو، کەچی حەمەی تەلە بەتەنیا بەشاخی (زەردە)وە دەمێنێتەوەو دەست لەتفەنگەکەی هەڵناگرێتو خۆی بەدەستەوە نادات. من سێ نموونەی تریش لەنزیکەوە دەناسم، کە هەریەکەیان لەناوچەیەکدا مابوونەوەو هانی خەڵکیان بۆ خەباتو شۆڕش دەدا: عەلی سەرکەوت لەئاجداغو قادر خەبات لەدەڤەری باڵەیان و مام ئەحمەدی مامەندئاوا * ئەم چوار کەسە، کە لەساڵی ١٩٧٧ بە دواوە ناسیومن، کەسایەتی ئەفسانەییو نموونەی قارەمانیو بەرەنگاریو دژایەتی رژێمی داگیرکەرو پاڵەوانی هەژارەکانن.

---

* مام ئەحمەد پێش ١٩٧٥ لەڕیزی هێزی پێشمەرگە نەبووە. پاش هەرەس و نسکۆی ١٩٧٥ دەزگای ئەمنی مەرگە گوشاری دەخنە سەرو دەڵێن: تۆ یارمەتی بارزانیت داوەو زیندانیت دەکەین. پاشان دەڵێن: وەرە لەگەڵ بەعس کار بکە. ئەویش دەڵێت: پیاو قوون بدات و نەبێتە بەعسی.. لەسەر ئەو قسانە زۆر ئازاری دەدەن. هەموو رۆژێک تووشی سەرئێشەیەکی بێ سنووری دەکەن. بۆیە عەلی کوڕی و چەند خزمێکی، چەک هەڵدەگرن و روودەکەنە چیای ئاسۆس و لەو رۆژەوە ئیدی لەسەر پێشمەرگایەتی بەبێ پشوودان بەردەوام دەبێت تا رۆژی راپەڕین.. واتە: ئەویش پێش هەڵگیرسانی شۆڕش بە ساڵێک لەدەرەوە بووە..

من لێرەدا تەنیا نێوی حەمەی تەڵەو عەلی سەرکەوتو قادر خەبات و مام ئەحمەدی مامەندئاوا دەنووسم، لەبەرئەوەی ماوەیەکی دوورودرێژ پێکەوە پێشمەرگایەتیمان کردووەو هەریەکەیان بۆ من سمبۆلی پاکیو ورەبەرزیو بوێری بوون. هەریەکەیان کلاشینکۆفێکو بڕوایەکو ژمارەیەک دۆستو هاوڕێ، ڕێگەی نەدان خۆیان بەدەستەوە بدەن.

ئەم چوار قارەمانە، ئەوەندە بەخت یاریان نەبوو، نووسەرێکی گەورەی وەکو یەشار کەمال لەنزیکەوە بیانناسێو ڕۆمانێکی وەکو(حەمەدۆک)یان لەسەر بنووسێت. من دەیان کەسی نموونەیی دەناسم، کە شایانی ئەوەن، دەیان نۆڤڵو ڕۆمانیان لەسەر بنووسرێت، بەداخەوە ئێمە، وەک میللەت، تووشی تەنگژەیەکی ڕۆحیی قووڵ بووینو خاوەن کولتووری ڕۆمانو چیرۆک نینو جارێ زمانی ڕۆمان لای ئێمە لەدایک نەبووە.

بریا ڕەسول حەمزاتۆڤ، یان گوینتەرگراس، یان هیمنگوەی، یان تۆلستۆی، یان کازاناتساکی تەنیا نیو سەعات گوێیان بۆ شاهۆ رادێراباو ئینجا بزانە چییان لەسەر دەنووسی. شەماڵ چاوشین جارێکیان بۆی گێڕامەوە: ((دووسێ ڕۆژ دەمویست حەمەی تەڵە فێری سەعات بکەم. سەعاتەکەی دەستم پیشاندەداو باسی ئەوەم بۆ دەکرد چۆن سەعات کاردەکات؟ پێم گوت: حەمە گیان، کورتەکەیان سەعاتژمێرەو درێژەکەیان دەقیقە ژمێرەو سورە باریکەکەیان چرکە ژمێرە. فێری ئەوەم کرد چۆن سەعاتژمێرو دەقیقە ژمێرو چرکەژمێر، لەسەر دوانزە، یەکیان گرتەوە، ئەوە سەعات دوانزەیە، ئەگەر سەعاتژمێر چووە سەر

دوو، دەقیقە ژمێر لەسەر دوانزە بوو، ئەوە سەعات دووە.. هاوڕێ شاهۆ تێگەیشتی؟ ئەو گوتی: بەڵێ تێگەیشتم! پاش چەند رۆژێکیتر لێمپرسیەوە: حەمە، ئێستا دەزانیت سەعات چەندە؟ گوتی: بەخوا برا هەریەکەیان وەلایەکدا چوون. قەت وا کۆنابێتەوە وەکو تۆ باست کرد..))..حەمەی تەلە، هەر هەموو گیانی ڕەشەباو جموجوڵ و نوکتە بوو. لەناو پێشمەرگەکاندا بەوە ناسرابوو، کە دەرزی هەڵدەگرێت. زۆر جار گۆرانو سیروان تاڵەبانیو زۆراب بەردەکەڕیو ڕۆستەم کەرکوکیو شێخ شەماڵی باخ، بەوە تووڕەیان دەکرد، کە ئەنگاوتنی زۆر چاکە، بەڵام قەت ناتوانێت، جگەرە بپێکێت. لەهەر کوێ بوایە، دەیگوت: ((بڕۆن بۆم داکەن))، ئیدی دەبووە قرمو هووڕی نیشانشکاندن و کێبڕکێی دەست ڕاستیو گرەو بردنەوە.

ئەو هەمیشە نۆ مەخزەن کەمتری پێنەبوو. دووربینێکی لەملدابوو، شمشاڵێک، شەوو ڕۆژ هاوڕێی پەرۆشیو خەمی عیشقێکی شاراوەبوو. من بڕوا ناکەم (دەروێش عەبدوڵڵا)ی گۆرانی شاعیر، زانیبێتی نیو ئەوەندەی ئەو شمشاڵ بژەنێت. زۆرجار پشتی بەدار بەڕوویەکی بەسالاچووی شاخی زەردەوە دەداو ڕووی دەکردە دەشتو هەردەکانی گەرمێنو لێوی بەشمشاڵەکەوە دەناو مەقامی (مەلەوان مەلەوانو کوێستانان خاڵ خاڵ)ی لێدەدا، کەوەکان لەقاسپە قاسپ دەکەوتنو توونو هەردەکان دەنگیان دەدایەوە.

کاتێک حەمەی تەلە دەنگوباسی پێکهاتنی دەستە چەکدارەکان دەبیستێت، هەر یەکسەر پەیوەندییان پێوە دەکات. ئیدی کاکە حەمە لەدڵەڕاوکێو لێکدانەوە ڕزگاری دەبێتو بەبێ

دوودڵــی شــان بەشــانی ئەوان خەبــات دەكــات. لەو مــاوەیەدا كادیرێک دەناسێت ناوی (هێرش) دەبێتو بەرپرسەكانیتر پێی دەڵێن: ئەمە كادیرەو ئاگات لێی بێتو دەبێ لەقسەی دەرنەچیت، لەرێگەی ئەم كادیرەوە فێری سیاسەتی (ی. ن. ک)و كۆمەڵە دەبێت.

رۆژێكیان كادیرێک (هێرش) بەشاهۆ دەڵێت: ((ئەرێ هاورێ شاهۆ! شاخی زەردە بەدەرزی كون دەكرێت؟)). شاخی زەردە بۆ شاهۆ پیرۆزترین شوێنو قەڵای هیوابوو. ئەو پێیوابوو، نابێ هێزی پێشمەرگە، بەبست لەزەردە دوور بكەوێتەوە. هەر جارێک رووممان بكردایەتە گەرمیان، هەزار جوێنی پێ دەداینو دەیگوت: ((سیروانو گۆران دایكەكەتان وا ... وا .. لێ كردمو منتان بۆ ئەم دەشتاییە هێنا.. سیروانو گۆران ئەمە شوێنی پێشمەرگایەتیە؟))..

حەمەی تەلە، هەرچی گوێ بۆ كادیرەكە (هێرش) رادەدێرێت، لەمەبەستی ئەو بەباشی تێناگات. (هێرش) رووبەكاتەوە شاهۆو بەراشكاوی پێیدەڵێت: ((هاورێ شاهۆ! كونكردنی شاخی زەردە، بەدەرزی، هەر زۆر لەرووخاندنی رژێمی بەغدا ئاسانترە)). حەمەی تەلە دەمی دەبێتە تەڵەی تەقیو، ناتوانێت بیر بكاتەوە، چونكە ئەو شاخی زەردە بەلایەوە سمبۆلی قایمیو پشت پێوەدان بوو.

پاش دوو سێ مانگ كاكە حەمە گەڕایەوە بۆ لامانو من قسەكانی خۆی دەگێرمەوە: ((ئای كادیر! هەواڵەی شێخ حەسەنی پیر قەرەچێوارم كردی، بەدوو قسەی حیز منی لەخشتە بردو حەیاو شەرەفی بردمو دایكی واو.. وا.. لێكردم..))..

پاش تۆزێک شمشاڵژەنین دەیگوت: (( وێن هازا ئەلگەواد حەمەی تەلە؟)). بەدەنگێکی بەرزتر بانگی دەکرد((وێن هازا ئەلگەواد حەمەی تەلە؟)) ئەفسەرێکی گەورە، بەم ڕستە جوێناویە، دزێوە، بەعەرەبی لەمنی دەپرسی. ئەو سەگبابە بڕوای نەدەکرد حەمەی تەلە بەزیندوێتی ببینێت. پێیوابوو، حەمەی تەلە دێوەزمەو جنۆکەو خێوە، دوو سێ گەز باڵای بەرزەو چوار شانەو مل ئەستوورەو دەبابە بەکاڵی قووت دەدات. ئەفسەرەکە، سەیری دەوروبەری خۆی دەکردو بۆ زەلامێکی کەتەو کەرتە دێو دەگەڕا. ئەفسەرە بچووکەکان ئاماژەیان بۆ من دەکردو گوتیان: (ئەمە حەمەی تەلەیە). ئەو هەر بڕوای بەقسەکانیان نەدەکردو لەکەللەی سەر هاواری دەکرد: ((وێن هازا ئەلگەواد حەمەی تەلە؟)) کە زانی منم، هەر خەریک بوو ورگم هەڵدڕێت. ئەو دەیگوت: نیوەی سوپای حکومەت بەدوای تۆدا دەگەڕێت! من خۆم دەزانم چەند زەحمەتمان بەدەست تووە کێشاوە. سەیرا! سەیرا! ئەم بستە باڵایە دونیای لەئێمە کردۆتە چەرمی چۆلەکە، کابرای ئامیر لیوا هەر دانی لێ جیڕ دەکردمەوەو هەر پیشی دەخواردەوە. کاتێک گوێم لەو ئەفسەرە بوو، ئینجا زانیم حەمەی تەلە کێیە! ئای کادیرو مادیر چۆن ئەو دایکەتان واو.. وا.. لێکردم.

* * *

ئەم ڕووداوە حیکایەتەکەی حەیدەر خەرگووش (حەیدەر عەلی حسێن)مان بیر دەخاتەوە: ((حەیدەر خەرگووش چەتە بووەو ساڵی ١٨٩٣ لەخانەقی کوژراوە)). ویستویەتی خۆی رادەستی دەسەڵاتی عوسمانی بکات و کابرای یۆزباشی

بینیویەتی بڕوای نەکردووە ئەمە حەیدەر خەرگووشە. حەیدەر ئەم قسە مەشهوورەی کردووە:

ئەگەر درێژ توای.. قامیش

ئەگەر قەوی توای.. گامیش

ئەگەر کوڕ ئازا توای.. حەیدەر خەرگووش

کابرای یۆزباشیی بەر گوللە داوەو هەڵاتووە.. ئینجا زانیویانە ئەمە حەیدەری راستەقینەیە.

# گەشتی ناچاری

## (١٥)

ژمارەی پێشمەرگەکان لەماوەیەکی کورتدا، دوو بەرامبەری سەرەتای گەشتی یەکەمیان لێهات. بەگشتی پێشوازیی جووتیاران لەشۆڕش ساردوسڕ بوو. نیشانەکانی ترس و گومان بەدەم و چاویانەوە سەمای دەکرد. یەک سەعات قسەی شۆڕشگێڕانە و جیڤارستانەت بۆ جووتیارێک هەڵدەڕشت و چەناگەت شل دەبوو، پێتوابوو: بڕوای بە قسەکانت هێناوەو هەر یەکسەر ئامادە دەبێت، لەریزەکانی ڕێکخستندا کار بکات، یان چەکی (شەرەف و مەردایەتی) بکاتە شان کەچی دەیگوت: ئێوە گەنجن و لەهەڕەتی لاویدان، پێم حەیفە بۆ ((هیچ)). خۆتان ماندوو دەکەن، بۆ مەسەلەیەکی دۆڕاو خۆتان بەکوشت دەدەن، حکومەت بەهێزە و بەکەس ناڕووخێت.

عەسرێکی درەنگ بۆ هۆمەر قەلا هاتینەوە. پێشمەرگەکان دابەشکران. سیروان و هەژار و من لەماڵێک گیرساینەوە. نانی ئێوارە خورا. چای پڕ شەکریان بۆ داناین. ئەندامێکی ڕێکخستنی دێیەکیتر، نازانم چۆن ئێمەی دۆزییەوە ؟ بیانوویەکی دۆزییەوە و سیروانی بردە دەرەوە. پاش چارەکێک سیروان هاتە ژوورەوەو گوتی: ((دەبێ هەر ئێستا بڕۆین! سوپای ڕژێم لەدەربەندیخان و سلێمانی و قەرەداخەوە جوڵەی پێکراوە و ڕەنگە سەعات دووی شەوێ گەمارۆی دێهاتەکان بدات!)).

هـەژار گـوتی: ((بـەری گـەرمیان فراوانتـرو کراوەتـرە و زانیاریشمان دەربارەی جوڵانەوەی هێزی سەربازی و هێرشی رژێم بۆ بناری سەگرمە لانییە...)).

سیروان: (( مانـەوە لەسـنووری قـەرەداخ بـاش نییـە و ئێمـە دەبێ لەکاتی هێرشی ئەواندا جێگۆڕکێ و ناوچە گۆڕکێ بکەین، دەچینەوە گەرمیان لەنزیکی کەلارو کفری خۆمـان پیشـاندەدەین.. بـا رژێـم بەتـەواوی سـەری لێبشـێوێت..)). بـواری بیرکردنـەوەو زانیـاری کۆکردنـەوە نـەبوو. نەمانویسـت بەقۆپیـدا بـڕۆین، یـان رێگای پەیکوڵی بگرینە بـەر بـەرەو رۆژهـەڵات. لـەدێ دەرچـووین و لەپڕ بەدەستە راستدا، ملی کوێرە رێگایـەکمان گرت و بـەرەو هـەوراز هەڵکشـاین. شـەوێکی تاریـک و نووتـەک، چـاو چـاوی نــەدەبینی. کـوێرەڕێ لــەناو دارودەون و خــڕە بــەرد خــۆی شـاردەوە. رووبـارە بەردینـە. بـەردەکان بەسـەر یەکـەوەبوون و پێشت لەسەر دانابان، هەریەکە بەلایەکدا دەفڕی. لـەبری ئـەوەی بـەرەو سـەرەوە بڕۆیـت، بـەرەو خـوارەوە دادەخزایـت. حەمـەی تەلە(شاهۆ) پێشمان کەوت، بەرەو لووتکە دایە شەقەی باڵ.

سـیروان پێیگـوتم: ((عـەلیم نـەبینی.. خـۆی و رەشاشـەکەی بەجێ نەمابن ؟)).

گوتم: (( منیش نەمبینیوە، رەنگە ماندووبێت!)).

لەرزگار بەکربایەفیم پرسی: ((عەلی دیار نییە، نەتبینیوە؟)).

رزگـار: ((رەشاشـەکەی قورسـە و بـە ئـەو نـەبێت بەکـەس هەڵناگیرێت..)). ئەو رێگایە رێگا نییـە، هەڵگەڕانـە بـەدیوارێکی زۆر بەرزدا.

پشـتیوان گـوتی: (( رزگـار ئەمـە پێشـمەرگایەتییە یـان بزنایەتی؟)).

رزگار گوتی: ((ئەگەر بزنە کێوی بویتایە بەچوار قەڵەمباز لەسەری سەرەوە دەبوویت!)). عەلی هەر نەهات. من داگەڕام، لەپەنای گابەردێکدا عەلی شانی دادابوو. ((ئەوە تەنیا من و تۆ بەجێماوین و هاوڕێیان خەریکە دەگەنە لووتکە..)).

عەلی: ((ئەمە هەورازە یان دیوارە؟ ئەم ڕەشاشە ئەوەندەی چوار کلاشینکۆف قورس دەبێت. ئەم هەموو فیشەکەی لەخۆمم ئاڵاندووە، هەناسە لەبەر پیاو دەبڕێت.. هەرچۆنێک پێ دابنەیت، بەرەو سەرەوە ناڕۆیت و بەرەو خوارەوە خلۆر دەبیتەوە..)). من گوتم: ((ئەمە ڕێگای ئاسایی نییە، بەرەوژوورکەیەکی سەخت و ڕژدو ڕکەیە، زۆرمان نەماوە..)).

عەلی: ((ئێمە جارێ لەخواری خوارەوەین. بەخوا هەموو سوپای دونیا هێرشم بۆ بهێنێت، ناتوانم یەک هەنگاو بنێم!)).

من گوتم: ((من هاتووم یارمەتیت بدەم و ڕەشاشەکەت بۆ هەڵبگرم..)).

عەلی هەر بۆ زیادەڕۆیی و سوعبەت گوتی: ((مامۆستا تۆ خۆت پەنجا کیلۆ نابیت و ئەم ڕەشاشە شەست کیلۆ دەبێت!)).

من گوتم: ((تۆ ئەم کلاشینکۆفەکەم بۆ هەڵبگرە و ڕەشاشەکەم بدەرێ. هاوڕێیان بمبینن بەم ڕەشاشەوە، غیرەت دەیانگرێت و یارمەتیمان دەدەن..)).

پیرە ڕەشاشم لەسەر نەڕەی شان داناو هەڵزنام و فریای پێشمەرگەکانیتر کەوتین. تا لوتکەی زەردە نەوەستام. لەوێ ئەم دەیگوت: (( ئەوە مامۆستا گیان بۆ بە منت نەوت؟)). و ئەوەکەیتر دەیگوت: ((ئەوە کاکە عەلی ئەوەندی پیرە مەگروون دەبێت بۆ ڕەشاشەکەی بەتۆ داوە؟)). دەوروبەری سەعات یەکی شەو گەیشتین. هەر هەموومان لەمزگەوتەکەی چرچەقەڵا،

بەدەوری زۆپاکەوە راکشاین و تاقەتی سەرین و لیفەمان نەبوو. ئەگەر خەوت هات سەرینت بۆ چییە و ئەگەر برسیت بوو پێخورت بۆ چییە؟ بن پێمان خراپ کوترابوو. پێڵاوەکانمان پێڵاوی شاخ و بەرد نەبوو. پێڵاوی لاستیک بۆ سەر بەفرو لم و قوڕاو باشە، بەڵام بۆ بناری زەردە و قۆپی هەروەکو ئەوە وایە بە پێخاوسی بەسەر گڵێمی بزمارو گوێزاندا پیاسە بکەیت.

سەعات چواری بەیانی دەستەیەک لەسەر رێگا سەرەکیەکانی چرچە قەلا بۆسەیان نایەوە، تا سەعات شەش لەوێوە چاودێری هەموو ناوچەکەیان کردو دڵنیابووین هێرش تەنیا دیوی قەرەداخی گرتۆتەوە.

# زەردەلیکاو

## (١٦)

نیوەڕۆ چووینە زەردەلیکاو. شەوکوت چەند جارێک چووبووە سەریان و بەرگوللەی دابوون و دانیشتوانی دێکە زۆربەیان ڕۆیشتبوون، تەنیا ژمارەیەکی کەم باریان نەکردبوو. دیمەنێکی سەیر سەرنجی ڕاکێشام: خێزانێک، ئازنگێک* لەسەر بەردێکی پان و تەختایی دروست دەکەن، شەوێک شاخەکەی بنیان لەبنەوە هەرەس دەهێنێت و ئازنگەکە بەسەریاندا دەڕووخێت و کەسیان دەرناچن.

من و سیروان سەردانی ڕەسوڵی حەمە یارەمان کرد، کە بە ڕەسوڵ گەلالی ناسرابوو. پیر، کەنەفت، دوا ڕۆژەکانی ژیانی دەژمارد. ئەو لەهەرەتی لاویدا ناسراوترین جەردەی ناوچەکە بووە. سوێندی خوارد: لەشوێنی نزیک، پێی عەیببوە دزی بکات و خەڵک تالان بکات. دەیگوت:

((لێرەوە ڕۆیشتووم بۆ ئەولای دووز، لەوێ ماڵمبڕیوەو گەڕاومەتەوە. لەگەرمیانی خۆمان پووشێکم لەکەس وەرنەگرتووە. بەڵام لەشارباژێڕ دەستی خۆم وەشاندووە و گەڕاومەتەوە..)).

مەلا صەبار گوتی:

((ڕەسوڵ گەلالی بەدرۆوە سوێندی نەخواردووە. ماڵی کەسێکی هێنابێت و کابرا بە پرسیارو بەدواداچوون زانیبێتی لای

---

* ئازنگ: خانووی لەسەر تەختە بەردی پان دروستکراو.

ئەوەو بەر دەرگای پێ گرتبێت. سەرەتا وتویەتی لام نییە. کابرا پێداگری گرتبێت و داوای سوێندی لێکردبێت، سوێندی نەخواردووەو ماڵی کابرای گێڕاوەتەوە..)).

رەسوڵ لەپایزی تەمەندا تۆبە دەکات، هەر بیری لای تێرکردنی خووە کۆنەکەی دەبێت. شەوانە لەسەر دیوارەوە مەڕەکانی خۆی دەدزێت و دەیانبات لەو دەشت و دەرە شەوکەژیان پێدەکات و بەیانی زوو دەیانگێڕانەوە!

# قەڵای تەپەگەڕووس
## (١٧)

تەپەگـــەڕووس و قـــەڵای تەپەگـــەڕووس دوو گونـــدن، لەچرچەقەڵاوە سەعات و چارەکێک بەپێ دوور دەبن. (هـەژار و دلێر و نـەریمان) قەڵاتەپەگەڕووسـی بوون. زۆربـەی ماڵـەکانیش زۆر دۆسـتی شـۆڕش بـوون ئێمـە لـەم گونـدە و لەچرچەقـەڵاو گۆڕیئـەسپ و باشکی.. تاد، پشتێنمان لێدەکردەوە و دەماینـەوە، خۆمان دەشت و جلەکانمان دەگۆڕی.

قـەڵای تەپەگـەڕووس لـەڕووی سـەربازییەوە، خـاڵێکی لاواز بوو، بۆ ئەوانەی گەمارۆ دەدرێن. دێکە لـەناو چاڵاییـەکی قووڵدا بـوو، سـەرەوەی چاڵاییەکـە زەویـەکی راسـتایی و تـەخت بـوو. لەخوار ئاواییش دەشت و راستایی بوو. واتە: چەند تفەنگچییـەک سـەرەوەی گونـدەکـەیان گرتبـا، دەیـانتوانی نـەهێڵن کـەس سـەر لەماڵەوە دەربکات. شیوێک، یان چەمەزستانەیەک گوندەکـەی بـە بناری سەگرمەوە گرێدەدات. بـەناو ئـەم چەمـەدا توولـە رێگایـەک هەیەو بە (کوێخا عەبدوڵلا رێ) دا بۆ (قۆپی دەربەند زەرد) شۆڕ دەبێتەوە.

ئەم دێیە، ساڵی ١٩٨٨ بەر شاڵاوی (ئەنفال) کەوت و زۆربەی دانیشـتوانەکەی شـەهید کـران. ژمارەیـەکی زۆر کـەم لەقـەڵای تەپەگەڕووسییەکان بەریکەوت ماون. من یـەکێکم لەوانـە بینی و هەواڵی خەڵکی دێکەم پرسی. ئەو گوتی: ((کەسیان نـەماون، هـەر هەموویان بەر شاڵاوی ئەنفال کەوتن و لەناو بران..)).

دانیشتوانی ئەوسای (تەپەگەڕووس) و( قەلای تەپەگەڕووس) خۆیان بەجاف دادەنا، بەساڵاچووەکانیان دەیانزانی تیرەیەکی عەشیرەتی (ئەلیاسی)ن، کە لەبناری چیای (داڵەهۆ) ژیاون و پێش نزیکەی دووسەد ساڵ، کێشەیەک روویداوە، ئیدی ئەوان لەدەشتی (زەهاو) و چیای (داڵەهۆ)وە بۆ بناری سەگرمە کۆچ دەکەن.

هەر جارێک بۆ (قەلای تەپەگەڕووس) دەچووین، زۆربەی پیاوەکان لەدیوەخانێک کۆدەبوونەوەو دەنگوباسی رۆژهەلات و رۆژاوا هەڵدەرێژرا. لەرێگەی ئەو خەڵکە دڵسۆزەوە، زانیاری زۆر گرنگمان لەسەر بەکرێگیراوو پیاوەکانی رژێم و جموجۆڵیان دەست دەکەوت. هەر ئەوان چەک و فیشەکیان بۆ پەیدا دەکردین.

رۆژێکیان پێشنیوەڕۆ لەناو دارودەوەنەکانی بناری شاخ بووین. جاشەکان تۆپەڵ تۆپەڵ، لۆژەلۆژ بە بەردەماندا تێپەڕین، پێشمەرگەکان بە ئاسپایی بۆ لای سیروان هاتن و گوتیان: ((کاک سیروان هەلە! ئەوان لەدەشتایین و ئێمە لەبەرزایی و ناو دارودەوەن و تاشەبەردین، با لێیان بدەین، ناهێڵین کەسیان دەرباز بێت. دەی کاک سیروان هەلە بڕیار بدە!)). سیروان گوتی: ((ئەم ناوچەیە بۆ ئێمە وەکو ناوچەی رزگارکراو وایە. ئەمانە لەناوبەرین، رژێم پەلاماری ئەم دێهاتانە دەدات و تۆڵە لەو خەڵکە داماوە دەکاتەوەو ئێمەیش پشت و پەنایەکی گەورە دەدۆڕێنین..)).

# دەرەوار

## (١٨)

دوو دەرەوار هــەن: دەرەواری ســەروو، دەرەواری خــواروو. دووەمیان کۆنترە و یەکەمیان لقێکی دووەمە. دەرەواری سـەروو دەکەوێتـە باشـووری قـەڵای تەپەگەڕووسـەوەو نیـو سـەعاتێک بـەپێ لەیـەکترەوە دوور دەبـن. دەرەواری خـواروو ئـاوەدانترو لەسەگرمەوە دوورترە.

لەسەر ڕێگای دەرەوار، چەرچییەک بەپیریمانەوە هات. دلێر دەستمۆچانێکی گەرمی لەگەڵدا کرد. ئەو هەر کەسێکی دەبینی چـۆنی و چاکیـەکی زۆر گـەرمی لەگەڵـدا دەکـرد. سـەرەتا پێمانوابوو، ئەو هەموو خەڵکە دەناسێت، دواتر بۆمان دەرکەوت خووی پێوە گرتووە.. پێشمەرگەکان هەریەکە شتێکیان لێکڕی. سـیروان پرسـیارێکی لێکـرد: ((جـاش و جەیشـت لـەم نـاوەدا نەبینیوە؟)).

چەرچی: ((دوێنێ جاشەکان تا ناو سەنگاو هاتن، خۆم بینیمن و دوای نیـوەڕۆ گەڕانـەوە. ئـەمڕۆ بـەم ڕێگایـەدا هـاتم کەسـم نـەبینی!)). چەرچییـەکان سـەرچاوەیەکی گرنگـی دەنگوباسـی ئێمەبوون.

کۆتایی ساڵی ١٩٨١ لەکاتی سەفەرکردنم بۆ ئەڵەمانیا دڵشـاد سلێمانی فەرمانبەرێکی گەورەی کوردی ڕۆژهەڵاتی پێناساندم، کە بەهۆی دڵشادەوە زۆر یارمەتیدام، خۆی گوتی: ((لێپرسراوی ساواکی سابڵاخ بووم و هی چەند شوێنێکیتریش. زۆر شارەزای بناری بەمۆ و دەربەندیخان بوو)).. گوتی: ((من لەساڵی ١٩٦١ تا

ساڵی ١٩٧٠ چەرچی بووم و ڕۆژێک لەباخ هەنارە و ڕۆژێک لەشمشێرکوڵ. خەڵکی دێهاتی ئەو بنارەو پێشمەرگە و کادر و لێپرسراوەکان هەر هەموویان دەناسم..)). ئەو کاتەی‌گوێم لەو کۆنە (چەرچی)یە ساواکە دەگرت، لەدڵی خۆمدا گوتم: ((کەر لەکوێ کەوتووەو کوندە لەکوێ دڕاوە؟)).

عەسر گەیشتینە دەرەواری سەروو. پێشمەرگەو دەرەوارییەکان زۆربەیان یەکتریان باش دەناسی، بە گەرمی هەواڵی یەکتریان دەپرسی سیروان چاوەڕوانی دەکرد، دۆخەکە ئاسایی ببێتەوەو بڕۆین. کوێخای دێکەش کابرایەکی قسەخۆش وسوعبەتچی بوو، هەر دەیگوت: ((کاک سیروان پێویست بەدابەشبوون ناکات و هەریەکە ماڵێک ئەدۆزێتەوەو ئێوەیش وەرن با بۆ ماڵی ئێمە بڕۆین!)). سیروان هەروەکو گوێی لەقسەی کوێخا نەبووبێت: ((سوپاس! ماڵت ئاوابێت! دەرەواری خواروو چەنێک لێرەوە دوورە؟)).

مام کوێخا: ((کاک سیروان! کاکە ئێوارەیە و درەنگە با بڕۆین و ئیسراحەتێک بکەن و ئێوارە پارووییەک نان پێکەوە ئەخۆین!)).

سیروان: ((ڕۆژ زۆری ماوەو من ئەڵێم بڕۆین باشە؟)).

مام کوێخا: ((کاک سیروان! بەخوا ئەوەندە شلیت حەیای پیاو ئەوەیت.. بێ وەڕێتۆ..)).

خەڵکەکە هەموو لەقاقای پێکەنینیاندا.

# عەلی سەرکەوت
## (١٩)

یەکێک لەو پێشمەرگانەی لە گەشتی گەرمیاندا زوو بووینە هاوڕێ ناوی (عەلی محەمەد حەسەن)بوو، کە لەناو شۆڕشی نوێدا بە (سەرکەوت گەرمیانی)، یان (عەلی سەرکەوت) ناوی دەرکرد. ئەو خەڵکی دێی (خێڵی ئاخە)ی بناری ئاجداغ بوو.

پیاوێکی زۆر ئازا، شارەزا لەشەڕی پارتیزانی و چاو نەترس. نزیکەی نۆ ساڵ پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلول بوو. ساڵی ١٩٧٥ خۆی بەدەستەوە نادات و چەک دانانێت. لەبری پێشمەرگایەتی بە ئاشکرا، شەوان بەدێهاتەکاندا، بەچەکەوە دەسووڕێتەوە.

دیمەنی سەرکەوت ئەفسانەیی بوو: بۆ هەر گوندێک دەچووین، کەسمان سەرنجڕاکێش نەبووین. ئەو لەگەڵ ئێمەدا بوایە، ژن، پیاو، مناڵ هەر هەموو دەچوونە سەربان بۆ ئەوەی تێر سەیری سەرکەوت بکەن. پیاوێکی چوارشانە، دامەزراو، لەشپتەو، تێکسمڕاو، چاوگەش، ئەبرۆ پەیوەست، سمێڵێکی ڕەشی ئەستووری قەف قەفکراو، ڕیشی پاک تاشراو.

شێوەی رووخساری هەر لەوێنەی شا عەباس و شاتوهمباسب و نادرشا دەچوو. جل و بەرگی پاک و خاوێن و ڕێکوپێک، پشتێنێکی ئەستوور، حەوت مەخزەنی لەسەری دەبەست. دەمانچەی چواردەخۆر، دووربین، کلاشینکۆفی بێقۆناخ... تاد. هەر لەدوورەوە، لەناو سەد (پ. م) دیاربوو.

سـەرکەوت پێشـبینی هەڵگیرسـانەوەی شـۆڕش دەکـات و چەنـدین لاوی دەڤـەری سـەنگاو و بنـاری ئاجـداخ پەیوەنـدی پێوەدەکـەن، یـەکێکیان مـەحموود سـەنگاوی بـوو. شـەوێک دەبیستێت دەستەیەک گوایە: ((پێشمەرگە))ن و لەو ناوچەیەدا دەسووڕێنەوە. سەرکەوت خەنی دەبێت و بۆ لایان دەچێت. ماوەیەک پێکەوە دەبن. ئەم هەڵس و کەوت و بزاوتیان لەگەڵ جووتیاراندا پەسەند ناکات. لەسەر تێهەڵدانی خەڵک و سەرانە سەندن و تالانکردنی هەژارو لێقەوماوان نارازی دەبێت. سەرکەوت بە سەرۆکەکەیان دەڵێت:

((مـن بـڕوا ناکـەم ئێـوە پێشـمەرگە بـن و چـەکتان لـەرژێم هەڵگرتبێت. ئێوە لە جاش خراپترن.... تاد.)). ئەوان نزیکەی حەفتا چەکدارێک دەبن و سەرکەوت بە تەنیا دەبێت. سەرۆکی چەکدارەکان دەست دەکاتە هەڕەشە و گوڕەشە و پەلاماردان و دەڵێت: ((هەر ئێستا سمێڵ و بڕۆت دەتاشم!)).

دە بیست کەسێک میلی لێدەهێننەوە و دەیانەوێت سەرەتا چەکی بکەن و پاشان بیکوژن. سەرکەوت خێراتر دەبێت و میل دەهێنێتەوەو لەسەر دڵی سەرۆکی چەکدارەکان قایمی دەکات و دەیکاتە بارمتە. هەرچی چەکدار هەیە دەیانەوێت چەکی بکەن، بواریان نادات. عەلی ناوێک، کە ئەم غیرەت و بوێریە دەبینێت، ئەویش میلیان لێدەهێنێتەوەو خۆی دەگەێنێتە سەر گردێک و هاواریان لێدەکات: ((نزیکی سەرکەوت نەبنەوە، هەمووتان دەکەمە بێژەنگ، وەرنە دواوە...)). سەرکەوت دەستبەرداری بارمتەکەی نابێت و بەتەنیا رایدەکێشێت بۆ نزیکی شیوێک و

تەقە دادەمەزرێت و هەردوو عەلی، گاڵەیان پێدەکەن و خۆیان دەرباز دەکەن.

رۆژی ١٩٧٩/٦/٢٤ لە (خاڵە بەگ) سەرکەوت و مەلا برایم (رەشید محەمەد قادر) و سامان گەرمیانی وژمارەیەکی تر تووشی هێرشێکی زۆر گەورەی سوپای عیراق دەبن، شەڕ دەستپێدەکات و بە دەیان سەرباز دەکوژرێت. هەردوولا ئەوەندە تێکەڵاوی یەکتر دەبن. سەربازێکی بریندار، کە خۆی کردۆتە مردوو، سەرکەوت بەلایدا تێدەپەڕێت، ئەو خێرا دەبێت و تەقەی لێدەکات و سەرکەوت شەهید دەبێت..

سەرکەوت* پیاوێکی کەمدوو بوو. قەت حەزی نەدەکرد باسی پاڵەوانێتی خۆی و من و منمنۆکێ و منمنایەتی بۆ کەس بکات. قەت بەخراپە باسی دوژمنەکانی خۆیشی نەدەکرد. رێزی لەمناڵی ناو لانکەش دەگرت و نەیدەهێشت دڵی هاوڕێکانی گەرد بگرێت..

من یەکێکم لەوانەی حەزم دەکرد: لە شێوەی کارکردن و پەیوەندی لەگەڵ جووتیارەکان و مانەوە بەشێوەیەکی نهێنی لەو ناوچانەی لەبن دەستی رژێمدا بوون لەسەرکەوتەوە پەندو شتی نوێ فێرببم و سوود لە ئەزموونی ئەو وەربگرم.

---

* بڕوانە:

ـ مەحموود سەنگاوی: بیرەوەریەکانی سەنگاوی.

ـ م. عەلی: لەبەردەم شکۆی مرۆڤە مەزنەکاندا، چاپخانەی حەمدی، سلێمانی ٢٠١٨ ل ١٨٩.

# سەرکەل

## (٢٠)

یەکەمین جار بوو لەژیانمدا رۆژی (١٨) سەعات بە پێ بڕۆم. زۆربەی شوێنەکانیش دەشت بوون و لەبەر سمیڵی رژێم تەپ و تۆزمان دەکرد. بناری ئاجداغ (درۆزنە، ئاوەسپی، جامڕێزی.. تاد) بە پەلە بەناو دێهاتەکان دا گەڕاین. عەلی سەرکەوتم لەم گەشتەدا بینی. پیاوێکی بێوینە لەقسەکردن و رێکردن و هەڵس و کەوت و سەرنجڕاکێشانی خەڵک، کەس هاوشانی نەبوو.

چووینە قوولایی بنەی جاف. بەرۆژی نیوەڕۆ لە (باشکی) لاماندا. سیروان گوتی:

((لەناو هەموو خاکی کوردستاندا، لەدێی باشکی پاک و خاوێنتری تێدا نییە! زمان لێدان و ئیخباریەکردن گەورەترین عەیبە و شەرمەزارییە. یەک مانگ لێرەبە، کەس پێتنازانێت. خەڵکی ئێرە میوان وەکو چاوی خۆیان دەپارێزن. هەلێکی باشە، خۆتان پاک بشۆن و ئەو ماڵانە جلەکانتان دەشۆن و شەویش لێرە دەمێنینەوە..)).

ئێوارەی یەکی شوبات لە (سەرکەل) بووین، کە لەکەلارەوە زۆر دوور نییە. من دەمەویست لەڕووی زمانەوانییەوە بەراورد لەنێوان (بەرکەل) و(سەرکەل) بکەم. ئێرە لەچاو هەردەی رۆژاوای خۆیەوە بەرزتر بوو. نان و چا خوراو هەر هەموومان لەدیوەخانی ماڵێکی پەڕی ئاوایی کۆبووینەوە، بە حیسابی

ئەوەی شەو لەم دیوەخانەدا رۆژ بکەینەوەو هەریەکەش سەرین و لێفەیەکی لەگەڵ خۆی هێنابوو. سیروانیان بۆ دەرەوە بانگ کرد. پاش پێنج دەقیقە منیشیان بۆ دەرەوە بانگ کرد. سیروان گوتی: ((کاک ئارام دوێنێ لەتەنگی سەر شەهید کراوە..)).

((کاک ئارام! چی.. چی..؟)).

سیروان: ((شەهید کراوە! جارێ نابێ لای پێشمەرگەکان ئەم هەواڵە بلاوببێتەوە.. رەنگە بەشێکیان بڕوخێن..)). هیچ باس ناکەین و هەر ئێستا بەم شەوە بۆ قەرەداخ دەگەڕێینەوە..)).

من گوتم: ((ئەمە کارەساتێکی گەورەیە بۆ کۆمەڵە! ئەم رێکخستنە تووشی لێدانی زۆر قورس بوو، هیچ سەرکردەیەکیش لەوانەی من دەیانناسم ناتوانن جێگەی ئەو پڕ بکەنەوە..)).

سیروان گوتی: ((با هاوڕێیان گومان نەکەن و بڕۆین..)).

هەر ئەو شەوە بەرەو قەرەداخ کەوتینە ڕێ..

## دانئیشان و گیانکێشان

## (٢١)

سـەرەتای شـۆڕش، چارەسـەری نـەخۆش و بریـندار کارەساتێکی گەورە بوو. لەم سەری گەرمیانەوە تا ئەوسەری گەرمیان یەک ناوەندی تەندروستیی لێنەبوو. هەر کەسێک نەخۆش بوایە، یان ئازارێکی هەبوایە سەری دونیامان لێدەهاتەوەیەک.

سیروان ماوەیەک کاکیلەی سەرەوەی لای چەپی ئازاری هەبوو. بەرە بەرە پووکی ئاوسا. ئەو شەوەی گەیشتینە چرچەقەڵا، لەسەر سەر دەخولایەوەو تا بەیانی نەنووست.

بەیانی زوو ژمارەیەک لەپیاوماقووڵانی دێ بۆ لامان هاتن. (شێخ جەلال و مەلا صەبارو ڕۆستەم و.. تاد) لێمان کۆبوونەوە و نەیاندەزانی چۆن بەشێک لەئازارەکانی سیروان کەمبکەنەوەو یارمەتی بدەن.

سیروان پرسی: ((لەم دێهاتانەدا دکتۆری دانی لێ نییە؟)).

شێخ جەلال گوتی: ((نەوەڵڵا کاک سیروان! یەک دکتۆری لێ نییە!)).

سیروان: ((ئەی یاریدەدەری پزیشکێک، کە ئیجازەی دانکێشانی هەبێت؟)).

مەلا صەبار گوتی: ((تەنیا لەدەربەندیخان و سەنگاو ڕەنگە یەک یاریدەدەری پزیشک هەبێت!)).

سیروان: ((ئەی پیاوێکی شارەزای دانکێشان بێت و گاز و دەرزی و بەنجی هەبێت؟)).

رۆستەم: ((لەم دێیە هەر کەسێک بیەویت دان بکێشێت، ناڵبەندێکمان هەیە، ئیدی بۆ لای ئەو دەچین و ئەویش گازو پلایسی هەیەو بەجوانی دانی ئەو خەڵکە دەکێشێت..)).

یەک دوو کەس بۆ ناو دێ چوون و کابرای ناڵەبندیان بەتوورەکەکەیەوە، چنگ لەسەر شان، هێنا.

کابرا هات گازێکی درێژ و سمتەراش* و ناڵی ئەسپ و بزماری لەسەر فەرشی مزگەوتەکە بڵاوکردەوە. سیروان لەسەر گازی پشت راکشا. یەک دوو کەس دەست و قاچیان توند توند گرت. دەسکی گازە درێژەکە، شیاکە و قوڕ و تەرسی تەڕی پێوەبوو، سەوزی دەکردەوە. پاک و خاوێنی لەفەرهەنگی دانکێشانی ئەم دەشت و کێوەدا، هیچ بایەخێکی نییە!

پاکردنەوەو بەنج و لۆکە و دەرمان لەئارا نەبوون. ناڵبەندەکە گازە نیوگەزییەکەی ئامادە کرد. سیروان دانە کلۆرەکەی بە پەنجەی پیشاندا. گازەکەی توند توند لێگیرکرد و بن پێی لەژێر چەناگەی قایمکرد. هەروەکو چۆن بزماری ژەنگاوی لەبن ناڵی کەپەروکەل و کۆم دەردەهێنرێت، ئاوها کاکیلە کلۆرەکەی، وەکو باشترین پسپۆری دانی ئۆروپیی دەرهێنا.

هەر دان کێشرا، ملی ئەسپەڕێمان گرت و بەرەو قۆپی کەوتینە رێ. ئەو تەنیا جامانەکەی لەملیەوە ئاڵاندو کڵاشینکۆفەکەی کردە شانی و بەو شاخەدا هەڵگەڕاین، نە دەرمان نە ئەسپرین، نە پاراسیتامۆل و نە هیچ ئازار شکێنێک!

ژووریکی پاک و خاوێن، لەسەر کورسی دانکێشان راکشاوم. ئامێرەکان دەبریسکێنەوە. کیژێک سەیری دانەکانی کردم و

---

* سمتەراش: سمتراش. سمبڕ

کیژێکی یاریدەدەری دکتۆر زانیارییەکانی تۆمار دەکرد. پاشان خانمە پزیشکەکە هات و بەئامێرە ئەلیکترۆنیەکانی بەردی سەر دانەکانمی پاکدەکردەوە. دوو کیژ دەستیان بەقاچ و ئەژنۆمدا دەهێناو یەکێکی تریان دەستی بەشانمدا دەهێنا. دکتۆرەکە بەردەوام دەیگوت: ((بەڕێزتان ئەگەر ئازارتان هەبوو، دەستی راستتان بەرزبکەنەوە!)).

من هەر جارێک لە ئەڵەمانیا بۆ لای ئەو دکتۆرانەی دراوسێم دەچووم، کە دوو ژنی زۆر بەڕێزو سەرکەوتووبوون و هەشت یاریدەدەریان هەبوو. سیروان و مزگەوتەکەی چرچەقەڵاو گازە درێژە شیاکاوییەکەم بیر دەکەوتەوە.

# تەنگیسەر

## (٢٢)

دوای سێ ڕۆژ گەیشتینە تەنگیسەر. ڕێکەوتێکی ڕەش، ڕووداوێکی جەرگبڕ بەرهەم دەهێنێت. بەوردی گوێمان لەجووتیارەکان گرت، کە ڕۆژی ١٩٧٨/١/٣١ بەچاوی خۆیان ڕووداوەکەیان بینیبوو. ئاوات قارەمانی دەیەوێت سەردانی ماڵ و منداڵەکانی بکات، کە لەدێیەکیتری ئەو دەڤەرە دەژیان. ئارام لەماڵێک لەماڵەکانی تەنگیسەر بە تەنیا دەمێنێتەوە. عەسرێکی درەنگ، ڕەوەیەک چەکدار بەرەو دێکە دێن. ئارام دڵنیا نابێت، بەو ئێوارەیە، ئەمانە پێشمەرگەن یان جاشن. خەڵکی ئاواییش نازانن ئەمانە کێن؟

ئارام هەر لەو ماڵە بوایە، کە لەدوای نیوەڕۆوە لێی دامەزرابوو، هیچ رووی نەدەدا. چونکە جاشەکان ماڵی خەڵکیان نەدەپشکنی و کون بەکون بەدوای کەسدا نەدەگەڕان. ئارام پێش ئەوەی ڕەوە چەکدارەکە بگاتە ناو دێ، بۆی دەردەچێت و کەس لەوان نایبینێت. ڕەوەکە ناگاتە ناو دێ، ئەو خۆی دەگەێنێتە ناو چەم و نزیک دارستان. لەبری ئەوەی لەناو دارستاندا خۆی بزر بکات و بچێتە شوێنیکی نەدیو، تا شەو دادێ، لەسەر بەردێک بەرامبەر ئاوایی دادەنیشێت. جاشەکان دەیبینن و لەخەڵکی ئاوایی پرسیار دەکەن: ((ئەو کابرایە کێیە لەسەر ئەو بەردە دانیشتووە؟)).

جووتیارێک دەڵێت: ((ئەوە کوڕێکی شوانە و لەوێ دانیشتووە..)).

ئەو چرکەیە ئارام تفەنگەکەی دەکاتە شانی و بریقەکەی دەبینرێت. یەکسەر یەکێک لەو چەکدارانە هاوار دەکات: ((ئەمە چەکدارە، تەقەی لێبکەن و مەهێڵن دەربچێت..)).

ئارام پیاوی رێکخستن و نووسین و پلاندانان و کاری تیۆری بوو. ئەو لەکاروباری سەربازی و پێشمەرگایەتی کۆڵەوار بوو. چاوی باش نەیدەبینی و لەوە ناچێت توانای چەک بەکارهێنانی بەگوێرەی پێویست بووبێت. ئەم دوو لایەنە یارمەتیان نەداوە، لەتەڵە و داوی پڕ مەترسی ژیانی پێشمەرگایەتی، بە ئاسانی بتوانێ خۆی دەرباز بکات..

لەدەستدانی ئارام شکانی بڕبڕەی پشتی کۆمەڵە بوو. ئەو رۆیشت ئیدی کۆمەڵە بەبێ سەر مایەوە، بەرە بەرە، هەنگاو بەهەنگاو هەڵوەشێنرایەوە. بەشێک پییانوایە: ئارام بمایە یەکێتی دەبووە(بەرەیەکی نیشتمانی) نەک حزبێکی سیاسی. نیمچە بەرە دەکرایە (بەرە)، هەروەکو ئارام خۆی لەنووسینەکانیدا، جەختی لەسەری کردووە. بەشێکیتر پێیانوایە: ئارام ئەو سەرکردەیە نەبوو بتوانێت رەوتی رووداوەکان بگۆڕێت. لەئەنجامدا بەرەنگاری هیچ گوشارێکی پێنەدەکراو ناچار دەبوو، ئەویش رێگای هەندەران بگرێتە بەر.. تاد.

ئەمەی ئێستا لەناو بازنە و کۆڕی رووناکبیراندا، گفتوگۆی لەسەر دەکرێت، تەنیا تێگەیشتن و بۆچوونی هاوڕێ و هاوبیرەکانیەتی و هەریەکە ئەزموون و تاقیکردنەوەی خۆی کردۆتە پێوەر. کەس نەهاتووە لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی و زانستی لەسەر بابەت و مژارەکە بنووسێت، بە پشت بەستن بە داتا و فاکت و بەڵگە و دۆکۆمێنت.

# دکتۆر ئاسۆ

## (٢٣)

دکتـۆر ئاسـۆ جـەلال رەئـوف: لاوێکـی سـوور و سـپی، مـوو کەستنایی، گورج و گۆڵ، بـەدەموپل، خێرا دەپـەیڤی، خوێندەوار، نـاڕازی لەشـێوەی بیرکردنـەوەو هـەڵس و کـەوت و چـالاکی کۆمەڵـە و هێزی پێشمـەرگە، زۆربـەی کات کتێبێکی بەدەستەوە بوو. کۆڵە پشتێکی بچووکی بە شانیا دەدا، کە تژی دەرمان و دەرزی و کتێـب و قەڵـەم و قاقـەز بـوو. بڕیـاری دابـوو بـەرەو هەنـدەران بـڕوات. تێکـەڵاوی حەملـەی بادینـان (هـەکاری) بـوو. لەشەڕی (قابیل و هابیل) شـەهید کراو کـەس نازانێت گۆڕەکـەی کەوتۆتە کوێوە؟.

ئێوارەی ١٩٧٨/١/٣١. لەگەڵ دە دوانزە پێشمەرگەی تـردا روو دەکاتە دێی تەنگیسەر. هەر سێ چوار پ. م لەقۆڵێکەوە خۆیـانی پێدا دەکـەن. دکتـۆر ئاسـۆ، چـەکی پۆرسـەعیدەکەی بەدەستەوە دەگرێـت و لەسـەر بـانێژەیەکـەوە روو دەکاتـە ماڵێـک، لەپەنجەرەکـەوە ژوورێکـی پـڕ لەچەکـدار دەبینێـت: پێیوادەبێـت یـەکێکیان (ئـازادی سـەگرمە)یـە و دانیشـتوون چـا دەخۆنـەوە. ئـەمیش خـۆی ناشـڵەژێنـێ، پێڵاو دادەکـەنێ و دەچێتـە ژوورەوە سڵاویان لێدەکات و رێگە نادات کەس لەبەری هەڵبسێت. سـەرەتا هـەردوولا هێدمـە دەیانگرێـت تۆزێـک لـەدەم و چاوەکـان ورد دەبێتـەوە، ئینجـا دەزانێـت، ئەمانـە کەسـیان پێشـمەرگە نـین و سـەرۆکی جاشـەکانن. ئـەم بـە چەشـنێک دەردەپـەڕێت و ئـەوان بەتەقە و دەسـتڕێژ دوای دەکـەون. ئیدی تفـەنگ و پێڵاوو کتێب

جێدەهێڵێت و خۆی دەرباز دەکات. ڕۆژی دە جار ڕۆستەم کەرکوکی و سیروان و گۆران گوێیان لەدکتۆر ئاسۆ دەگرت و دوو سێ جار داستانەکەیان پێ دەگێڕایەوە. هەر هەموو دانیان لێ جیڕ دەکردەوە، کە لەبری دەستکردنەوە و تۆڵە سەندنەوە، تفەنگەکەی فڕێداوە و خۆی دەرباز کردووە.

# شێخ عەبدولعەزیزی داربەڕوو
## (٢٤)

شێخ عەبدولعـەزیزی داربـەڕوو، شـێخ بەهائـەدینی داربـەڕوو، مـەلا صـەباری چرچەقـەڵا ئێـوارەی ڕۆژی ١٩٨١/٧/١١ دەکەونـە بۆسـەی جاشـەکانی سـەنگاوەوە: شـێخ عەبدولعـەزیز و شـێخ بەهائەدین دەستبەجێ شـەهید دەبن و مـەلا صـەبار کە لـەنێوان هەردووکیاندا دانیشتووە، بریندار دەبێت و لـەمردن دەگەڕێتەوە و ئێستا لەکـەلار دەژێت. ئـەوەی ڕاستی بێت لەدەستدانی ئـەم دوو کەڵە پیاوە زیانێکی زۆر گەورەی بە شۆڕش گەیاند، چونکە ئەمان لەم ناوچەیەدا پشتیوان و کۆڵەکەی یەکێتی بوون.

شـێخانی قەڵاگە، نـەوەی شـێخ عەبدولکـەریمی لۆتـەرن. شـێخ عەبدولکەریمی گـەورە لەقەڵاگەی بنـاری سـەگرمە گیرساوەتەوە و قوتابخانە و کتێبخانەیەکی دروستکردووەو سەردانی (محەمـەد عـەلی پاشـا) والـی میسـری کـردووەو شمشـێرێک و قورئـانێکی بەدیاری لەو وەرگرتووە.

ناوەڕاسـتی شـوباتی ١٩٧٨ پەیوەنـدیمان لەگـەڵ شـێخ عەبدولعـەزیز بەسـتەوە و لـەدێی دەرەوار چاومـان بـە یـەک کەوتەوە. ئەو پیاوێکی بەهەیبەت و قورس و گران و قسـەزان و شارەزا و بوێر بوو. ئەوەندەی دە کادر ڕۆڵی دەگێڕا و چالاکی ئاشـکراو نهێنـی هـەبوو. تـرس و دوو دڵـی و پاشـگەزبوونەوە لەقسەکانیا بەدی نـەدەکرا. هـەر ئـەو بـە ئاشـکرا پشـتیوانیکردنەی شۆڕش بووە هۆی ئەوەی لەنزیک (کچان) بۆسەی بۆ بنێنـەوە و

ئۆتۆمبێلەکەی بەر ڕێژنەی گوللە بدەن. دیارە ڕژێم بڕیاری ئیعدامیکردنی بە فەرمی بۆ دەرکردبوون و جاشەکان جێبەجێکردنیان لەسەر بووە.

تەمەنی دەوروبەری چل ساڵ دەبوو. زیرەکی و ژیری و لەسەرخۆیی و ڕێ نواندنی وایدەکرد هەست بکەیت تەمەنی سەرووی شەست ساڵە. من و سیروان لەگەڵی دانیشتین و بەوردی گوێمان بۆ قسەکانی رادەدێرا. ئەو وەکو سەرلق و کادرێکی پێشمەرگەیی شۆڕشی پێشوو، لەروانگەیەکی جیاوازەوە دەستە چەکدارەکەی ئێمەی هەڵدەسەنگان. زۆر بڕوای بەخۆی و سەرکەوتنی شۆڕش هەبوو. تۆڕێکی فراوانی لەگەڵ سەرجەم کەسایەتیە ناسراوەکانی گەرمیاندا هەبوو. ئەو زۆر ژیرانە ڕێنوێنیی دەکردین.

شێخ فەرمووی: (ئێوە هێشتا لەقۆناخی سەرەتایین و خەریکی گاگۆڵکێ و دارەدارەن. پێویستە خۆتان لەکێشەی لاوەکی و لابەلا بپارێزن و دوژمنایەتی لەگەڵ هیچ کەسێکدا نەکەن! ئەو کەسە دەتوانێ بەگوێرەی هێزو توانای خۆی دوژمنایەتیتان بکات و دەستان لێبوەشێنێت.

شێخ محەمەدی کربچنە کەسایەتییەکی ئاینی و کۆمەڵایەتی گرنگی ناوچەکەیە و پێگەی جەماوەری خۆی هەیە و هەزاران دەروێشی لەعێراق و ئێرانیشدا هەیە. ئەو کاریگەری و دەسەڵاتی خۆی هەیە و ئەگەر بیەوێت دەتوانی زیانتان پێ بگەیێنێت و ژیانتان لێ تاڵ بکات. ئێوە هێشتا رەگتان دانەکوتاوەو رەگ و ریشەتان نییە و بەرگەی ئەو هەموو دوژمنایەتیە ناگرن.

سالی ١٩٧٤ کادرو لێپرسراوه سەربازیەکان ناتوانن دڵی شێخ رابگرن و گرژییەکی زۆر دروست دەبێت. رژێم نەوت بە ئاگرەکەدا دەکات و دەرگای سەنگەر گۆڕکێ دەخرێتە سەر پشت و بەسەدان کەس چەکیان دژی شۆڕش هەڵگرت. چالاکی و جوڵانەوەی شۆڕش لەزۆر ناوچەدا لەقاڵبدرا.

ئێمە نابێ هەڵەکانی سالی ١٩٧٤ـ ی شۆرشی ئەیلولی ـ دووبارە بکەینەوە. ئێمە کێشە و سەرئیشەمان کەم نییە و نابێ مەلۆی کیشەکان سوالەی* تریان بخرێتە سەر..)).

شێخ عەبدولعەزیز قەڵایەک بوو لە قەڵاکانی شۆڕش. شەوو رۆژ هەوڵی دەدا دۆست و لایەنگر بۆ شۆڕش پەیدا بکات. لەبنەوە، چەک و تەقەمەنی بۆ رەوانە دەکردین، لاوانی دەڤەرەکەی هاندەدا بێنە ریزی شۆڕشەوە. هەر پێشمەرگە و کادرێک بچوکرتین هەڵەی بکردایە ئەو بەتوندی رەخنەی لێدەگرت و بەرپەرچی دەدرانەوە و رێگەی بەکاری خوار و لار و لەوێر نەدەدا.

---

* سواڵە: پڕ مشتێک گوڵەگەنم یان جۆی دروێنەکراو.
پێشینیان گوتویانە: (سواڵە بە نواڵە) نواڵە: پاروو: بابوڵە: واتە: چەند پاروو بخۆیت، بەگوێرەی ئەوە دروێنەیان کارێک دەکەوێتە سەرشانت.

# هۆمەرقەڵا و میریاسی خواروو
## (٢٥)

رۆژی ١٩٧٨/٣/٢ لەهۆمەرقـــەڵا بـــووین. دەســـــتەیەک لەپێشـمەرگەکانی شـارەزووریش لـەوێ بـوون (رەئـوف بـەگ، حەمەی حـاجی سـابیر، حەمـە نـەگرەیی، مـەحموود گـەرمیانی، .. تاد). رەئوف بەگ فەرماندەی هەرێمی یەک بوو، هەر لەسنووری شلێرو ناو خوانەوە تا زنجیرە چیای بەمۆو زمناکۆ، قەڵمەڕەوی هـەرێمی یـەک بـوو. هـەردوولا خـەریکی چـۆنی و چـاکی و هەواڵپرسـین بـووین، لـەپڕ دەنگـی فـڕە فـڕی هەلیکۆپتـەر هـات، لـەدوو قۆڵـەوە کۆپتـەرەکان دەرکـەوتن. ئێمـە بـەرەو ناوەڕاسـتی شاخەکە هەڵکشاین و بە پەرش و بڵاوی دامەزراین و چاودێری هەلیکۆپتـــەرەکانمان دەکـــرد تـــا بـــزانین ئاراســـتەی هێرشـــە ئاسمانییەکە بەرەو کوێ دەڕوات؟

مـن و رەئـوف بـەگ پێکـەوە بـە شـاخەکەدا هەڵگـەڕاین. ئـەو ئەشـکەوتێکی بچـووکی بـەدیکرد، کـە بەردەمەکـەی تاشـەبەردو درەخـت و گژوگیا بـوو، بەسـەر زۆربـەی ناوچـەکانی قەرەداخـدا دەیڕوانی، گوتی: ((ئێرە شوێنێکی بەرزو و قایمـە، کۆپتـەرەکانیش ئەوەنـدە بـەرز نابنـەوەو ناشـتوانن لـە شـاخەکە زۆر نزیـک ببنەوە..)).

هەلیکۆپتـەرەکان بـە چڕی لەسـەر شـاخی فـەقێرەو میریاسـی خـواروو دەسـووڕانەوەو گرمـە و ناڵـەیـان دەگەیشـتە گـوێی ئێمـــەیش. روویـــانکردە زەردە و بەســـەر هۆمـــەر قـــەڵادا

دەسووڕانەوە. هەندێکیان ئەوەندە نزیک دەبوونەوە، سەرنشینەکانیان دەبینران و بەدوای نێچیردا دەگەڕان.

من لەرەئوف بەگم پرسی: ((هەلیکۆپتەرەکان یەکجار زۆرن، ژمارەیان چەندێک دەبێت؟)).

رەئوف بەگ لە پێشمەرگەیەکی پرسی، کە شانی بە گابەردێکەوە دابوو، بەدووربین چاودێری هەلیکۆپتەرەکانی دەکرد. ئەو گوتی: ((تا ئێستا من سی و پێنج *هەلیکۆپتەرم ژماردووە!)).

مەحموود گەرمیانی بەدەنگێکی بەرز هاواری کرد: ((هەلیکۆپتەرەکان نزیکتر دەبنەوە، زۆر جموجۆڵ مەکەن و خۆتان دەرمەخەن. خۆتان دەرمەخەن!)).

لەچەپ و راستەوە هاڕەی دەسترێژ دەهات.

رەئوف بەگ گوتی: (( دەسترێژەکانیان هیچ نییە، با کەس تەقەیان لێنەکات! چوار پێنج دەسترێژیتر دەکەن و دەگەڕێنەوە..)). پێشمەرگەکان هەریەکە قسەکەی رەئوف بەگی بە ئەوەکەی تر گەیاند.

من گوتم: ((سەرنشینی هەلیکۆپتەرەکان بە ئاشکرا دیارن، بە کلاشینکۆف تەقەیان لێبکرێت ناپێکرێن؟)).

---

* لە ئازادی سەگرمەم پرسی: چەند هەلیکۆپتەر بە ئاسمانەوە بوون؟ ئازاد گوتی: دوو بڕ بوون دەستەیەکیان (١٩) و دەستەکەی تریان (١٦) هەلیکۆپتەر. یەکێک لەبەرنامەیەکی تەلەفزیۆنیدا گوتبووی (٢٢) هەلیکۆپتەر لەمیریاسی خوارووە هێرشیان بۆ هێناین، لە فەیسبوک کردیانە هەللا.

نەوشیروان مستەفا ئەمین لە بیرەوەریەکانیدا باسی شەڕی شێنێ دەکات، کە سەرووی (٥٠) هەلیکۆپتەر هێرشیان هێناوەو شەڕی (دەشتێو)یش بە هەمان شێوە.

ئەو گوتی: ((کۆپتەرەکان گوللە نەبڕن و لەجولانەوەدان و بە ئاسانی بەرناکەون. لەهەر کوێ یەک تەقەیان لێبکرێت، ئەو ناوە وێران دەکەن و ئێمەیش ئیتر شوێنی حەوانەوەمان نامێنێت!)).

لەسەر بەرزایی و دەوروبەری دێکانی قەرەداخ، بە هەلیکۆپتەر، سەرباز دابەزێنرابوون، لەدیوی زەردە، لەبەر چڕی دارستان و لێرەوارو نەبوونی تەختایی، نەیانتوانی سەرباز دابەزێنن. هەلیکۆپتەرەکان، بەسەر چەمی دێوانەدا وەکو واشە دەسووڕانەوە. هەلیکۆپتەرەکان، پاش چەند دەستڕێژێک بەرەو دەلووجە و سێوسێنان و سۆڵە چوون. هەر تارمایەکەیان بەرچاو کەوتبا دایان دەدووری..

رەئوف بەگ پێیگوتم: (( ئێمە لەتەک کاک تایەری عەلی والی، لە چەند رۆژی داهاتوودا بۆ سەرکردایەتی دەڕۆین. ئەگەر نامە یان هەر راسپاردەیەکتان هەیە، بەسەرچاوان من بۆت دەگەێنم!)).

من زۆر سوپاسم کرد و گوتم: (( ئەم بەیانییە لەگەڵ کاک حەمەی حاجی سابیر قسەم کرد، ئەویش پێیباشبوو، نامەیەک بۆ مام جەلال بنووسم. زۆر زۆریش سوپاستان دەکەم ئەگەر ئەم نامەیەم بۆ بگەێنن!)).

# بانی مۆرد
# (٢٦)

بە بناری سەگرمەدا، رێچکەمان بەست، تا نەگەیشتینە بانیی مۆرد لەهیچ دێیەک لامان نەدا. گوندێکی ئاوەدان و خۆش، بەشاخەکەوە نووساوە، کانیاوێکی باش و سازگاری هەیە و بەسەر پاژێکی گەورەی گەرمیاندا ئەڕوانێت. چوار پێنج پێشمەرگەی قەرەداخ بە دواماندا هاتن: دەبێ یەکسەر بۆ دیوی قەرەداخ بگەڕێینەوەو لەوێ چاوەڕوانمان دەکەن. ئێمە بێئاگابووین رۆژی ١٩٧٨/٣/٢ چی روویداوە!

مەلا بەختیار، مامۆستا شەماڵ، دلێری سەید مەجید، ئازاد سەگرمە، سامان گەرمیانی... تاد، لەگوندی (میریاسی خواروو) دەبن، شەوەکی دوو سێ پ. م بۆ بۆسە نانەوە دەچن. سەربازەکانی سوپای عیراق، پێش ئەوان لەوێ دەبن و هەردوولا دەست دەکەنەوە. دلێری سەید مەجید بۆی گێڕامەوە: ((هەموومان بڕیارماندا، لە لاپاڵێکی سەختی نزیک میریاسی، سەنگەر لێدەین و تا دوا فیشەک شەڕ بکەین! یەکێک لەکادرە عەسکەرییەکان گوتی: ئێمە هێزێکی بچووکین و ئەوان دەتوانن هەزاران سەربازمان لێکۆبکەنەوە و دەتوانین چەند سەعاتێک بەرەنگاری بکەین. لە شەڕی پارتیزانیدا ئەمە هەڵەیەکی کوشندەیە. دوژمن کات و شوێنی شەڕەکەت بۆ دیاری بکات. بەردەممان شیوێکی قووڵ و نەدیوە، خۆمان بەشیوەکەدا دەکەین و خۆمان لەم شەڕە نا بەرامبەرە لا دەدەین.))

هەواڵی شەهیدبوونی مامۆستا شەماڵ (حەمە ئەمین پۆلا)ی شاعیر، زۆر کاری تێکردم. شەماڵ پیاوێکی قسە خۆش، زمانپاراو، خوێندەوار و رووگەش بوو. لەوە دەچێت، ئەویش وەکو زۆربەی کادرە سیاسی و عەسکەرییەکان، بە قۆناخی مەشق و راهێناندا تێنەپەڕیبێت. زۆربەی کادرە عەسکەریەکان، لەناو ئاگری شەڕی پارتیزانیدا فێری بنەما و رێساکانی شەڕبوون، بەشەکەی تر بۆیان نەلوابوو، یان خۆیان لەسەر چەک بەکارهێنان رانەهێنابوو، لە ئەنجامدا زۆربەیان سەریان نایەوە..

لەدووکان بە مەلا بەختیار و دلێری سەید مەجید و سامان گەرمیانی و ئازاد... ئەوانی تر گەیشتین و هەر یەکە داستانی دەربازبوونی خۆی دەگێڕایەوە. دلێر گوتی: (( من لەبەر ئازاری قاچم نەمتوانی رابکەم، خۆم خستە ناو چەمەکەوە و لەناو زەل و گژوگیادا خۆمم شاردەوە. هەر لە بەیانیەوە تا ئێوارە بەرامبەر کیسەڵێکم گرتبوو، ئەو سەیری منی دەکرد و منیش سەیری ئەوم دەکرد. سەربازەکانیش بە ژوور سەرمانەوە بوون و بەدوای ئێمەدا دەگەڕان..)). دلێر پاش چوار رۆژ ئەندامیکێتری دەستەکە دەدۆزێتەوە.

# دوو کەس لەمردن رزگاریان کردم
## (٢٩)

شەوی ١٩٧٨/٣/٢٩ لەدێی سەرزەل نووستین. لەبری ئەوەی چاوەڕوان نەبین دونیا رووناکبێتەوەو شەوەکی هەستین و بڕۆین، بەرچایی کراو لەناو دێ ماینەوە. چێشتەنگاو، (سەرحەد دێوانە) یەکێک لەو دوو پێشمەرگەیە، کە لەسەر لووتکەی شاخێک(قوڵە ئاغاسی) پاسەوانی و چاودێرییان دەکرد، گەلە جاشێک دەبینێت، لەڕووی جێشانەوە سەردەکەون و نزیک گوندی (قەڵاسوورە) مۆڵ دەبەستن. ئەو دوو پێشمەرگەیە، هەردووکیان نوێ و بێ ئەزموون بوون. ئەوەندە ئەمسەرو ئەوسەریان کردبوو، جاشەکان، کە ژمارەیان (٨٠)ی تێدەپەڕاند، دڵنیا دەبن پێشمەرگە هێشتا دێکەی جێنەهێشتووە و ئەو دوو چەکدارە پاسەوانن! لەجێگەی خۆیاندا مۆڵ دەبەستن و بە (جیهاز) پەیوەندی بە سەرکردایەتی (لیوا)وە دەکەن و چاوەڕوان دەبن. هەلیکۆپتەرو سەرباز پشتیوانیان لێبکات.

ئێمە لای مزگەوتەکە نوکتەمان دەگێڕایەوە، کاتێک یەکێک لە پێشمەرگە (پاسەوانەکان) بەهەڵەداوان گەیشتە لامان و ئاگاداری کردینەوە، لەوەی جاشەکان لەبەرزاییەکانی رۆژهەڵاتی دێ، تۆپەڵ تۆپەڵ دانیشتوون و جوڵە ناکەن.

ئێمە (٥٣) پێشمەرگە بووین، بە پەلە لەدێ دەرچووین و رێگەی برایماوامان گرتەبەر. لەناوەڕاستی تەنگەکەدا، کە ناوی (دەربەند سەرزەل)ە، سیروان لە لاپاڵی رۆژاوای شاخی (قوڵە ئاغاسی) وەستاو بەدووربین سەیری ئەو هێزە چەکدارەی دەکرد و گوتی: ((ئەمانە جاشن و ماندوون و ئاگایان لە ئێمە نییە! ئێمە لێرە بۆسەیەکیان بۆ دەنێینەوە، ناهێڵین یەکێکیان بە

سەلامەتی دەرباز بێت. تۆڵەی شەهید ئارام و شەهید شەماڵ و مەلا ئەحمەدیان لێدەکەینەوە. لەشەڕەکەی (داریکەلی)دا چیمان لێکردن، لێرە خراپتریان لێبەسەر دێنین! ئێستا هەر هەموویان دێنە بەردەستمان، کارێکیان پێدەکەین با بە دەواری شەڕی نەکردبێت..)).

رۆستەم پێشنیازەکەی سیروانی بەدڵ نەبوو، پێشنیازێکی باشتری کرد: ((ئێرە شوێنی بۆسە نانەوە و شەڕ نییە. رۆژ زۆری ماوە و هێشتا بەیانی زووە. با لێرە بڕۆین و چاودێری جاشەکان بکەین. لە (دەربەند لار)ی لای تیمار، دەمەو ئێوارە بۆسەیان بۆ بنێینەوە چاکترە. ئەوان چاوەڕوانی هەلیکۆپتەر دەکەن و سەربازی سوپای عیراقیش بەهانایانەوە دێت. بەرزاییەکان دەگرن و ئێمەیش دەکەوینە ژێر رەحمەتی ئاگری ئەوانەوە..)).

سیروان گوتی: ((ئەوە جاشەکان، ماندوون و پاڵکەوتوون و ئاگایان لەئێمە هەر نییە! ئێمە لەم بەرزاییە بۆسە دەنێینەوە و ئەوان بەم رێگەیەدا دەڕۆن! ئێوە تۆزێک سەبر بگرن و بزانن قسەکەی من دەرناچێت!)).

قسەکانی سیروان بەهیچ شێوەیەک قەناعەتی رۆستەمی نەگۆڕی، پەستی دایگرت، بەڵام بەهێمنی سەرلەنوێ درێژەی بە بۆچوونەکانی خۆیدا: ((کاک سیروان گیان لێرە شەڕ ناکرێت! ئەوان چاوەڕوانی هەلیکۆپتەر دەکەن. ئەوان چۆن شەڕ دەکەن بەبێ ئاگادارکردنەوەی سەرووی خۆیان. ئێستا بەیانی زووەو رۆژ زۆری ماوە. بڕۆین بەرەو(دەرەبەند لار) چاکترەو ئەوان رەنگە دەمەو ئێوارە بگەنە ئەوێ. ئەوێ شوێنێکی قایمە و بۆسەیان بۆ بنێینەوە کاریگەرترە، چونکە ئاگایان لە بۆسەدانانی

ئێمە نییە. ئێستا ئێمەیان بینیوە، تۆزێکیتر هەلیکۆپتەر دەگاتە سەرمان و ئێمە هیچمان پێ نییە..)).

سیروان سوورتربوو لەسەر قسەکانی خۆی و ئامادە نەبوو بەموو لە قەناعەتەکانی خۆی لابدات: (( ئێستا دێنە بەردەستمان، کارێکیان پێدەکەین هەتا دونیا دونیابێ بیریان نەچێتەوە! لەداریکەلی چیمان پێکردن، ئەمجارە خراپتریان پێدەکەین..)).

دیاربوو گۆمی سەبری رۆستەم بەرەو ووشکبوونەوە دەچوو: ((کاک سیروان! من نە لەشەڕ دەترسم، نە لە هیچ شتێک! پێتوایە من دەترسم؟ ئەوان ئێمەیان بینیوە و پێنج دەقیقەی تر هەلیکۆپتەری دونیا دێنە سەرمان و یەک کەس لێرە نەمێنێتەوە! من لێرە دەمێنمەوە تا خوێنم تێدا مابێت شەڕ دەکەم و ئێرە چۆڵ ناکەم..)).

جاش بەرەو سەرزەل جولایەوە، بە تۆپەڵ دەڕۆیشتن و لەئێمە نزیکتر دەبوونەوە!

سیروان گوتی: (( ئەوە هاتن! ناهێڵین یەکێکیان دەرباز بێت. هەر هەموویان لەناو دەبەین..)).

سیروان قسەکانی تەواو نەکرد، هەلیکۆپتەر رووی کردە سەرزەل. دووانیان شەڕکەر بوون و چواریش سەرباز هەڵگر: هەلیکۆپتەرە شەڕکەرەکان وەکو داڵ بەسەر ئێمەدا دەسووڕانەوە! چوار بارهەڵگرەکەش، یەک لەدوای یەک، بەرامبەرمان لەسەر شاخی (قیبلە) سەربازیان دادەبەزاند، هەر (٩٠٠م) لەئێمەوە دووربوون! سیروان روویکردە رۆستەم و گوتی: ((تا زووتر بڕۆین باشترە! هێزەکە یەکجار زۆرە و خەسارەتێکی زۆر دەدەین. بە ڕاستی ئێرە جێگەی شەڕ نییە.. وامزانی جاشەکان ئێمەیان نەبینیوە..)).

ڕۆستەم توورەبوو، گوتی: (( من لەبەیانییەوە چیت پێدەڵێم! ئەمە سەعاتێکە چەنە ئەکوتین ودەڵێین: کاک سیروان ئەوان ئێمەیان بینیوە و بۆسە نانرێتەوەو ئێستا هەلیکۆپتەر دێت! تۆ واتدەزانی من دەترسم. ئێوە بشڕۆن من نایەم. دەبێ لێرە بکوژرێم، نابێ ئێوەش بڕۆن..)).

سیروان لە پشت (برایماوا)وە بەرەو شاخی (گڵەزەردە) رۆیشت و زۆربەی پێشمەرگەکانیش بەهەمان ئاڕاستەدا، بە پەرش وبڵاوی، کەوتنە پشت برایماواوە.

من لەچاو سیروان و ڕۆستەم و هیوا باڕۆیی، لەبنەما و ڕێساکانی شەڕی پارتیزانی هیچ شارەزایەکی ئەوتۆم نەبوو، بە ووردی گوێم لەوان دەگرت و بەچاوی خۆم دەمبینی، هەلیکۆپتەرەکان لەسەر بەرازییەکەی بەرامبەرمان سەرباز دادەگرن و دەگەڕێنەوە..

بە سیروان تاڵەبانیم گوت: (( ئێوە بڕۆن من لەگەڵ دەبابەی گەرمیان دەمێنمەوە..)).

ڕۆستەم و ساڵحی حاجی عەبدول و عەلی شەریف مانەوەو سێبەری پەروانەی هەلیکۆپتەرەکان، بەسەر داربەڕووەکاندا دەخولانەوەو سەمایان دەکرد، تا دەهات بازنەی سووڕانەوەکەیان تەسکتر دەبووەوە.

ئێمە، ئەم چوارە و دوو سێ پێشمەرگەیتریش چەند هەنگاوێک لێمانەوە دووربوون، لەسەر لاشانی تەنگەکەبووین. ڕۆستەم گوتی: ((با خۆشمان بڕۆین، بە چوار کەسەوە ناتوانین بەرامبەر ئەم هەموو جاش و سەربازو هەلیکۆپتەرە بگرین..)).

ئەوان لەمن خێراتربوون، تا من دوو هەنگاوم بەرەو خوارە دەنا، ئەوان بەچوار قەڵمباز گەیشتنە شوێنێکی تەختایی رووتەن، کە دەکەوێتە خوارووی (گردە درێژ) و ڕۆژاوای برایماوا.

هەلیکۆپتەرەکان بە گیری هێنان و ئەو ناوەیان کردە ئاگرباران و تەپ و تۆز. من بینیمن، کاتێک هەلیکۆپتەرێک دەستڕێژێکی پێداکردن هەرسێکیان تەپاوتل بەسەریەکتریدا کەوتن . سەرەتا من شان بەشانی ئەوان رامدەکرد، جامانەکەم، بە لقی دار بەڕووێکەوە خۆی هەڵواسی. لەناو کوردانەدا کڵاوجامانە لێبەجێمان، حەیاچوون و کارەساتە. سێ چل شەقاو سەرکەوتمەوە و جامانەکەم لە لقی داربەڕوەکە کردەوە و بەسەرمەوە بەست. هەلیکۆپتەرەکان هاتنە سەر منیش و دایانبێژام. نە بواری راکردن هەبوو، نە شوێنێکشم بەدیکرد خۆمی تێبهاوم. ئەمیان دەڕۆیشت و ئەویدیکە دەهاتەوە، بە شێوەیەکی بازنەیی. چاوەڕوانی ئەوەش بووم جاش و سەربازەکان، پاش چەند دەقیقەیەکیتر بگەنە سەرمان.

رۆستەم و سالح و عەلی، کەوتبوون. رۆستەم بە سەختی بریندار بوو، سالح لە پەنجەکانی پێی دابوو، نیوەی پێی پەڕاندبوو، عەلی شەریفیش ژمارەیەک پارچە لێیدابوو! کۆپتەرەکان ئەوەندە نزم بوونەوە، سالح ویستبووی بە سیمینۆف چەند فیشەکێکی پێوە بنێت. لەو کاتەدا رۆستەم دەستی راستی بەرز کردبووەوە بەحیسابی خۆی بە سالح بڵێت: تەقە مەکە! پەنجەی ئەو خێراتربوو، سێ فیشەک دەستیان ئەمدیو و ئەودیو کردبوو. هەلیکۆپتەرەکان ئەوەندە نزم بوونەوە، بەتەمابوون، پشتملمان وەکو قاز بگرن. رۆستەم بەو برینداری و خوێن لەبەر رۆیشتنەشەوە، ئار بی جی RBG خستبووە سەر باسکی راستی و بەدەستی چەپی گوللەیەکی بە یەکێکیانەوە نا! دووکەڵی لێهەڵساند، دوایی زانیمان لای تانجەڕۆ کەوتۆتە خوارەوە. هەلیکۆپتەرەکەیتر تەواو بەرز بووەوە و کەمتر تەقەی دەکرد.

رۆستەم[*] و ساڵح و عەلی بەو هەموو برینەوە، بە قرخە مەرەسی بۆ ناو دێ خۆیان کێشکرد. هەر یەکە روویکردەماڵێک، لەو گوندە زۆر بچووکەدا خۆیان شاردەوە. خەڵکی گوندەکە زۆر رەوشت بەرزو مرۆڤ دۆستبوون و ئینکاریان کردبوو کە پێشمەرگەی برندار لەناو گوندەکەدا بن.

سەرم لەناو خۆڵ و تەپ و تۆزدا بە ئاستەم دەبینرا، لەناوەڕاستی چوار پێنج دەوەن و شەخەڵدا لە جوڵەیان خستبووم، هیوا بارۆیی بە باوکەڕۆو هەڵەداوان لەسەر سەرم پەیدابوو، هەر هاواری دەکرد: ((مامۆستا گیان ماوی! مامۆستا گیان ماوی!)). یەکسەر هەستام و گوتم: ((زۆر سوپاس کاک هیوا گیان ئەرێ وەڵڵا ماوم!)).

هێدمە و شڵەژان و هەوری پەشۆکاوی هێشتا بەرینەدابوو: ((من دڵنیام نەماوی!)).

منیش دەستم کردە پێکەنین و گوتم: ((ئەوە نییە بە بەرچاوتەوەم و راوەستاوم و ماوم..)).

هیوا گوتی: (( بەچاوی خۆم هەلیکۆپتەرەکەم بینی لێتی دا و بەرزی کردیتەوە! کوێت بریندار بووە؟)).

گوتم: ((من بریندار نیم!)).

هیوا گوتی: (( چۆن بریندار نیت؟ من بەچاوی خۆم بینیم تۆی کردە بێژنگ! جارێ گیانت گەرمە و ئاگات لەخۆت نییە. من دڵنیام تۆ برینداریت!)).

---

[*]رۆستەم: حەسەن حەمید، سەرووی دوو سەد پارچەی وردودرشت بەری کەوتبوو، تا ئەم ساڵانەش هەر پارچەیان لێدەر دەکردو هێشتا بەشێکیان لەگیانی دەرنەکردووە.

ئەو هەر لەتەپڵی سەرمەوە سەیری دەکرد تا بنی پێم: ((چۆن لەم هەموو ئاگرباران و ساروخ تێگرتنە، نە فیشەک و نە پارچەت بەرنەکەوتووە؟)).

من گوتم: (( ئێستا جاش و سەرباز دەگەنە سەرمان، با زوو بڕۆین، قسەکردن سوودی نییە!)).

برایماوا و بارۆیی دراوسێن. هیوا باش شارەزای بست بە بستی ئەو ناوە بوو. سەرەتا ئێمە ویستمان بکەوینە پشت برایماوا و بۆ لای دەستەکەی خۆمان بچین. جووتیارێک بەردەمی گرتین و گوتی: (( بیکەنە راهی خوا، سێ پێشمەرگە بریندارن، تا دەتوانن دووربکەونەوە، بۆ ئەو خوارە بڕۆن بۆ ئێوە سەلامەت ترە)).

رۆستەم لەماڵی حاجی مەجید، لەناو کادێندا خۆی حەشاردابوو. پاش ماوەیەک جاشەکان تا بەردەم ماڵی حاجی مەجید. بەدوای خوێنەکەی رۆستەمدا رۆیشتبوون. لەوێ لەدەرگایان دابوو، کەس دەرگای بۆ نەکردبوونەوە. ئەوانیش ماڵەکەیان بەر گوللە دابوو. خەڵکی دێ بەدەنگ ماڵی حاجی مەجیدەوە چووبوون. جاشەکان گوتبوویان: (پێشمەرگەیەک بریندارەو لەم ماڵەدا خۆی حەشار داوە. ئەمە هەمووی خوێنی بریندارەکەیە و دەرگامان لێناکەنەوە ئەو بریندارە بگرین). بەتۆپزی دەرگای حەوشەکە دەکەنەوە. سەیر دەکەن خوێنێکی زۆر لەناو حەوشەکەدا پژاوە. بەڵگە لەسەر بەڵگە، یەک گومان لەدڵی رەشی جاشەکاندا نامێنێتەوە! فڕۆکەوانەکەش لەولاوە دێ، پاش ئەوەی دێ بەتەواوی کۆنترۆڵ دەکرێت و هەلیکۆپتەرەکەش دەنیشێتەوە. ئەویش دەڵێت: سیانم پێکاوە و یەکێکیان خۆی بەم ماڵەدا کردووە و خۆم بە چاوی خۆم دیم

لەم دەرگایە هاتە ژوورەوە! بەرامبەر ئەم هەموو بەڵگانە کەس قسەی پێنامێنێت و جاشەکان قسەیان سوار دەبێت!

ریزێک بەڵگە و شایەت لەجەنگەی ئاگربارانەدا..

دایە خاوەر، کە ژنێکی ژنانەی ئازاو بەغیرەت دەبێت، وەکو شێریکی بریندار لێیان دەردەپەڕێت و هەزار جوێنیان پێدەدات و قسەی سووکیان پێدەڵێت:

((ئێوە دوو منالّی کەڕولالّی منتان بریندار کردووە، فەرموون وەرن بیان بینن. ئێوە خوێنی کوڕو کچێکی کەڕولاڵتان رشتوە! پێشمەرگەی چی و برینداری چی؟ ئێوە شەرم ناکەن؟ دوو منالّی کەڕولالّی بەسەزمان لەناو کۆلان یاریان کردووە، بریندارتان کردوون! ئەم هەموو سوپاو هەلیکۆپتەرە هاتووە دوو منالّتان لێبۆتە پێشمەرگە و ئێستا داوای بریندار لە ئێمە دەکەن؟..)).

هەردوو منالّەکەیان بۆ دەهێنێت، کە خەڵتان خوێن کراون و پیشانیان دەدات و بەسەریاندا دەقیژێنێت...

رۆستەم پاشان بۆی گێڕامەوە:

(( لەناو کادینێکی تاریکدا بووم، پەنجەم لەسەر پەلەپیتکەی کلاشینکۆفەکەم بوو. جاشەکان لەبەردەم دەرگای کادینەکەدا مۆڵیان بەستبوو. دوو سێ هەنگاوێک لەیەکەوە دووربووین. چاوەڕوان بووم، ئەوان خۆیان بە ژوورابکەن و منیش مەخزەنە حەفتاو پێنجیەکەیان تێدا بەتاڵ بکەم..)).

شەو هەموو یەکترمان گرتەوە. بریندارەکان بۆ گوندی گوڕباز گوێزرانەوە. رۆستەم خۆشبەختانە بەرە بەرە چاکبووەوە. صالّحی حاجی عەبدولیش بەداخەوە تووشی گانگرین بوو، پاش ماوەیەک شەهید بوو.

# ماچ
# (٣٠)

**لەبت میم و، قەدت ئەلف و، زوڵف چیم**
**دەزانی بەم سییانە طالیبی چیم**

**نالی**

کیژێکی کەڵەگەت، سوورو سپی، ڕوومەت گەش، قژزەرد و مەیلەو خەنەیی، لێوی وەکو دەنکە هەنار، دەم بە پێکەنین، تەمەنی هەژدەساڵی تێنەپەڕاندبوو، لەپڕ باوەشی پێداکردم و دەمی خستە ناو دەمەوە، لێوەکانمی هەڵمژی، هەردوو باسکی لە ستۆم ئاڵاند و بەتوندی خۆی پێمەوە نووساند. هەر لە شاجوانەکانی هۆلیۆد دەچوو. نەمزانی ئەمە حۆری بەهەشتە و دابەزیوە، یان پەری دەریایە و دەشت و کێوی داوەتەبەر؟ سەیری ناوچەوانیم کرد، خەریک بوو، لەناو کراسەکەی دەردەپەڕی.. خەریک بوو، دەستم بگرێت و بۆ پەنایەکم بەرێت.. ئای خودایە! ئەمەیە جوانی! نە سووراوو سپیاو، نە چاوڕشتن و برۆ هەڵگرتن. مەمکەکانی لەگەڵ هەناسەداندا بەرەو سەرەوە خوار سەمایان دەکرد.

بـەیانی زوو لـە (دێلێـژە)* دەرچـووین، ریزمـان بەسـتبوو، بـەدوای یـەکتردا ملـی ڕێگـای قازانقایـەمان گرتبـوو. دێلێـژە لەناوەڕاستی شاخ دروستکراوە! کە لەدێ دەردەچیت، بەشێکی فراوانـی قـەرەداخ دەبینرێـت. چەنـد دێیـەکمان تێپەڕانـدا، گوڕبـاز، مێوڵی،.. ڕێگـای نـاو دێکـە زۆر تەنگەبـەر و باریـک بـوو، بـە بـن دیـواری ماڵەکانـدا، بـەدوای یـەکتردا، ڕێچکـەمان بەسـتبوو. مـن سـەیری دارسـتان و بنـاری بـەرانانم دەکرد، دیوارەکـان بـە بـەرد چین لەسـەر چین هەڵچنرابوون، دیوی چەپیشمان وشـکە کەڵـەک بـوو، لـەپڕ دەسـتێک لـەناو دیوارەکـەوە دەرچـوو، هـەروەکو بروسکە بنباڵی گرتم و رایکێشام. توند توند ماچی کردم و دەمی خستە ناو دەمەوە.

کیژێکـی کەڵەگـەت، سـوورو سـپی، ڕوومـەت گـەش، چـاو سیحراوی، قژزەرد و مەیلەو خورمایی، لێوی وەکو دەنکە هەنار، دەم بـە پێکـەنین، تەمـەنی هـەژدە سـاڵی تێنەپەڕانـدبوو، لـەپڕ باوەشـی پێـداکردم و دەمـی خسـتە نـاو دەمـەوە، لێوەکـانمی هەڵـمژی، هـەردوو باسـکی لـە سـتۆم ئاڵانـد و بەتونـدی خـۆی پێمەوە نووساند. نەمزانی ئەمە حۆری بەهەشتە و دابەزیوە، یـان پەری دەریایە و دەشت و کێوی داوەتەبەر.. سەیری ناوچـەوانیم کرد، خەریک بوو، لـەناو کراسـەکەی دەردەپـەڕی.. خـەریک بـوو، دەسـتم بگرێـت و بـۆ پەنایـەکم بـەرێت.. ئـای خودایـە! ئەمەیـە جـوانی! نـە سـووراوو سـپیاو، نـە چاوڕەشـتن و بـرۆ هـەڵگرتن.

* لەبەری مەرگەش دێلێژەیەکی ترمان هەیە.

مەمکەکانی لەگەڵ هەناسەداندا بۆ سەرەوەو خوارەوە سەمایان دەکرد.

ئەو ویستی دەستم بگرێت و بۆ شوێنێکی تر رامرفێنێت. من ئەوەندە هێدمە گرتبوومی پەشۆکابووم و ئەوەندە ناشی و نەشارەزابوم گوتم: ((ئەوە چی دەکەیت؟)).

ئینجا ئەو تێگەیشت، کە زارەکەی بەهەڵە هەڵداوە!

ئەویش بە ساردییەوە گوتی: ((ببورە وامزانی مام رۆستەمی....)).**

ئێستا کە بیر لەو دیمەنە دەکەمەوە، دەزانم من چەند دواکەوتووبووم و وەکو پاژێک لە پێشمەرگە رۆمانسیە ناشۆڕشگێڕەکانی ئەوسا، چەند بەهەڵە لەژیان و لەبیروباوەڕ تێگەیشتبووم. هەقە دادگای شۆڕش لەسەر لوتکەی پیرەگروون بڕیاری هەڵدانە خوارەوەم بۆ دەربکات!

---

** من بڕوا ناکەم مام رۆستەمی ناسیبێت، هەر بۆ خۆ دەربازکردن ناوی ئەوی بەسەر زماندا هات.

# دوا گەشتی گەرمیان
# (٣١)

بۆ دیوی گەرمیان سەر لەنوێ گەڕاینەوە. سەرەتای نیسان بوو: بەڵام ڕۆژێکی گەرم، سەری کەچەڵی دەسووتاند. لەسێبەری تاشە بەردێکی دیوار ئاسادا دانیشتبووین. تاشەبەردو ڕەوەزو چەقەنەکان پشتیان بە زەردەوە دابوو. بە نۆرە، دووربینەکەمان بەدەستەوە دەگرت، لەهەموو تارمایی و جموجۆڵێک ورد دەبوینەوە: توولەڕێ، هەرد، هەڵەت. ئەم شوێنە لەئاستی پەیکوڵیدا بوو، بەسەر دەشت و هەردەلاندا دەیڕوانی.

ڕزگار بەکر بایەفی وێڕای کوڕێکی گەنجی باریک و بۆڕەڵە دەرکەوتن. ڕزگار برنەوێکی کورتی دارشووشەی پێبوو، هاوڕێکەی چەکی پێنەبوو، لەوە دەچوو ئاشنای یەکتر بن. سیروان و هەژار و نەریمان لەسێبەری دەوەنێکدا فسکە فسک و چپەچپیان بوو. من و ئازای شێخ ڕەئوف (پاشا) و چەند پێشمەرگەیەکیتر، خەریکی شیکاری دەنگوباس و نوکتە گێڕانەوە بووین.

بەخێرهاتنی ڕزگارو هاوڕێکەی کرا. پێشمەرگە نوێکە ناوی (عەبدوڵڵای عەلی فەرەج)بوو. ئەویش هاوڕێ و هاوگوندی ڕزگاربوو، جارێ ناوی بۆ نەدۆزرابوەوە. ڕزگار گوتی: کوڕێکی باشە و دڵسۆزە. زۆر شادمان بووین کاتێک زانیمان شوان بووە. ئەو گوێی لەگفتوگۆکانی ئێمە نەبوو، بایەخی بە قسەکانمان نەدەدا. شانی بە گابەردێکەوە دابوو، تەسبیحێکی قەزوانی ئەبڵەقی بەدەستەوە بوو، تەسبیحەکەی بەدەوری پەنجەی شایەتماندا بادەدا، لەبەرخۆیەوە، بەدەنگێکی بەرز، ئەم

گورانییەی دەیان جار وەکو قەوانێکی شکاو دووبارە و دەبارە دەکردەوە:

ئەگەر ئەزانی شووەکەت خراوە

وە جامێ دەرمان لایدە لەم ناوە!

بە ئازام گوت: ((باش گوێ لەم گۆرانییە بگرە! بیست سی ساڵیتر ئەگەر ماین و نەمردین، بیرت دەخەمەوە، بزانە بیرت ماوە!)). ئازا دەستی بە ورگیەوە گرتبوو، بە شێوەی گۆرانیی وتنەکەی (عەبدوڵلا) پێکەنینی دەهات. ئەو بڕگەکەی دووبارە و سێبارە دەکردەوە. کاتێک دەگەیشتە سەر دێڕی دووەم، بە ئەوپەڕی حەماسەوە دەیگوت:

وەجامێ دەرمان لایدە لەم ناوە

لایدە لەم ناوە!

بەدەستی راستی بازنەیەکی دروست دەکرد، بە ئیشارەتی ((دەرکردن)) و بەدەنگی ((لایدە)). مرۆڤ لەمێشکی خۆیدا وێنای دیمەنێکی درامی لا دروستدەبوو، عەبە بەرامبەر ژنەکەی گرتووە و داوای لێدەکات، بە (جامێ ژەهر) مێردەکەی خۆی بکوژێت و لەو ناوە لایدات و رێگا بۆ ئەم چۆڵ بێت.. عەبە ئەم گۆرانییەی لەکەناڵێکی ئاسمانی ئەورووپی بگوتایە، تووشی سزاو زیندانی دەهات..

ئازا بە عەبدوڵلای گوت: (( ئەرێ کاکە! ناوێکت بۆ خۆت هەڵبژاردووە، لەمەودوا بەو ناوەوە بانگت بکەین؟)).

عەبدوڵلا بەتووڕەییەوە: (( من هیچ ناوێکم بۆ خۆم هەڵنەبژاردووە!)).

ئازا گوتی: ((رێبوار چۆنە؟)).

عەبدوڵلا: (( من حەزم لەناوی رێبوار نییە!)).

گۆران: ((هۆشیار ناوێکی خۆشە!)).

عەبدوڵڵا: (حەزم لەناوی هۆشیاریش نییە!)).
دلێر: (( نەبەز ناوێکی گونجاوە؟)).
عەبدوڵڵا: (کاکە! من حەزم لەناوێکی کوردییە!)).
رزگار: ((رێبوار! هۆشیار! نەبەز! کوردی نین؟)).
عەبدوڵڵا گوتی: ((نەوەڵڵا نە رێبوار، نە هۆشیار، نە نەبەز هیچیان کوردی نیین! من حەزم لەناوێکی کوردیە!)).
ئازا گوتی: ((تۆ ئەڵێی ئەم ناوانە کوردی نین! تۆ خۆت ناوێکی کوردیمان پێی بڵێ؟)).
عەبدوڵڵا: ((فازیل ناوێکی کوردیە!)).
خالید گەرمیانی: ((فازیل ناوێکی عەرەبییە!)).
عەبدوڵڵا: ((کاکە ئێوە نازانن فازیل ناوێکی کوردییە و بڕایەوە!)).
ئیدی لەو رۆژەوە عەبدوڵڵا ناوی خۆی دەستکەوت و هەر بە (فازیل) بانگ دەکرا. کێشەکە ئەوەبوو، هەر جارێک یەکێک بانگی (فازیل)ی بکردایە، هەردووکمان بە یەکەوە گوێمان قوت دەکردەوە. بەهۆی عەبدوڵلاوەو کە ئەم ناوە جوانەی بۆ خۆی هەڵبژاردبوو، زۆربەیان ئەو راستی و رازەیان زانی، کە (مامۆستا جەعفەر) نازناوە و (فازیل) ناوی راستەقینەیە!
رۆژێکیان دووکەس بۆ پێشمەرگایەتی هاتن و هەردووکیان زۆر هاوڕێی یەکتر بوون. سیروان بە یەکێکیانی گوت:
((ناوی تۆ دەنێین سەلیم!)).
هاوڕێکەی یەکسەر گوتی: (( تو خوا ناوی منیش بنێن سووک! سووک و سەلیم! چونکە ئێمە زۆربەی کات پێکەوەین، ئیتر با خەڵک بڵێت: ئەرێ وەڵڵا سووک و سەلیم هاتن...!)).
پیشمەرگە و کادری سلێمانی زۆر حەزیان لە نوکتە و قسەی خۆش بوو. نوکتە و قسەی خۆشی گەرمیانییەکان جیاواز بوو.

# گۆڕی ئەسپ
# (٣٢)

ماوەیەک لەدەستە چەکدارەکەی گەرمیان دوورکەوتمەوە. ئامانج بەهێزکردنی کاری ڕێکخستن و فراوانکردنی تۆڕی دۆست و لایەنگران بوو. بە شەو وێڕای یەکێک لە ئەندامانی ڕێکخستن، دێ بەدێ دەگەڕاین، شانەو ئەندامانی ڕێکخستن بەسەر دەکرانەوە. جوتیاران بۆ شۆڕش و ریزەکانی ڕێکخستن هاندەدران. بەرۆژ نەدەچووینە دێهات و نەماندەهێشت کەس شوێنمان پێبزانێت، لەدەشت و چۆڵ، زەویمان دەکردە رایەخ و بەرد سەرین و بە ئاسمان خۆمان دادەپۆشی و خەومان بەرۆژی سەرکەوتنەوە دەبینی.

لەگۆڕیئەسپ، مام ساڵح سەرپەرشتی ڕێکخستنی کۆمەڵەی دەکرد. پیاوێکی پاک، سەرڕاست، قسە لەڕوو، دەم و لەبز شیرین بوو. پشت و پەنای هێزی پێشمەرگە بوو. براکەی باوکیشی پێی خوار دابنایە چاوپۆشی لێنەدەکردو بە توندیش بەگژیا دەچوو! حاجی ئەحمەد، براگەورەی مام ساڵح و گەورەو دەمڕاستی تیرەی (مامۆیی) بوو کە بەشێکن لەجاف. حاجی ئەحمەد هەر خۆی حاجی ئەحمەد بوو، سوارچاکی کەموێنە، قسەزان، زمانپاراو، هەرچی کێشەی کۆمەڵایەتیی ناوچەکە بوایە، لەدیوەخانەکەی حاجی ئەحمەدی گۆڕیئەسپ چارەسەر دەکرا.

دەمەو ئێوارانێک، لەگەڵ عەلی گۆڕیئەسپی، لە گەشتێکی سێ چوار رۆژیی گەڕاینەوە. لە سیلەی ئاواییدا، چل پەنجا پیاوێک

دانیشـتبوون. حـاجی ئەحمـەد بـە دەنگێکـی زوڵاڵ قسـەی بـۆ دەکـردن. ئـەوانیش هــەر هــەموویان، سـەیری دەمـی حـاجی ئەحمـەدیان دەکـرد، ئێمـە ئـەو خەڵکـە زۆرەمـان بینـی دەبوایـە سڵاویان لێبکـەین و بەشداری کۆڕەکـە بکـەین تـابزانین، لـەناو کۆڕو دیوەخانی گۆڕیئەسپیان چ باسە؟

حاجی گوتی: ((سـەرەتای پایزی رابووردوو، سوپای عیراق روویکردە ئەم گەرمیانە، دێ بە دێ، هـەر هـەموویان داگیر کرد. پیـاوی ناوچەکـەیان هـەر هـەموو لـەم دەشـتە کـۆکردەوە. قایـد فیرقـە، پاش هەڕەشـە و گوڕەشـە، گوتی: ((کێ دەمڕاسـت و بـرا گەورە و پیاوماقووڵی ئێوەیە؟)).

هەر هەموو گوتیان: ((حاجی ئەحمەدی گۆڕیئەسپ!)).

قاید فیرقەکە گوتی: ((حـاجی تـۆ پیـاوێکی بـە تەمـەن و دونیا دیـدەی، وەرە بـۆم بـاس بکـە: بـۆ کـورد چـەک هەڵـدەگرێت و دەچێتە شاخ؟)).

بەعــەرەبیش ئەوەنــدەم لــەبیرە، گــوتی: ((شــنو مشــکلة الاکـراد؟)).* منـیش راسـت و ڕەوان پێمگـوت: ((حکومـەت خـراو، فەلاحیش نەگوەت!)).**

حاجی ئەحمەد پیاوێکی دووربین و زیـرەک بـوو، قسـەی نـاو دڵ و سـەرزمانی یـەکێک بـوو. ئـەو لـەو پیاوانـە نـەبوو بەرامبـەر بەرپرسی گەورەی حکومەت سڵبکاتەوە و بپرینگێتەوە و تەنیا بە شـان و بـاڵی حکومەتـدا هەڵبـدات. کێشــەی کـوردی دەسـتۆی

---

* کێشەی کورد چییە؟

** خـراو: خـراپ، بـەد/ نـەگوەت: لـە (نکبـة) ی عەرەبییـەوە وەرگیـراوە: نەگبـەت، ماڵوێران، سەر لێشێواو.

حکومـــەت هاویشـــتبوو، بەشێکیشـــی خســـتبووە ئەســـتۆی جووتیـاران. هاوکێشـەکە لای ئـەو روون بـوو: ئەگـەر جووتیـار ناهۆشیارو دواکەوتوو نـەبێت، بەرامبـەر سیاسـەتی لارو لـەوێرو ناڕەوای رژێم، هەر یەکسەر دەست بۆ چەک نابات!

ئێمـــە هەســـتاین بـــڕۆین و خواحافیزیمـــان کـــرد. چەنـــد هـــەنگاوێکمان نـا! حـاجی ئـەحمەد بـانگی عـەلی کـردەوەو ئـەم پرســـیارەی دەربـــارەی ناســـنامە و کەســـایەتی بەنـــدە لەعـــەلی کردبوو:

حاجی ئەحمەد: ((عەلی رۆڵە ئەم پیاوە لای ئێمە ناسراو نییە و کەس نایناسێت ئەمە کێیە، کە تۆ هاوڕێیەتی دەکەیت؟)).

عـەلی گوتبـووی: (ئـەم پیـاوە نـاوی فـەقێ ئەحمـەدە و کـاری قەساوی دەکات و من یارمەتی دەدەم!)).

حاجی ئەحمەد، کە پیاوێکی دونیادیدە و خاوەن ئەزموون و سەرناس بوو، هەر یەکسەر بە عەلی گوتبوو: ((ئەمە قەساوە؟)).

عەلی: ((بەڵێ مامە! کاسبە و قەساوی*** دەکات!)).

حـــاجی ئەحمـــەد گوتبـــوو: ((یـــان حـــاجی ئەحمـــەد مێشـــک لەکەللەیدا نییـە، یـان ئـەم پشـت کنگـە و پشـت کنگـی قەسـاویان نەوتووە! ئەمە قەساو نییە!)).

---

*** قەساو: قەساب: لەگەرمیان ئەو کەسەی بەکاری حەیوان کڕین و فرۆشتنەوە خەریکە.

# هەلیکۆپتەرێک

# لەمردن رزگاری کردین

# (٣٣)

پێکەوە بۆ ناو دێ گەڕاینەوە، بە بێ لەدەرگادان خۆمان بە ماڵی مام ساڵحدا کرد. زۆری پێنەچوو، پێشمەرگەکانیش دەرکەوتن و مام ساڵح بەچرکەیەک، بەسەر ماڵاندا دابەشی کردن. ئەو شەوە سیروان، دەستەیەک (پ. م)ی رەوانەی ئاوایی (بەکر بایەف)*کرد، کە لەگەڵ (شێخ تەویل)و گۆڕیئەسپ دراوسێ دێن. هەریەکە سێ چارەک سەعات بە پێ لە یەکترەوە دوورن!

شەو لە(گۆڕیئەسپ) رۆژمان کردەوە!، بەرچاییمان کردو لەناو دێماینەوە. گۆڕیئەسپ لەچاو سەرزەل دەشتایی و تەختە و شوێنی مانەوە نییە. ئێمە ناچاربووین بمێنینەوە، هەروەکو رووداوەکەی سەرزەل گوێمان بە مەترسی و پەلاماری سوپا وجاش نەدا. هەروەکو رووداوەکەی (سەرزەل) کە (دە) رۆژ پێشتر روویدابوو. لێرەش بەهەمان شێوە پێوەبووین! سێ کەسی (بەکر بایەف) جاش و پیاو خراپ بوون و لەکەلار دەژیان! سێ پیاو خراپ، خاڵێکی لاوازە، رەنگە سێ (شانەی نووستوو) یان لە (بەکر بایەف)دا هەبێت زانیاریان بۆ رەوانە بکات.

لەبری ئەوەی نیوە شەو بڕۆین، بۆی نووستین و بەکاوەخۆ بەرچاییمان کردو لەناو ئاوایی کۆبووینەوە. نزیکەی (١٨)

---

* بایەف: جۆرە دارێکە، گەلاکەی قەڵەمیە نەک پان.

هەلیکۆپتەری سەربازهەڵگر و شەڕکەر ئاسمانیان داپۆشی. کەوتینە پەلە پڕوزێ و هەوڵی خۆ دەربازکردن. سەرەتا لەسەر (بەکر بایەف) وەکو داڵ و سیسارکە کەچەڵە دەسووڕانەوە. شەڕکەرەکانیان راستەوخۆ رووەو گۆڕیئەسپ هاتن. ئێمە کەوتینە خۆمان و بووە فڕکان فڕکان و راکردن بەرەو رۆژئاوای گوندەکە! مام ساڵح تا دەمی شیوێکی رووتەن رێنوێنیکردین. گۆران ئەسپێکی سپیی پێبوو، لەدووریی پێنج کیلۆمەترەوە دەبینرا! بەناو شیوەکەدا، بەدوای یەکتردا راماندەکرد. گۆران بە سواری ئەسپەکەی لەناوەڕاستماندا بوو. من و شاهۆ پێکەوە بووین و گۆران بە سواری ئەسپە سپییەکەیەوە، بە نەرمە دەڕۆیشت! هەلیکۆپتەرەکان بە ئاسمانەوە پاش و پێشیان لێگرتین و دەسووڕانەوە و نزم دەبوونەوە، شاهۆ زۆر پەست بوو، جارێک جوێنی بە گۆران دەدا و جارێک بە سیروان: ((ئای سیروان و گۆران، شاخی زەردە هەیە، لەم دەشتایی و راساییە مینەی* مار ئەکەن؟)).

دیسان دەستی پێدەکردەوە:

((گۆرانە تڕە، ئا ئەم ئەسپە حیزە چییە دوای ئێمەت خستووە؟ ئەم ئەسپە ئەوەندە سپییە لەحەوت تەبەقەی ئاسمانیشەوە دیارە! توخوا پێشمەرگەو ئەسپیان وتوە؟ رێوی خۆی بە کونەوە ناچێ هەژگێکیشی بە کلکی خۆیەوە بەست..)).

هەلیکۆپتەرەکان نزمتر بوونەوە، بەبێ ئەوەی دەستڕێژ بکەن. ماوەیەکی کەم دوورکەوتینەوە و کۆتایی شیوەکەمان لێوە دیاربوو، ئەولا وەکو ئێرە سەخت نەبوو. تا چاو هەتەری دەکرد

---

* مینەی مار ئەکەن: بە دوای ماردا دەگەڕێن

دەشت و هەردەڵان بوو. شوێنێکی سەخت نەبوو، لەوێ سەنگەر لێدەین و بەرەنگاری بکەین. بڕیارماندا دابەش ببین و هەر دووکەس لەسەر تەپۆڵکەیەک بەرامبەر هەلیکۆپتەر بگرین. ئەسپەکەی گۆران چەند هەنگاوێک لێمانەوە دووربوو، دەیحیلاند و هەر دوو چەپۆکی بەرەو ئاسمان رادەوەشاند، شاهۆ تووڕەتر دەبوو.

((گۆران ئەم ئەسپە دوور بخەرەوە، بۆ کێوی قافیش بڕۆین ئەم ئەسپە بێفەڕەی تۆ ئاشکرامان دەکات.. ئەرێ ئەم هەموو هەلیکۆپتەرە بەئاسمانەوە نابینی..؟)).

هەر هەموو چاوەڕوانی یەکەم دەستڕێژ و تەق و تۆقمان دەکرد. شەڕی مان و نەمان! سێبەری هەلیکۆپتەرەکان، تاڕادەیەک لەتیشکی هەتاو دەیپارستین. لەپڕ گوێمان لەگرمە و ناڵەیەکی مەزن بوو، هەلیکۆپتەرێکی سەربازهەڵگر لەنزیک (بەکر بایەف) خۆی بە کەندەڵانێکدا کێشاو کەوتە خوارەوەو دووکەڵی لێهەڵسا. هەرچی هەلیکۆپتەر بەئاسمانەوە بوو، بۆ دەروبەری بەکر بایەف بایانداوە.

ویستمان بڕۆین، لەدوورەوە رەوەیەک جاش (١٥٠) کەسێک دەبوون، لەو سەرەوە هاتن، بەحیسابی ئەوەی لە پێشەوە سوپا وجاش، لە ئاسمانەوە هەلیکۆپتەر، لە پشتیشەوە هێزێکی جاش. شاهۆ گوتی: ((سیروان جارێکیتر من یەک هەنگاو لەزەردە دوورناکەومەوە..)).

# تەپکە لەدوای تەپکە

## (٣٤)

شارەزایی تۆپۆگرافی لەسەر ناوچەیەک، نەخشەی سەربازی نوێ و زانیاری ڕێگاوبان بۆ هێزی پ. م هەر یەکجار پێویستن. ئێمە لەگەرمیان، قەرەداخ، پێویستیمان بە ڕێزان نەبوو پێشمان بکەوێت، زۆربەمان خەڵکی ناوچەکە بووین. بەشەوو بەرۆژ ئەوەندە هاتوچۆمان کردبوو، شارەزای کون بە کونی ناوچەکە بووین. هەر لەوێ دەرچووین، وەکو حوشتری کوێر بکەوێتە گۆمێک ئاوی قووڵەوە، لەهەر شوێنێک بووینایە پرسیارمان لە خەڵکی دێهاتەکان دەکرد و زانیاریی باشمان کۆدەکردەوە و ناوی خوامان لێدەهێنا.

جووتیارەکان، لەهەموو ڕوویەکەوە، بەدەنگمانەوە دەهاتن. ڕێگاپیشاندەر و پشتیوانمان بوون. دەیانزانی چەند مەخفەر و ڕەبیەی لێیە و کەی کاتی پەڕینەوە لەو شوێنانەی مەترسی هەیە؟

هەڤاڵەکانی عوسمانی قالە منەوەر، ئەوکاتەی یەکێتی بوو، هەر بۆ سوعبەت، ئەم سەربردەیان لێدەگێڕایەوە: ((لەهەر شوێنێک مەترسی نەبوویێت، گوتویەتی: ئێرە هەر زۆر ترسناکە من پێشتان دەکەوم، ئەگەر بۆسە و تەقە بوو، با من بکوژرێم! ئەگەر بیزانیبایە لەو شوێنەدا مەترسی هەیە، دەیگوت: هیچ نییە و یەک دەنک مەترسی نییە، یەکێکتان با پێشبکەوێت!

من لەم سەفەرەمدا قەڵای (سروچک)م لەنزیکەوە بینی و بە شوێنەوارێکی جوان هاتە بەرچاوم. لەدڵی خۆمدا گوتم:

کوردستان رزگار کرا، پێویستە ئەم قەڵایە نۆژەن بکرێتەوە و بەجوانی پارێزگاری لێبکرێت! ئەوە چل ساڵ بەسەر ئەو بیرەوەرییەدا تێپەڕێت، نە دەتوانین شوێنەوار پارێزگاری بکەین و نە دەزانین گرنگیی بۆ گەشتوگوزار چییە و نە بایەخی بۆ ناسنامەی نەتەوەیی خۆمان رەچاو دەکەین؟

بەسێ رۆژ گەیشتینە (شابەدین). جارێ تاریک و روون نەبوو بوو. شابەدین سەرووی (باسنێ)یە و دەکەوێتە سەر سنووری ئێران. خەڵکەکە چاویان پەڕییە پشتی سەریان، کاتێک چاویان بە ئێمە کەوت. گوتیان: ((کەم بەرزایی هەیە، رەبیەی پێوە نەبێت، شەوو رۆژ بۆسە دەنێنەوە. ئێرە لە (باسنێ) وە چەند شەقاوێک دوورە..)). ئێمە گوتمان: ((بەرەو ئاسۆس دەڕۆین!)).

سێ پێشمەرگەی هەرێمی(٣) بەرێکەوت لەشابەدین بوون، کە ئەمانەبوون(مستەفا دەمرکانی، هێمن و جەزا)، زۆریان پێخۆش بوو، چاویان بە ئێمە کەوت. ئەوانیش دەیانویست بۆ لای مستەفا چاوڕەش و ئەحمەد فەتحوڵلا بچن..

جوتیارێکی داماو بەوپەڕی پەرۆشییەوە پێیگوتین: ((رێگای شاناخسێ بگرن! بەم شێوەیە بڕۆن سەربازەکان دەتانبینن. شان بە شانی چەمی تییەت بڕۆن. ئەم چەمە (زێی بچووک)، ئێران و عیراق لەیەک جیادەکاتەوە. لە شوێنێکی ئەمین و نە دیو خۆتان قایم بکەن باشترە، با تووش نەبن! ئێوە دیارە هەر زۆر نە شارەزا و بێئاگان، ئەم کاتە کاتی چوونە دێهات و سووڕانەوە نییە! لێتان قەوما چی دەکەن؟)).

ماوەیەکی کەم ڕۆیشتین! خوارەوە: چەمێکی خوڕوبەرین بوو، سەرەوەشمان شاخی (گمۆ)* بوو! هەژار گوتی: ((ڕۆژ زۆری ماوە، ئێمە نامۆ و نە شارەزاین، شتێک ڕوبدات، زیانی زۆر دەدەین..)). لاپاڵێکمان هەڵبژارد، دارودەوەنی چڕوپڕ بوو. وێڕای هەژارو دوو پێشمەرگەی تر، خۆمان گەیاندە ئەو لاپاڵە. دەبینین، دە پانزە سەرباز، لەلاشانی بەرامبەرمان، پاڵکەوتوون و دەنگە دەنگیانە. نێوانمان سەد مەتر نەدەبوو. دەنگە دەنگیان نەکردایە، تێکەڵاوی یەکتر دەبووین. یەک دوو پ. م دەیانگوت با هەڵکوتینە سەریان، دەستکەوتێکی باشمان دەبێت!

خالید گەرمیانی گوتی: ((ئەمانە هاتوونەتە خوارەوە بۆ بۆسە نانەوە، دیارە سەربازگەکەیان لەسەرەوەیە و لێرەشەوە نزیکە. ئێمە هاتووینەتە کۆشی ئەوانەوە بەبێ ئەوەی بەخۆمان بزانین. ئێستا سەعات هەشتی بەیانییە. خۆتان بەعەرزا بدەن، نە پژمە، نە کۆکە، نە قرخەقرخ، نقە لەخۆتان ببڕن و تا پاش نیوەڕۆ هەناسەش مەدەن..)).

یەکێک لەسەربازە عەرەبەکان، لەسەر گازی پشت ڕاکشابوو، قاچی ڕاستی لەسەر ئەژنۆی چەپی دانابوو. هەردوو لەپی دەستی لەبن پشتی سەری دانابوو، دەستی کردە (یابویە.. یابویە). بێگومان ئەوان ئەوەندە دەنگە دەنگیان نەکردایە، هەر زۆر بە ئاسانی گوێیان لەهەناسەبڕکێ و مشەمشی ئێمە دەبوو. ئەوان هەرچییان دەگوت، ئێمە لەگاڵتە و گەپ و سوعبەتی ئەوان تێدەگەیشتین.

دێهاتی مەروێ، شاناخسێ، گرگاشێ، دەشتێ.... تاد. ئالانی ڕۆژاوایە و سەر بەناحیەی (باسنێ)یە و دەکەونە ڕۆژهەڵاتی

---

* گمۆ: شاخ، کێو: ئێستا ئەمە بۆتە ناوی شاخێک، کە دەکەوێتە ناوچەی ئالان.

زنجیره چیای (گمۆ)وه. بەرامبەرمان، ئەوبەری رووباری (زێی بچووک) زنجیره شاخی بریته (بریتی گەورەو بریتی بچووک) و کێلێ. شاخی بێندروێ زۆر بەرزترەو دەکەوێته پشتیانەوەو پاش بێندروێ شاخی (هۆمل) و (زەرکه) دێت. بێتووش، که دێیەکی زۆر کۆنه، دەکەوێته بناری (زەرکه)وه. من بۆ خۆم لەسەر شاخی زەرکەوه، زەردەی قەرەداخم بینیوه. بێژوێ دەکەوێته بناری (هۆمل)ەوه. کاتێک باسی (بێژوێ) بکرێت، ناتوانم یادی (حەمەی مەلا عەلی) نەکەمەوه. پیاوێکی به ئەمەک و رەوشت بەرزو دلاوا و فیداکار. ماڵەکەی نوای هەزاران (پ.م) و لێقەوماو لانەوازان بوو.

دێی (سەرسوو) و (زەڵێ ـ ی خێڵەڕەش) و(ماڵتا) و(بەردە ڕەشه) و (چیوەرۆ) و (سنجوێ) و (کاوژان) و (بێتووش)و... تاد ئالانی رۆژهەلاتن: سروشتێکی دلڕفین، باخ، دارستان و دیمەنی بێوێنه.

نیوەڕۆ ئەوان چەکیان کرده شانیان و رۆیشتن، ئێمەیش هەناسەیەکی قووڵمان هەڵمژی. تا دەمەو عەسریش، نەماندەوێرا سەری خۆشمان بخورێنین. هەژار و یەک دوو پ. م، بەوردی، لەپەناوه، بەدووربین چاودێری ئەو دەوروبەرەیان دەکرد.

بۆ سەر رێگای شاناخسێ داگەڕاین، جوتیارێک به پیرمانەوه هات و پرسیاربارانمان کرد. ئەو گوتی: ((رێگای خواری خوارەوه بگرن، بۆسەکان تۆزێک لەمەوپێش کشانەوه و هیچی لێ نەماوه، رێگای قەراخ چەم سەلامەتتره..)).

خالید گەرمیانی گوتی: ((دەمانەوێ بۆ ئاسۆس برۆین، لە کوێ ئەگەری تووشبوونی مەترسی هەیه؟)).

جووتیارەکه گوتی: ((رێگایەکی سەخته و دەبێ رێپیشاندەرتان هەبێت!)). پێشمەرگەیەک که ناوی خۆی

نابوو(هیتلەر) گوتی: ((لێرەوە بوار هەیە بچینە دیوی کوردستانی ڕۆژهــەڵات و تــا دەگەینــە بەرامبــەر ســـەفرەو زەروون..)).
جوتیارەکە گوتی: ((ئێستا بەهارە و ئاو زیادی کردووە، بوار نییە و مەلەوانێکی زۆرباش نەبێ ناتوانێت بپەڕێتەوە!)).
هیتلەر گوتی: ((من دەتوانم لەم ئاوە بۆ ئەوبەر بپەڕمەوە!)).
جوتیارەکە گوتی: ((بەخوا گا تل ئەدات..)).

هیتلەر کوڕێکی لاوی بالآبەرزی وتووریابوو. دەستێ جلی کوردی ڕەشی لەبەربوو: سەرتاپا ڕەشپۆش! من گوتم: (ناوە ڕاستەقینەکەت چییە؟)).
((هــەڵۆ)): نــاوی ڕاســتەقینەم (هەڵۆیە)یــە و خــەڵکی کــانی سپیلکەم!
من گوتم: ((دەزانیت هیتلەر کێیە و چی کردووە؟)).
هیتلەر: ((بەڵێ دەزانم! ئەو سەرکردەی ئەڵەمانەکان بووە!)).
((ئێمە ڕێکخراوێکی مارکسین و مارکسیەت دژی بیروباوەڕی نازی و فاشیە..)). من لەسەر قسەکانم بەردەوام بووم.
هیتلەر: ((هیتلــەر ئــەو کەســەیە ویســتی نەخشــەی جیهــان بگۆڕێت و ڕەگەزی ئاری بالآدەست بێت..)). بەدەم قسەکردنەوە خۆی خستە ناو ئاوەکەوە و گوتی: ((هەر ئێستا دەچم بۆ ناو دێکە و تەلتان بۆ هەڵدەواسم..)).
((ئەگەر دەزانیت ئاوەکە خوڕە بگەڕێرەوە!))، من بەدەنگی بەرز پێمگوت! ئەو لەکەنار خۆی ترازاند، هەر بەجل و جەواڵەوە، کەوتە باڵە مەلە! لەناوەڕاستی ڕووبارەکە، چەندە تاشە بەردێکی زل زلی لێبوو، ویستی بۆ سەر تاشەبەردێک بڕوات، ئاو لوولی دا، گێژاو هەڵیلووشی! چەند هاوارمان کرد (هیتلەر گیان! هیتلەر گیان!) هیتلەر دیار نەما! یەکەمین جار بوو بەزەییمان بەهیتلەردا بێتەوە. هەر هەمووومان هەناسەمان وەستاو خەریک بوو دڵمان

لە ترپە ترپ بکەویت. پتر لە دوو دەقیقە تێپەڕی هیچ شتێکی رەش بەسەر ئاوەوە نەبوو. لەدڵی خۆماندا گوتمان: ((برا رۆ، باوکە رۆ، هیتلەرمان ڕۆ!)). لەپڕ لەو سەرەوە دەرچوو، بەردێکی پانکەڵە لەنزیکی کەناری ئەوبەر بوو، خۆی هاویشتە سەر ئەو بەردە پانکەڵەیە. تا نیو سەعات جوڵەی نەکرد. پاش نیو سەعات بە مەلە لەئاو پەڕیەوەو خۆی گەیاندە ناو باخێک و لەچاو بزربوو، لەو سەرەوە پیاوێکی لەگەڵ خۆی هێنا. ئەو تێیگەیاندین لەوسەری دێوە بۆ پەڕینەوە، ئێواران تەل هەڵدەواسرێت. بەڵێنی داینێ هیتلەرمان بۆ بگێڕێتەوە.

بەرەو (شاناخسێ) سەرکەوتینەوە، هەر ڕێیەک دەچێت بۆ دێیەک. پێش ئەوەی بگەینە ناو دێ. پێنج شەش پ. م لەپێشمەوە بوون. بەردێک لەسەر ڕێگاکە بوو، هەروەکو پلیکانەبوو، لەبری بەرەو خوارەوە، ئەوان بەرەو سەرەوە چوون، شوێنێکی تەختایی رووتەن. توولە ڕێگەکە، ڕێک بۆ ناو چادری رەبیەیەک دەچوو، کە هەر سەدو بیست مەترێک لێمانەوە دووربوو. کاتی نانی ئێوارە و فرکان فرکانی سەربازەکان بوو. هەریەکە(قوسعە)ی بەدەستەوەبوو، سەرقاڵی ژەمی خواردنی ئێوارە بوون. پێشمەرگەکان (٥٠م)یان مابوو بچنە ناو چادرەکانەوە. هێشتا دنیا تەواویش تاریک دانەهاتبوو. لەپشتەوە هاوارم لێکردن. (بەردەمتان رەبایە)یە! هەر پێنج شەشیان بەپەشۆکاویی و سەرسامی بەسەر یەکتردا کەوتن! نەیاندەتوانی، نە بۆ پێشەوە بڕۆن و نە بۆ دواوە. یەک دوو دەقیقەیەک تاسان، ئەو دونیایان بینی و ئینجا هاتنەوە هۆش و بە چوار پێنج قەڵەمباز گەیشتنەوە لای خۆمان!

## (١)

پاژێـک لـە نـاوی دێ و شـاخ و ڕووبارەکـانی کوردسـتان، هەریەکـەی چـاوگ و ژێـدەری زمـانی ئـەو گەلانـەی پێوەیـە، کـە کوردسـتانیان داگیـر کـردووە، یـان لـەدێر زەمانـەوە لێـرە نیشـتەجێبوون. ((ئاسـۆس)) و (مـالیمۆس)) و (مۆریـاس) و ((رانیە)) و ((ماکۆس)).... تاد. سەرچاوەکەیان سەدی سـەد زمـانی یۆنانییە.. (باسمۆسیان) و ((دووکان)) و (کـەلکان)) و (قەنـدیل))... تـاد. لـەزمانی ئاشـووریەوە بۆمـان بـەجێماوەن. ((قـەرەداخ)) و ((قلیجـە)) و ((قزلـەر)) و ((دابـان)) و ((کۆتـەڵ)) و ((دەمرکـان)) و ((قەرەگۆل)) و ((قازانقایە)). یان وەرگێڕانی نـاوی کوردیـە (قزلـەر ـ کچـان) و ((قزڵجـە ـ سـوورەدێ)) یـان داگیرکـەری مـەغولی و پاشـان تـوورک نـاوی دێهـات و شـاخی خۆیـان بەسـەر نـاوە کوردییەکانـدا سـەپاندووە وەکـو ((دابـان و کۆتـەڵ)). ئـەم شـاخ و دێیە نزیکی ((بوخارا))یە و تەیموور لەنگ ماوەیەک لەوێ ژیاوە! نـاوی ((شاناخسـێ)) و ((گرگاشـە)) و ((بایلۆسـە)) و (تییـەت)). ڕەنگـە پاشـماوەی زمـانی گـەلی (ئالان)بێت، کـە تـا دەوروبـەری ساڵی (٣٨٠ز) لەرۆژهەلاتی دەریای ڕەش ژیاون. هێرشی هـۆزی (هـوون) لەرۆژهەلاتـەوە بـەرەو رۆژاوا تـەفرووتونی کـردوون، بەشـێکیان بـۆ ئێران و کوردسـتان هـاتوون و بەشـێکیان لەگـەڵ گرمانەکان Die Germanen بەتایبـەتی (گۆتی رۆژهـەلاتی) بـۆ گرمانیـا (ئـەڵمانیای ئـەمڕۆ) ڕۆیشـتوون و پێکـەوە (ڕۆما)یـان لەدەوروبـەری سـاڵی (٥٠٠ز) داگیرکـردووە و دەوڵـەتی ڕۆمیـان ڕووخاندووە... تاد.

شاناخسێ گوندێکی خنجیلانـەی زۆر جوان و پاک و خـاوێن بـوو. دیـوار و پەنجـەرەو سـەربان، ئـەقڵی ئەندازیاری خـۆکردی تێیـدا بـەکارهاتبوو. دیـواری ماڵـەکان بـە بـەردی سـپی

هەڵچنرابوون. دار گوێز و میوە دێکەی دادەپۆشی. دێهاتی (ئاالان و سیوەیل) لەهەفتاکانی سەدەی بیستەمدا لەچاو گەرمیاندا هەر زۆر پێشکەوتووبوون! لە پاک و خاوێنی و ماڵ و ماڵداری و کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردندا زۆر جیاوازبوون. لەهەموو روویەکەوە جیاوازی هەبوو: ژیانی خەڵکی ئاالان باشتربوو، خانووەکانیان لەمۆدێلی خانووی بیارە و هانەزەردەڵە و سەرگەت و خەرپانی دەچوو. هاوینان لەناو باخەکانیان ساباتیان دروست دەکرد و لەوێ دەژیان. نازانم گەرمیانییەکان چۆن بە قرچە قرچی گەرما دروێنەیان دەکرد و مەڕیان بەخێو دەکرد و دەژیان؟ من هەموو جارێک دڵخۆشی خۆمم بەوە دەدایەوە، کە دێهاتی (١٠) کیلۆمەتری بەغدا دەیان جار لەدێهاتی گەرمیان پیس و پوخڵتربوون. واتە: ئەو دێهاتانەی لەپایتەختەوە نزیکتربوون پیستر و بۆگەنترو نارێک و پێکتربوون لەچاو ئەو دێهاتانەی لەپایتەختەوە دووتربوون.

سەدام هات دێهاتەکانی سنووری رووخاندو چۆڵیکردن و دێهاتەکانی پەنای پایتەختی پاراست!

بۆ نان و چای ئێوارە بەسەر ماڵەکانی شاناخسێدا دابەشبووین. ژووری میوان، ژوورێکی ((شاهانە)) بوو، فەرشی ئێرانی راخرابوو. سەماوەر گیزەی دەهات. ترس و چاوەڕوانی بەدەموچاوی خاوەن ماڵەکەوە دیاربوو. لەدڵی خۆمدا گوتم: ((ئەم خەڵکە وا دەزانن ئێمە هۆکاری ئەوەین حکومەتی بەغدا ئەم هەموو سەربازەی لەم وڵاتەدا کۆکردۆتەوە! ئەگەر ئێمە نەبین دونیا دەبێتە شامی شەریف!)). ئێمە بە پەلە پەل نان و چای خۆمان خواردو لەدێ دەرچووین.

توولەرێیەک بەناو باخ و بێستانی ئەو خەڵکەدا دەکشا. لەپڕ، هەر ئەوەندەمان زانی کەوتووینەتە بۆسەوە! ئەوان هاواریان دەکرد: ((ئێوە کێن؟)). و ئێمە هاوارمان دەکرد: ((ئێوە کێن؟)).

ئێمە گوتمان: ((ئێمە پێشمەرگەین! ئەی ئێوە کێن؟)).
ئەوان گوتیان: ((ئێمە پێشمەرگەین و ئێوە جاشن!)).
دەستەکەی ئێمەیش حەماسیان هەستاو هاواریان دەکرد: ((خوشک و داکتان بە نێرەکەر، ئێمە پێشمەرگەین و ئێوە جاشن!)). ئیدی دایانگرتین بە دەستڕێژ و قرم وهوڕ و بووە ئەو ڕۆژەی وا قەرەوەیسی تێدا کوژرا!
ئاگربارانێکی خەست بوو، جوێنبارانێکی خەست و خۆڵترا! لەپڕ (هێمن) هاواری کرد: ((ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن پێشمەرگەن، دەبێ شێرزادتان لەگەڵدا بێت..)).
یەکێک لەسەرەوە هاواری کرد: ((ئێوە جاشن! شێرزاد کێیە؟)).
هێمن هاواری کرد: ((من هێمنم! شێرزاد هاوڕێمە. با بێتە پێشەوە دەنگم دەناسێتەوە..)). قرم و هوڕ وەستا: ((تەقە مەکەن! با کاک شێرزاد بێت و لەگەڵ کاک هێمن قسە بکات و کەس تەقە نەکات. هێمن و شێرزاد بە یەک گەیشتن، ئینجا بووە ماچباران و باوەش بەیەکدا کردن.
پێشمەرگەکان پرسیان ((ئێوە پێشمەرگەی کوێن؟)).
ئێمە گوتمان: ((ئێمە پێشمەرگەی هەرێمی پێنجین!)).
((کێ بەرپرسیاری دەستەکەیە؟)). ئەوان پرسیان کرد.
((مامۆستا جەعفەرمان لەگەڵە و منیش سەرپەرشتیاری عەسکەری ئەم دەستەیەم..)). هەژار دەستی بە سمێڵەکانیدا هێناو وڵامی پرسیارەکەی دایەوە.
یەکێک هاتە پێشەوە و گوتی: ((من مستەفا چاوڕەشم! بەخێرهاتی مامۆستا جەعفەر!)). مستەفا چاوڕەش دەستی بە پێکەنین کرد و بەگەرمی بەخێرهاتنی کردین.
ئەوان هەواڵێکی ناڕاستیان پێگەیشتبوو: گوایە دەستەیەک جاشی گەرمیانی بەناوی پێشمەرگەوە دەسووڕێنەوە.. تاد.

# خانەی موعینی
## (٢)

ئەو شەوە، رووماانکردە دۆڵێک: شێوەیەکی بازنەیی هەبوو، بەدارستان داپۆشرابوو، لەبن دارو دەوەن و بەرد جێگای خۆمان کردەوە. مستەفا چاوڕەش پێیگوتین: ((بەدرێژایی رۆژ ناتوانین لەدێیەکەوە بۆ دێیەکیتر بچین. زۆربەی لووتکە و بەرازییەکان رەبایەی قایمیان لێدروستکراوە، بە ئاسانی چاودێری رێگاکان دەکەن. ئێوە پاش خۆرئاوابوون دەتوانن بەرەو ئاسۆس بکەونە ڕێ..)).

مستەفا چاوڕەش، کەسێک بە تەنیشتیەوە دانیشتبوو، دیاربوو تازە لە شارەوە هاتبوو، پرسیارێکی لێکردم: ((مامۆستا ئەم پیاوە دەناسیت؟)).

یەکسەر گوتم: ((بەداخەوە نایناسم!)).

مستەفا گوتی: ((ئەمە ناوی کاک قادرەو ئامۆزامە، دوو سێ رۆژە هاتۆتە دەرەوە. شێوەمان لەیەک ناچێت؟)).

ئەو زۆربەی کات پێدەکەنی و کەم قسەی دەکرد چونکە نەیدەویست دەرکەوێت کە کوردی رۆژهەڵاتی کوردستانە. رەنگە ئەو دیالێکتی سلێمانی یان هەولێری فێر نەبووبێت!

من گوتم: ((ئەگەر بەشێوە بێت، هەر زۆر لەیەک ئەچن! هیوادارم بتوانێت دەورێکی گرنگ بگێڕێت!)).

پاش نزیکەی مانگێک، واتە: لە ٢١/ی حوزەیرانی ١٩٧٨ ئەم پیاوە وێڕای ئەحمەد فەتحوڵلا و پۆلێک پ. م لەخوارووی

گوندی (دڕی) هێزێکی سوپای ڕژێم هێرشیان دەکەنە سەرو زۆربەیان شەهید دەکەن. ئەو کەسە خانەی موعینی (سەعید) بوو، برای سلێمان موعینی و عەبدوڵلای موعینی بوو. سەد جار گووتەمە خۆزگایە رادەستی ئێمەیان بکردایە، هەرچەندە هاتنەکەی ئێمەش بڕێک هەڕەمەکی بوو، بەرێکەوت تێنەکەوتین و دەربازبووین. ڕەوانەکردن بۆ سەرەوە، هەزار جار مانەوە لەگەڵ ئەحمەد فەتحوڵلا چاکتر بوو. ئەوان پێیانوابووە، دەتوانن زۆرباش پارێزگاری خانەی موعینی بکەن و لای ئەوان بێت سەلامەتە. من پێموایە، ئەو دوو سێ مانگ، هاتنەکەی دوابخستایە، ڕەنگە تووشی ئەو چارەنووسە نەبوایە!

لەم شەڕەشدا گرنگی مەشق و ڕاهێنان و شارەزایی دەوری خۆی بینی. ئەحمەد فەتحوڵلا تا سەعات دوونیو لەناو دێی (دڕی) دەمێنێتەوە. کاتێک دێتە دەرەوە، هێزی تایبەتی سوپای ڕژێم بۆی لەبۆسەدابوون. هەر یەکەم دەستڕێژ، ئەوەندە بە وردی پلان بۆ دارێژراو دەبێت، بەردەکەوێت و گیان لەدەست دەدات. کوژرانی لێپرسراوی عەسکەری دەستەکە تارادەیەک هێزەکە شەوارە پێدەکات و شەش پ. م شەهید دەکرێن و ۳ پ. م بە دیل دەگیرێن. تەنیا مامۆستا غەفوور ژاژڵەیی وێڕای دوو سێ پێشمەرگەیتر، لەبەرئەوەی خاوەن ئەزموون بوون، دەتوانن خۆیان دەرباز بکەن. خانەی موعینی لەوە ناچێت هیچ ئەزموونێکی ئەوتۆی لەبواری شەڕی پارتیزانیدا هەبووبێت و ڕەنگە هەر چەکیشی پێ نەبووبێت.

# گەماڵان
## (٣)

ئەحمەد فەتحوڵڵا، ئەوکاتە ئەندامی سەرکردایەتی بسک و یاریدەدەری فەرماندەی هەرێمی سێ بوو، تا سەر ڕێگایەک لەگەڵماندا هات و ڕێنوێنی کردین. ئەو بەدەنگێکی بەرز گوتی: ((ئەمە ڕێگای ئاسۆسە و لەهیچ کوێ لا نادەن تا دەگەنە دێی گەماڵان..)).

هەژار گوتی: ((ئێمە نە شارەزاین، بە چەند سەعات دەگەینە گەماڵان؟)).

((باش بڕۆن بەحەوت سەعات دەگەنە گەماڵان و لەوێ مەمێننەوە! ئەوێ جێگای مانەوە نییە، لە ئاسۆس دەتوانن بحەسێنەوە!)).

ئەمە وەڵامی ئەحمەد فەتحوڵڵا بوو بۆ هەژار..

هەژار لەسەر ڕوونکردنەوەکەی ئەو پرسیارێکی لێکرد: ((ئێستا سەعات شەشی ئێوارەیە، ئەی ئەگەر بە حەوت سەعات نەگەیشتین لەکوێ بمێنینەوە؟)).

ئەحمەد فەتحوڵڵا گڕی گرت و کردیە هاوار هاوار و نەڕە نەڕێک، لەدۆڵەکە دەنگی دەدایەوە: ((ئەمە عیراقە، ئەو دیو ئێرانە،... ئەم دیو شاخ و ڕەبیە و حکومەتە، ئەو دیو ڕووبار و سەربازی ئێرانە، دەبێ بفڕن! شوێنی حەوانەوەو مانەوە بیری خۆتان بەرنەوە..)).

یەک بین تا گوندی گەماڵان نەوەستاین. پاش سەعات یانزەی شەو گەیشتین: واتە: هەر زۆر خێرا بووین. ڕەشماڵێک

لەپەڕ ئاوایی هەڵدرابوو، سێ چوار پیاو بە گەرمی بەپیرمانەوە هاتن. هەژار گوتی: ((کات درەنگە، ئێمە بۆ مانەوەو ئیسراحەت نەهاتووین! چەند نانێکمان بدەنێ، ئێمە دەڕۆین..)).

حەمە ئاغای گەماڵان، پیاوێکی سمێڵ رەش، دامەزراو، زۆر بەڕێزەوە لێمان هاتە پێشەوەو گوتی: (( فەرموون لەبن ئەم رەشماڵەدا دانیشن و بحەوێنەوە. میوان میوانە، درەنگ و زووی بۆ نییە. ئەمە ماڵی من نییە و ماڵی ئێوەیە..))..

هەژار گوتی: ((ئێمە پێشمەرگەین و نامانەوێ بەهۆی ئێمەوە ئێوە تووشی کێشە و سەرئێشە ببن..)).

حەمە ئاغا گوتی: ((هەر جارێ هێزێکی حکومەت هێرش بهێنێت، لەنێوان چوارو پێنجی بەیانیدا گەمارۆی دێهات دەدەن و چاوەڕوان دەکەن تا رۆژ دەبێتەوە. ئێوە بە سەعاتێک دەگەنە شاخی ئاسۆس، لەوێ هەموو سوپای عیراق پەلامارتان بدات، هیچی پێ ناکرێ..)).

پاش نیو سەعاتێک، سەماوەر و قۆری و پیاڵە هات. هەردوو کەس و یەک سینی گەورە: پەنیرو ماست و نانی گەرمی لەسەر بوو. هەر پارچە پەنیرێک دوو کیلۆیەک دەبوو. ئێمە (١٢) پ. م بووین. من بەخانە خوێم گوت: ((یەک دوو سینی بەشی هەر هەموومان دەکات. ئەمە زۆر زۆرە!)).

خانەخوێکەمان هەر زۆر خانەدان بوو، گوتی: ((ئێوە رێگایەکی دوورتان لەپێشە، تێر بخۆن، تێشووش پڕ بکەن!)). خانەخوێ ئەوەندە گەورەیی و ماریفەتی نواندو ئەوەندە بەڕێزو خانەدان بوو، من گومانێکم لا دروست بوو سەبارەت بەناوی گوندەکە، خەڵکی ئەوەندە بەڕێز، میوان دۆست هەر دەبێ ناوی گوندەکەیان (کەماڵان) بێت، نەک (گەماڵان).

من گوتم: ((کاکە ئەم دێیە ناوی کەمالانە؟)).

خانەخوێ گوتی: ((قوربان ئەم دێیە ناوی گەماڵانە نەک کەمالان!)).

هەر جارێک حیکایەتی ((گەماڵان) و ((کەمالان)) م بۆ جەمالی عەلی باپیر بگێڕایەتەوە، پێنج شەش دەقیقەیەک دەستی بە سکیەوە دەگرت و لە قاقای پێکەنینی دەدا. پاشان دەیگوت: ((پەیوەندی لەنێوان ناوی گوندو بەڕێزی و هەڵس و کەوتی مرۆڤێک چییە؟ پێتوایە: ئەگەر کەسێک خەڵکی گەماڵان بوو بۆ نمونە، دەبێ شەڕەنگێز و تووڕە و تڕۆ بێت؟)).

# لەدۆڵە کۆکەوە بۆ دۆڵی بلوێر
## (٤)

کۆتایی ئایاری ١٩٧٨ گەیشتینە خڕی نێوزەنگ: دانیشتوانی ناوچەکە پێیان دەگووت: "خڕی نێرزەنگیٚ". ئەوانەی شارەزای ناوچەی سوێسنایەتین بەگشتیو دۆڵی کانی زەردن بەتایبەتی، هەندێ وردە زانیاری پێویستە: گوندی شێنێ ئەوکاتە گوندێکی سەوزی دڵگیری گەورە بوو. بەدامێنی شاخی مامەندەوە بوو. رووباری پشکاوێ سنووری نێوان عیراقو ئێران بوو. زەڵـێو نۆکانو خڕی نێوزەنگ، زۆر لەیەکەوە نزیک بوونو لەپێناسەی گوندەوە دوورنو رەنگە پێناسەی مووچەو کوخو دەرماڵ و دێبەرو بنەی مەڕداران بیانگرێتە خۆی.

لە(هەڵشۆو بێگلاس)ەوە بەیانی زوو هەڵکشاین بەرەو (بەردە سپی). حاجی حاجی برایمو باوکی لەنزیکی (پەڕوەشێن)بوون. تاوڵێکی گەورەیان هەڵدابوو. نیوەڕۆ لەوێ لاماندا. باوک و کوڕ زۆر رێزیان لێگرتین و نەیانهێشت بەبێ نانی نیوەڕۆ تێپەڕین. هەستمان کرد ئەمە (قۆناخ)ێکی شۆڕشە و ناوچەکەش دەپارێزن. دەوروبەری ئێوارە گەیشتینە خڕینێوزەنگ. ئێرە لەوە دەچوو خاڵی بەیەککەیشتنی قاچاخچییەکانی هەردوو دیو بێت. کۆمەڵێک قاچاخچی چادرو بنبەردیان کردبووە سوپەرمارکێتو فریشۆپ. ئەوکاتە ژمارەیەک (پ. م) بەپەنجەی دەست دەژمێردران لەوێ جێگیر ببوون، سیاسەتی شۆڕشیان دادەسەپاند. رەسوڵ مامەندو دەستەیەک (پ. م) هەر تۆزێ هەورازی ئەوان چادریان لەپەنای گابەردەکاندا هەڵدابوو. کاک

زێرۆی عەبدوڵڵا ریێوی ئەو زەمانە لەسەفیری کۆمەڵەو یەکێتی دەچـوو لەکۆمـاری خـرِی نێوزەنـگ. ئەو بەئەوپەڕی ڕێـزو گەرمـیەوە بەپیرمـانەوە هـات. ئـێمە ژمارەمـان ١٢ (پ. م) بـوو. نـازانم چـۆن بەو خێراییە نـانو ئـاوو رێگەو جێگەی بـۆ دابـین کردین؟

لەرِێگەی زێرۆوە دوادەنگوباسی رۆیشتنی هێزێکی سـەرەکیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بەسەرۆکایەتی عەلی عەسکەری بەرەو (دۆڵی خواکورک)و سنووری تورکیامان بیست. ئەو زۆر وردەکـاریو زانیـاری دەزانـیو کەمـی دەردەخسـت. ئەوەی دەیزانیو بۆ من بەسوود بـوو، بەنارِاستەوخۆ دای بەگوێمدا کە نێـوانی کـاک رەسـوڵ لەگەڵ زێـرِۆ زۆر بـاش بـوو. سـوعبەت و گاڵتەو گەپ لەنێوانیاندا هەبوو. زێرِۆ پێی دەگوت: کـاک رەسـوڵ ئەمەی تـۆ دەیڵێیـت جـۆرێکە لە(رەسـوڵیات)! ئەویـش یەکسـەر وەڵامـی ئامـادەکراوی هەبـوو: ئەمەش وەکـو (ثعلبیـات)ەکـانی تـۆ. رۆژی پێنج شەش جار ئەم کۆنتراڤرزە (چەقبەردۆکێ)یە هەر بـۆ سـوعبەت دووبـارە دەکرایەوە، بەبێ ئەوەی سـنووری رێزگـرتن بترازێنرێت. رەسـوڵ زۆر شـەیدای بەکارهێنـانی وشـەی عەرەبـی کلاسیکی بـوو. پێم سـەیر بـوو یەکێـک نەوەی عەلی بەردەشـانی بێتو بەلای دارِشتنی کوردی خۆماڵیدا نەچێت!

هەرچەند ئەو نێوی بەوە رۆیشتبوو، لەسوعبەت نازانیو زۆر رەقە. مـن بۆخـۆم نەمتـوانی رقـم لێـی بێـتو پەیوەنـدیمان بگـاتە مریشـکە رەشـە. تەنـانەت پـاش چیرۆکـی جیـابوونەوەو دروستکردنی حسک، پەیوەندیمان زۆر ئاسـایی بـوو. دیـارە ئەو یەکتر ناسینە کاریگەریتی خۆی بەجێ هێشتبوو.

زێرۆ پێی ڕاگەیاندم: "مام جەلال لەگەڵ هێزی سەرەکی (ی. ن. ک)دا نییەو ئەمان لە(باڵەیان)ن‌و چاوەڕوانی گەیشتنی ئەوانن بۆ دۆڵی خواکورک. ئەگەر تۆیش بڕۆیت فریایان دەکەویت‌و لەگەڵ ئەواندا بڕۆیت چاکترە".

من ئەو چرکەیە لەقسەکانی ئەو بەباشی تێ نەدەگەیشتم. پاشان وردە وردە بۆم ڕوون بووەوەوە بەرەو کوێ ملم ناوەو چی چاوەڕوانم دەکات؟ ئەو پیاوێکی ڕاستگۆو دڵسۆز هاتە بەرچاوم‌و زۆر بەگەرمیەوە ماڵئاوایی لێکردم.

لەگەرمیان بووم کاتێک دەنگوباسی ئەوەم بیست لەکۆبوونەوە فراوانەکانی (نۆکان)دا سێ کەس وەکو سەرکردایەتی نوێی کۆمەڵە، پاش شەهیدبوونی ئارام هەڵبژێردراون: (نەوشیروان‌و ئازاد هەورامی‌و بەندە)و سەرکردایەتی نوێ ناوی (ناوەندی کۆمەڵە)بوو. ئەوی ڕاستی بێت من چاوەڕوانی ئەم ئەرک پێسپاردنە نەبووم. ڕێزم بۆ بڕیارەکە هەبوو، بەڵام بەلامەوە بڕیارێکی ڕاست نەبوو. زەمانی ئینتەرنێت‌و مۆبایلیش نەبوو، هەر لەدوورەوە داوای ڕوونکردنەوە بکەم. بەجوانیشم نەزانی نامەیەک ئاراستەی ئەو برایانە بکەم. مانەوە لەگەرمیاندا، سەرەڕای ئاگرباران‌و پەلاماردانی بەردەوام‌و مەترسی زۆر، بەلامەوە هەر زۆر خۆش بوو، چونکە لەناو خەڵکدا بووین‌و جێگەی دەستمان دیاربوو. سیروان (فەیسەڵ ڕەشید تاڵەبانی) فەرماندەی عەسکەری یەکەم مەفرەزەی گەرمیان بوو. من لێپرسراوی سیاسی ئەوێ بووم! بە سیروانم گوت: "من دەڕۆم بۆ سەرەوەو داوای لێبوردنیان لێ دەکەم‌و یەکسەر بەبێ وەستان دەگەڕێمەوە".

سەرەتای ئایار لەگەرمیاندا گەرمە. شوانکارە بۆ شەولەوەڕ لەدەرودەشت دەمانەوە. ئێمە بەهۆی هەندێ (پ. م)وە لەبن تاوڵی کۆچەرەکان دەمانەوە. لەوە دڵنیابووین ئەوان بەرامبەر میوان وەکو خانە خوێ ڕەفتار دەکەن‌و شۆفاریو خەبەر لێدان بەلایانەوە پەشمەو خۆیان بەپیاو دەزانن!

١٩٧٨/٥/٣٠ بەرەو (ئاشی پشکاوێ)و (گۆڕەشێر) کەوتینە ڕێ. قادر عەزیز و سەید کاکە لەوێ بوون. شەوێک لەوێ بووین. سەید کاکە تا نیوە شەو هەر نوکتە و قسەی خۆشی دەگێڕایەوە. لە(بێدەلان)ەوە بەرەو (قۆتەمان)و لەوێوە بۆ (گوێزێ) ڕۆیشتین. حەمە سەعید لەگەڵ چەند (پ. م)ێک چادرێکیان هەڵدا بوو. لەناو ئەو دەنگە دەنگو هەرایەدا، ئەو خەریکی تایپ‌و ڕۆنیۆی خۆی بوو. حەمە سەعید کوڕێکی روح سووکی بەسەبر بوو. لەسەر ئەو ستێنسڵە دوورودرێژەدا، بەدەگمەن هەڵەی دەکرد. ئەمڕۆ ئەو هەموو کۆمپیوتەرە هەیەو ئەو هەموو مەشق پێکردن‌و ڕاهێنانە هەیە، کەچی ئەگەر لاپەڕەیەک نیوەی ڕاستی هەڵە نەبێت، وادەزانن لەو دنیا خوا لێیان ڕازی نابێت. بەشێکی زۆری هەواڵنامەو بەیان‌و بانگەوازو بڵاوکراوەکانی (ی. ن. ک)و کۆمەڵە حەمە سەعید بەتەنیا تایپی کردوون‌و هاوڕێ جەباریش دەوری یاریدەدەری دەبینی. ئەمڕۆ بەجوانی‌و پاکی ئەو کارە کەس نایان گاتێ. ئەو کاتە (دۆڵە کۆگە)و (گوێزێ) قۆناغی پەیوەندیی یەکێتی بوو بەجیهانەوە.

ئەو کاتە ئەو سەرقاڵی تایپکردنی هەواڵنامەی ژمارە (١ و ٢)بوو. داوای لێکردم لەراستکردنەوەو هەڵەچنی دەنگوباس‌و هەواڵەکان دا بەشداری بکەم. بەخۆشیەوە داواکەم جێبەجێکرد. بواری ئەوەش مابوو، هەندێ هەواڵ و دەنگوباسی نوێی

گەرمیانو قەرەداخی بهاومە سەر. تا کاتی نووستن، تایپو رۆنیۆو ستێنسڵ لەقوژبنێکدا دەپێچرانەوەو هەر دوو سێ کەس دەخزانە بن بەتانیەکەوە. چادرێکی بچووک هێلانەی هەشت نۆ(پ. م)ی بریندارو پەڕیوەو ماندوو بوو. کێ دەیتوانی تابەیانی لەبەر رشکو ئەسپێو پرخە پرخ، پەپوولەی خەو بەپێڵووەکانیەوە بنیشێتەوە؟

لە(دەراوی گورگان) نەوشیروان هەر بۆ سوعبەت سەری دەخستە سەر حەمە سەعیدو هەندێ برگەی لەنامەکەی بۆ دەخوێندەوە، کەبەم شێوەیەی خوارەوە دەستی پێکردبوو:

"بۆ برای بەڕێزم کاک نەوشیروانی بەڕێز

سلاوو رێز

ئەوە بەڕێزەوە مامۆستا جەعفەری بەڕێزمان رەوانەی لای بەڕێزتان کرد. . ئیمزا: حەمە سەعید"

لەنێوان (دۆڵە کۆگە)و (دۆڵی بلوێر)دا تەتەر هەبوو. دەمەو نیوەڕۆی ١٩٧٨/٦/٢ دوو (پ. م)، (خدرە زوودی)و خدرێکیتر پەیدابوونو سێ هێستریشیان پێبوو. حەمە سەعید کۆمەڵێک نامەو راسپاردەو پێویستی بەپێشمەرگەکاندا. من دەمەویست ماڵئاوایی لەو برایانە بکەمو لەگەڵ تەتەرەکاندا بکەومە رێ. دەستێک رانکو چۆخەی خورمایی هاوینەم لەبەر بوو. حەمە سەعید بەسەر سوورمانەوە سەرنجێکی دامو گوتی: "هەروا دەتەوێ بڕۆیت؟". منیش گووتم: "بۆچی تێدایە؟". هیچ وێنایەکم لەسەر قەندیل نەبوو. کوێستانو شاخو کێوم بەهاوین بینیبوو، بەلام نەمدەزانی پلەی سەرماو سۆڵە دەگاتە ئەو ئاستە، لەزستانی کوێستانەکانیتر ساردتر بێت. ئەو گوتی: "بۆ خاتری

خوا چۆن هەروا ئەڕۆیت؟ هیچی ترت پێنییە؟ ئەگەر وابڕۆیت لەو کوێستانەدا ئەمریت." ئەو چاوەڕوانی وەڵامی منی نەکرد، بەپەلە دەستێکی بەناو خەیمەکەدا گێڕاو پاڵتۆیەکی شینی دامیَو هەندێ نانو خورمای داینیَو لەناو بارەکەدا قایم کرا.

بەناو (دۆڵە کۆگە)دا سوار بووین. توولە رێیەک بەکەنار ئاوەکەدا پێشبڕکێی دەکرد. گابەردی زل زل بەم دیوو ئەودیوی رێگەکەدا داخزابوون. دوو پێشمەرگەکە خەڵکی ناوچەکە بوون، چاوکراوەو شارەزابوونو لەسەر هاتوچۆ راهاتبوون: کون بەکونو بەرد بە بەردیان دەناسی. من ئاشنای جیهانی گەرمیانو قەرەداخو ئالانو سیوەیلو بەمۆو زمناکۆ بووم، بەڵام بچووکترین وێنای قەندیلو ئەو دەڤەرەم لەبەرچاو نەبوو. سەرووی سێ هەزار مەتر لەئاستی رووی دەریا بەرزتر بوو. هەردوو خدر ئەوەندەی سەیری لوتکەو دووندی شاخو رەوەزو چەقەنەو باسکیان دەکرد، ئەوەندە سەیری بەرپێی خۆیان نەدەکرد.

نزیکەی نیوەڕۆ بوو، لەهەوارەکەی کوێخا حەمەی مەلا شەریفی مەنگوڕ لامان دا. ئەو دەمە ئەو لەشاری سلێمانی دا بە(کوێخا رینگۆ) ناوبانگی رۆیشتبوو. نانو چایەکمان لەوێ خوارد. باسی ئەوەی بۆ کردین: لەو رۆژانەدا پێشمەرگەیەک تەنگ بە ورچێک هەڵدەچنێ. بەبڕنەوێکەوە بەرکونەکەی لێدەگرێت. بەشێوەیەکی ئەوتۆ پەلاماری دابوو، تفەنگەکەی لەدەستی پچڕاندبوو، بەپاڵێکیش* هەڵیدابووە خوارەوە. بڕنەوەکە هەلا هەلا ببوو، کابراش هەموو گیانی شکابوو. کوێخا محەمەد،

---

* هێزی مشتوەشاندنی ورچێک (١٨٠٠کغم)ە.

کوێخای گوندی (سووره گڵه) بوو. پاش نسکۆی ١٩٧٥ رژێم دەست بە دابەشکردنی زەوی بناری قەندیل دەکات، لەگەڵ جوتیارێک هەروەکو مەنگوڕان دەڵێن: (لەراست یەک راهاتن) کوێخا جوتیارەکە دەکوژێت و رووده‌کاته شاخان. لەهەر کوێ بۆنی حکومەتی بکردایە تەقەی لێدەکردن . بەهۆی ئەم رووداوە ناوی نرا کوێخا رینگۆ*. بەهەورازێکدا هەڵگەڕاین. سەرکەوتین. تەنیا سەعاتێک نەڕۆیشتین مەملەکەتی رەشاییو فێنکی کۆتایی پێهات. بەرەبەرە سنووری کۆماری سەرماو بەفر دەستی پێکرد. بەلامەوە هەر زۆر سەیر بوو، مانگی حوزەیران ماوەی پێنج شەش سەعات بەبەردەوامی بەسەر بەفردا بڕۆم. کوێستانان خاڵ خاڵ نەبوو، هەتا چاو هەتەر کات سپی بوو. هیچ زیندەوەرێک، جگە لەئێمە بەدەشتو شاخەوە نەبوو. لەدەشتی هەواری (کۆترەل)ەوە، بۆ ناو شیوێک داگەڕاین. تادەهات چڕی بەفرو سەهۆڵبەندان پتردەبوو. نازانم بۆ ئێستا کامێرای ڤیدیۆ بەدوای ئەو جۆرە دیمەنە سەرسوڕهێنەرەنەردا ناگەڕێت. چاوی کامێرا ئەمڕۆ تەنیا راوی وێنەی دیمەنی سواوو باو نەماو دەکات: سەری دۆڵەکە ئەشکەوتێکی مەزن بوو، پێیان دەگووت: ئەشکەوتی (کونە کۆتر) یان (بەرتەنگی کۆترەل). رووبارێکی گەورە، بەخوڕو هاژەوە خۆی بەگەرووی ئەشکەوتەکەدا دەکرد. سەرچاوەی (زەڵم)م بینیبوو، لەکونی شاخێکەوە، رووبارێک هەڵدەقووڵێو وەکو تاڤگە دێتە خوارەوە. ئەشکەوتی (کونەکۆتر) یان (بەرتەنگی کۆترەل) رەنگە لەجیهاندا دەگمەن بێت: ئەشکەوتێک، رووبارێکی مەزن هەڵدەلووشێو کەس

---

*رینگۆ: پاڵەوانی فلیمێکی کاوبۆی بوو، ئەوکاتە لە سینەماکانی کوردستان پیشاندەدرا.

چارەنووسی نازانێ. ئەگەر ئەمە بۆ چاوی کامێرا دیمەنێکی سەرنجڕاکێش نەبێت؟ دەبێ چی سەرنجڕاکێش بێت. بەجارێ سەدان کۆتری کێوی دەدەنە شەقەی باڵ و سەدان دەنیشنەوە. دەمی ئەشکەوتەکە هێلانەی ئەو مەلانەیە.

ئێمە بەپەلە دەڕۆیشتین، و بەستەڵەکو شاخە بەفر، لەبەرزاییەکانەوە بۆ ناو شیوەکان هەرەسی هێنابوو. بەهێسترەوە، بەسەر شەختە زۆر ئەستوورەکاندا دەڕۆیشتین، سمیان رۆنەدەچوو. خوڕەو هاژەیەکی قایمی رووباری بن بەفرەکە بەشێوەیەکی سامناک بەرگوێمان دەکەوت. چەند جارێک بەسەر پردە بەفرینەدا، ئەمبەرو ئەوبەرمان کرد.

خدرە زوودی، لەتیرەی (زوودی) بوو، بەشێکن لە عەشیرەتی (مەنگوڕ). پیاوێکی چالاکو گورجو گۆڵ و وتو وریا بوو. دەتگوت دانی مارە. خدرەکەیتر وەکو ئەو نەبوو. دونیا بەرەو تاریکو لێڵ دەچوو، ئێمە بەبێ پرسیارو وەڵام دەڕۆیشتین. من ریشی خۆمم لەمستی ئەوان نابوو. پێم جوان نەبوو پرسیاری بەجێو نابەجێ بکەم. لەشاخەگەردن کەشەکان وورد دەبوومەوە.

خدرە زوودی وەکو بەور لەسەر پشتی هێسترەکەوە خۆی هەڵداشت. میل هێنانەوەو نیشان گرتنو ئەنگاوتن یەکێک بوو. من هیچم نەبینی، چۆن جاسوسی گرتو چۆن نێچیرەکەی بەدی کرد. هەر بەدوو قەڵەمباز خۆی گەیاندە سەر نێچیرەکە. ئێستاش لەخێراییو دەست راستی ئەو سەرم سووڕماوە. دەڵێن: هوونەکانی زەمانی زوو، توانیان زۆر گەلو هۆز بشکێننو تا ناوەڕاستی ئۆروپا داگیر بکەن، چونکە تێکڕا دەیانتوانی لەیەک

دەقیقەدا سی تیر بهاون. واتە: بەصەلیە تیریان تەقاندووە. لەوە دەچوو خدرە زوودی نەوەی ئەوان بێت.

یەکەمین جار بوو (چالەکە)* ببینم. گەر هەڵە نەبم بەئەڵەمانی داکسە (DACHS) یان خزمی داکسە. کاتێک لای ئۆروپییەکان دەمگـوت: "گۆشـتی چـالەکەم خـواردووە" گەزێـک دەمیـان دادەپچڕاندو چاویان دەپەڕییە پشتی سەریان. دەیان گوت:

((چۆن گۆشتی چالەکە دەخورێت؟)).

پێم دەگووتن: ماڵی برسێتیو نەبوونیم ئاوەدان کرد.

تەیـری وام خـواردووە، ئێسـتاش نـاوی نـازانمو نـازانم دەخورێت یان ناخورێت. جارێکیان باسی هەڤاڵێکم کرد، چۆن ورچێکی کوشتووەو لەبەر نەبوونی ئاگرو تینهێنانی برسێتی، دەستی ورچێکی بەکاڵی خواردووە. ئێستاش ئەگەر قورقوشم لەسـەر سـەریاندا بتوێنیتەوە، رەنـگە شێوەی ورچو چـالەکەو تەیرو تیوری سەیر دەرچێت.

دوور نەڕۆیشـتین، ئەوەنـدەی سـەرخەرمانێک، لەپـاڵ رووبارێکی بچووک رەشایی بەدی کرا. جێگەی (هەواری خاڵی) بوو. بڕێک کۆتەرەدارو ئەستووندەک کۆکرایەوە. خدر بەسێ قەڵەمباز خۆی گەیاندە ئەوبەری شیوێک. دوو فیشەکی تەقاندو بەچاوتروکانـدنێک لەو سـەرەوە بەدوو کەوی سـەربڕاوەوە گەڕایەوە. گوتی: "باش بوو خوا بۆ ئەم ئێوارەیە ئەمەی ناردو بۆ سبەی خوا کەریمە". توورەکە کرایە سەر هێسترەکان. بەپەلە ئاگرێکی گەورە کرایەوە. کورتانو سەرجلی هێسترەکان راخران.

---

* لەناو مەنگوڕ(چوالوو) و (کوڕە بەشە) شی پێدەڵێن..

جگە لەو تۆزە رەشـاییە، سەرانسـەری دۆڵەکە یەک پـارچە بەفـرو سـەهۆڵبەندان بـوو. کەوەکـان لەسـەر پەنگـر برژێنـران‌و بەنـانی سـەر سـێڵەوە، بەبێ ئێـوە نـاخۆش، خواردمـان. گۆشـتی چـالەکە پـل پـل بەزمەی کلاشـینکۆفەوە کـرا. هێـدی هێـدی دەبرژێنـراو دەخـورا. تـامی ئەو گۆشـت برژانـدنە ئێسـتاش لەبـن دانمـدایە. هەروەکـو رێزلێنـان سـەرجلێکی تـرم بەرکەوت‌و بەخۆممـدا دا. لەپەنـاوە کـۆتەرەدارو ئەسـتووندەک دەهـاوێژرایە سەر ئاگرەکە. تا نیوەشەو هەر گۆشتی برژاوو چای دیژلەمەمان بەسەردا دەکرد.

بـۆنی کورتـان‌و سـەرجل لەبـۆنی /بـۆس/ ئـارامز/ جورجیـو ئارمـانی/ شـانێل/ کینـزۆ/ ئەلیزابـت ئـاردن. . هتـد. خۆشـتر بـوو. سـەرەڕای کورتـان‌و سـەرجل‌و ئـاگر، هێشـتا هەر سـەرمام بـوو. تانیوەشـەو هەر گۆشـتی برژاومـان دەخـواردو چـای دیژلەمەمـان بەسـەردا دەکـرد. بەرێـکەوت یەک دووجارێـک لەئـوتێلی پێـنج ئەسـتێرەیی لەئیتالیـاو سویسـراو ئەڵەمانیـادا نووسـتووم، بەڵام هیچیـان ئەوەنـدەی ئەو شـەوەی قەنـدیل بیـرەوەری بەتامیـان لاجێنەهێشتووم.

مـانگی نیسـان زۆرجـار، بـۆ شـوێنگۆمکێ، لەنـاو دێهـات نەدەماینەوە، نەنوێن‌و پێخەف پێویست بوو، نەپاڵتۆی ئەستوور. سـەرمان بەبەردێکەوە دەنـاو تابەیـانی گـورگە خەومـان دەکـرد. لەنـاو دۆڵە کـپ‌و بێـدەنگەکانی قەنـدیل، لەبەر سـەرماو سـۆڵەو مەترسی جانەوەری کێوی نەمدەویست بەبێ ئێشککرتن بنووم.

بەیانی زوو هەڵساین، هێشتا کۆتەرەدارەکان نەکوژابوونەوە. بەپەلە نـان‌و چامـان خـوارد، بەرەو سـەرەوە کەوتیـنە رێ. سـەهۆڵبەندانێکی بێـوێنە. رووبـاری بەخـوڕ بەشـێک لەبەفـرو

سەهۆڵەکەی راماڵیبوو، بەشەکەیتری لەپەیکەری رمووزن دەچوون. ئەو رۆژە تادوای نیوەڕۆش هەر رێگەی بەفرمان هەڵشێلاوە. پاش نیوەڕۆ هەوراز هەڵکشاین. بەهۆی تیشکی هەتاوەوە، بەفرەکەی کردبوویەوە. هێسترەکەی خدر داچوو. هەرچیمان دەکرد، هێستر نەدەهاتە دەرەوە. بەراکێشان‌و پاڵنان پتر بەرەو خوار دەڕۆیشت. خدری داماو، بەدیار هێسترەکەیەوە، دەستی بەگریان‌و باوکەڕۆ کرد. یەکەمین جار بوو لەژیانمدا، پیاوێک ببینم لەبەر سەرما بگری. خدرە زوودی باش بوو ورەی بەرنەداو بەگرمەو ناڵەو هاوار هێستر هاتە دەرەوە. پێی گووتم: ((مامۆستا ئەمە "شێخ شەروە"یەو دەیان کەس لێرەدا بەچلەی هاوین رەق بوونەتەوە. پار لەبەر سەرما بڕنەوەکانمان سووتاند، هەر بۆئەوەی رەق نەبینەوە. دەزانم ماندوویت، هەر دوو دەقە وەستان‌و رەقبوونەوەت یەکێکە. لەودیوی ئەو بەندەنەی چەند ئەشکەوتێکی لێیەو لەویَ خۆت قایم بکە تائێمە دەگەینە لات..)) تا ناو ئەشکەوتەکان نەوەستام. ئەویَ با نەیدەگرتەوەو تۆزیَ کپ‌و گەرمتر بوو.

دەمەو ئێوارە بوو، سیَ ورچ لەبەردەممان‌دا قوتبوونەوە. لەسەر بەردێک بەتەنیشت یەکەوە دانیشتبوون‌و هەریەکە شتێکیان بەدەمەوە بوو، دەیانخوارد. بەخدرە زوودیم گوت: ((خدر ئەوە گوللەیەکیان پێوە نەنێین؟)).

ئەو یەکسەر گووتی: ((ئەم گردەی پشت ورچەکانت بینیوە؟ ئەوە رەبیەی پێوەیە. .)).

ئێستا بوایە رەنگە یەکسەر پێشنیازم بکردایە: ئەم ناوچەیە بکرایەتە پارکی پاراستنی ورچان. بۆ ئەوەی ئەوانیش وەکو زیندەوەرێکی هەڕەشە لێکراو شوێنی ژیانیان هەبێت. ئێمە ئەو

گەلەین چۆلەکە بەئاسمانەوە ببینین حەز دەکەین بەگوللەیەک دایگرینە خوارەوە، هەر بۆ ئەوەی بیسەلمێنین دەستمان زۆر راستەو هیچ عەیبێکمان نییە. گەلانیتر کامێرای ڤیدیۆیان پێیەو هەر شتێکی سەرنجڕاکێشیان بەرچاو بکەوێت یەک کاسێتی لەسەر پڕ دەکەنەوە.

ئێوارە تا دونیا تاریکی کردو هەتا توانیمان ڕێمان کرد. ئەم دیو بەفری پێوە نەبوو. داری گوێنی، کەدارێکی دڕکاوییەو لەکوێستان زۆر گەورە نابێت، لێرە گەورەتر بوو. شەو لەبن دارەکان ماینەوە. ئاگر بۆ چالێنان نەکرایەوە، بۆ ئەوەی کەس بەشوێنەکەمان نەزانێ.

تاریکو لێڵ بوو، کەوتینە ڕێ. دەمەو چێشتەنگاو گەیشتینە دۆڵێک. گوندێک تازە رووخێنرابوو، هێشتا دەمی دەرگاو پەنجەرەکان رووەو ئاسمان هاواریان دەکرد. ئاسمان خەمو پەژارەی دەباراند. سەرم لەکردەوەی دەوڵەتێک سوورمابوو (ئەمنی ستراتیجی)ی خۆی بەدێهات کاولکردن تێبگات. . پێشمەرگەکان هەودای بیرکردنەوەکەیان پچڕاندم. خدرە زوودی گوتی: ((دێهاتی ئەم دۆڵە سەرپاکی رووخێنراون. . )).

ئەشکەوتێکمان لەشوێنێکی نەدیو بەدی کرد. ئەم ئەشکەوتە ناوی ئەشکەوتی (نەدافان)ە. ئەشکەوتی (نەدافان) لە پردی (سۆبۆن)ەوە نزیکە. حەوت هەشت (پ.م)ی لێبوون. ئێمە یەکسەر دابەزینو چووین بۆ لایان. هەر بۆ ئەوەی دوا دەنگوباسی هێزی پ.م لەم دەڤەردا بزانین پاشان زانیم ئەمە بارەگای پاسۆکەو لەو رۆژەوە جەلالی حاجی حسەینم ناسی. جەلالی حاجی حسێن، یەکێک بوو لەسەرکردەکانی پاسۆک. بیرکردنەوەی ئەو لەسەر هێزە سیاسییەکان و سروشتیان،

لەهەموو هێزەکانی تر (واقیعی) تربوو. بەڕاشکاوانەش بیروڕای خۆی دەردەبڕی.

هێندەی پێ نەچوو دووسێ پێشمەرگە، کەیەکێکیان قادر خەبات بوو، بەگرمو هووڕو ناڵە ناڵ دەرکەوتو نامەکەی گیرفانی دەرهێناو خستیە بەردەممان. پێی گوتم: ((مامۆستا جەعفەر تۆ ناوەندی کۆمەڵە نیت؟ فەرموو بیخوێنەوە. . بیخوێنەوە. .)). نامەکە نووسراوێکی رەسمی توندبوو، سکرتێری گشتی بە مۆرو ئیمزای خۆی ئاراستەی خەباتی کردبوو.. نووسراوەکە یەک رستە بوو، کاریگەری یەک خەنجەری بۆ سەر دڵی خەبات هەبوو! لەو چرکەیەوە تێگەیشتم کاری تیۆریو کردەوە، هەر زۆر لەیەکەوە دوورن. لەکردەوەدا، بابەتی ئەوتۆ رۆژانە یەخەت دەگرێت، لەهیچ کتێبو فێرگەیەکدا لەسەری نەنووسراوەو نانووسرێت.

بەناو دۆڵەکەدا هەڵکشاین تا (دۆڵ بلویر). لە زۆر شوێن رێواس لاپاڵەکانی بەچڕی داپۆشیبوو. ناودۆڵەکە رەشو سارد بوو. چەند چادرێک لەوێ هەڵدرا بوون. مام جەلالو کاک نەوشیروانو د. مەحمود عوسمان لەوێ بوون. نزیکەی (٤٠) پ. م دەبوون.

ژیانی ئێرە هەر زۆر سەخت بوو. رۆژانە مەترسیی پەلامار هەبوو، یەک یەکو دوو دوو بەناو گژو گیادا بڵاو دەبووینەوە. هەر رۆژێ مووچەی پ. م و سەرکردەیەک تەنیا یەک خەپلەی بۆری تاڵ بوو. سێ خەپلە دەبوایە بەشی سێ رۆژی بکردایە. رۆژی ٥ی/حوزەیران/ی ١٩٧٨ گەیشتمە (دۆڵ بلویر). لەو رۆژەوە مام جەلالو نەوشیروانو د. مەحمودم ناسی. هێشتا ئەنجامی "حەملەی هەکاری" دەرنەکەوتبوو. ئەگەر بەهەڵەدا

نەچووبم، لەوێ وورده وورده دەنگوباسی لێدان‌و شکانی هەوڵی دانانی بنکەو بارەگا لەسەر سنوور، بۆ درامایەک شکایەوە. لەڕووی دەروونییەوە خەم‌و پەژارە بۆ چارەنووسی پڕۆژەکەو چارەنووسی هاوڕێیان‌و پێشمەرگەکان گەورە بوو .

ڕۆژی دووەمی (دۆڵی بلوێر) سێ نانم وەرگرت‌و کتێبێکم لەگەڵ خۆمدا برد، لەبەر پەلاماری کۆپتەر لەچادرەکان دوور کەوتینەوە. دەمخوێندەوەو گوێشم بۆ گورە گوڕی هەلیکۆپتەر هەڵخستبوو.

سەرم هەڵبڕی دیم مام جەلال لەپەنای بەردێکدا ئەویش دەخوێنێتەوە. پاش ڕۆژباش‌و چۆنی‌و چاکی، پێکەوە دانیشتین‌و کەوتینە باسی هەل‌و مەرجی شۆڕش‌و یەکێتی. ژمارەیەک نامەی ڕێکخستنی ناو شارو نامەی خۆی بۆ ئەوان بۆ خوێندمەوەو دایمێ. نیوەڕۆ یەک دوو نانی لەپەنای خۆی دانابوو، پێکەوە خواردمان. ئەو زەمانە مام جەلال ئەم ڕستەیەی بەبەردەوامی دووبارە دەکردەوە: ((زۆرجار سەرکردایەتی بزووتنەوەی ڕزگاری گەلی کورد، کۆڕی خەباتیان جێهێشتووە. ئێمە گەل‌و شۆڕش جێناهێڵین. با ئەمجارەیان گەر سەرنەکەوتین لەناو میللەتەکەی خۆماندا بمرین.. )).

## (١)

دۆڵ بلوێر، دۆڵێکە حەوت (کم) درێژ دەبێت و بەشێکە لە دۆڵی (باڵەیان). ئەگەر بە هێڵی هەوایی بیپێوین، نزیکەی (١٨)کم لەحاجی هۆمەرانەوە دوورە. ئێستا ڕێگەی ئۆتۆمبێلی هەیە و لە (قەسرێ)وە (٣٥ ــ ٤٠کم) دەبێت. ڕژێمی پێشوو، لەسەر لووتکەی (کۆلیتاری) [1] ڕەبییەکی سەربازی قایمی لێدابوو، کە بەسەر دۆڵی (باڵەیان) و قەسرێ و خانەقاو زارگەلی و ناودەشتدا دەیڕوانی. ئەگەر کەسێک بیەوێت بە پێیان لەدۆڵ بلوێرەوە بۆ حاجی هۆمەران بچێت، دەبێ: بە چیای پڕ خێڵند و دوولکە سەربکەوێت، ئینجا بۆ کویستانی (وێزێ) داگەڕێت، لەوێوە بۆ چیای (کۆدۆ) سەربکەوێت و لە (کۆدۆ)وە بۆ (حاجی هۆمەران) شۆڕبێتەوە.

ڕووبارێکی بچووک (ڕووبارۆکە) بەناوەڕاستی دۆڵ بلوێردا تێدەپەڕێ. ئاو خواردنەوەو دەست و دەموچاوشتنمان هەر ئەم ئاوە بوو. ئاوی (کانیە سپی) لەگەڵ دامیاوو[2] ئاوی (باتیوە)[3] و (باڕن)[4] و (ڕنوو)[5] تێکەڵاو دەبوون، ئەم ڕووبارە چکۆلانەیەیان پێکدەهێنا. ئاوی (کانیە سپی) دیاردەیەکی سروشتی تایبەتە: هەر

---

[1] چیای کۆلیتاری: بەسەر دیلماندا دەڕوانێت.

[2] دامیاو: ئاوێک کە لەبەفری تواوەوە دروست دەبێت.

[3] باتیوە: باتیو: بەفرێکە با لەدۆڵ و شیو کۆیدەکاتەوە و تا هاوین لەکویستان دەمێنێتەوە.

[4] باڕن: باتیوە

[5] ڕنوو: ڕنوو لە سلێمانی و شارباژێر ئەو بەفرەیە، کە باو بۆران لە لاپاڵێک کۆیدەکاتەوە، ئەگەر گەورە بێت (ڕنوو)ەو ئەگەر بچوکیش بێت پێیدەگوترێت: (پزوو) لە قەندیل (ڕنوو) واتایەکیتری هەیە: ئەوان بە (هەرەس) دەڵێن(ڕنوو)... تاد.

لەکانیەکەوە بۆ ماوەی (٤کم) کەفاوەو دەڕوات. پاشان ئاویتری تێکەڵاو دەبێت، ئیدی رووباری کەف نامێنیت و دەبێتە ئاوێکی ئاسایی!

دیوی رۆژهەڵاتی دۆڵەکە، هەر لەسەرەوە تا خوارەوە رێواسێکی ناسک و تەڕچک[6] بەچڕی دایپۆشیبوو. لە هیچ شوێنێکی کوردستان رێواسی ئەوەندە بەرزم نەبینیوە. پیاوێک بەدانیشتنەوە، لەدوورەوە نەدەبینراو گەڵای رێواس دایدەپۆشی. رێواسم لە ئۆروپا بینیوە سەرووی مەترێک بووە، ئەویش رێواسی کێوی نییە.

هەموو هێزەکەمان (٤٠ ـــ٥٠) پ. م دەبوو، کە بەشێکی ناتوانرێت لەخانەی شەڕکەراندا ناویان دابنرێت. هەر بۆ نمونە: چوار پ. م لەوێ بوون، بنەبەردێکیان بۆ خۆیان رێکخستبوو، بەو سەرمایە تێیدا دەژیان! سەروسمێڵیان بە بۆیاخی رەشی قەترانی رەش رەش دەکرد. نەوشیروان بە پێکەنینەوە دەیگوت: ((ئەمانە ناومان لێناون (عصابة الاربعة)[7].)).

(حاجی شێخەی بنزێری)** خۆی و فەقێ حەسەن و سێ چوار کەسیتر بۆ دیوی خانێ رۆیشتبوون، بۆ ئەوەی نان و ئاردو خۆراکمان بۆ پەیدا بکەن، لەوێ گیرابوون.

---

[6] تەڕچک: سەوزەو میوە، تازە لە دار کرابێتەوە و پیر نەبێت (بە مەجاز بۆ وەسفی ژنیش دەگوترێت..).

[7] گروپێک بوون لەناو حزبی کۆمۆنیستی چینی، یەکێکیان هاوسەرەکەی (ماوزەتۆن)بوو، نەیانتوانی دەست بەسەر (ح.ک.چ) دا بگرن، هەموویان گیران و لە زیندان توندکران.

** حاجی شێخەی بنزێری: پیاوێکی زۆر بەڕێزو سەربەرز بوو. ئەوکاتە بەرپرسیارێتی هەرێمی پارێزگای خرابووە ئەستۆی ئەو. بنزێری تیرەیەکە لەتیرەکانی ئاکۆ.

قادر خەبات، هەر خۆی قادر خەبات بوو. لە جوڵە و گورج و گۆڵی لـە بـەورو پڵنـگ دەچـوو. پیـاوێکی بـوێر، قسـەزان، هەقپەرست، ئەو خۆی بەخاوەن شۆڕش و کوردایەتی دادەنا و ڕێگەی نەدەدا، یەک کەس سادەترین قسەی رووشێنەری پێبڵێت. ئەوکاتـە پاراسـتنی سـەرکردایەتی کـەوتبووە ئەسـتۆی ئـەو. سـەرکردایەتی، ئـەو ماوەیـە لەهـەرێمی باڵـەیان نیمچـە "پەنابـەر" بوو: ئەرکی پارێزگاری و بژێوی و ڕێزانی، کەوتبووە ئەستۆی هـەرێمی باڵـەیان: لـەناو شـارو شـارۆچکە و دێهاتەکانـدا، تـۆڕی ڕێکخستنی دروستکردبوو، لەرێگەی ئەوانەوە دەنگوباس و چەک و تەقەمـەنی دەگەێنرایـە بارەگـا کاتیـەکان، هـەر لەرێگـەی ڕێکخستنەوە نان و چا و شەکر و رۆن پەیدا دەکران.

لەدەڤەری قەندیل، قادر خـەبات دینـەمۆی شـۆڕش بـوو. هـەر کەسێک پرسیاری لەخـەبات بکردایـە: ((لەکەیـەوە هاتویـە ریـزی شۆڕشـەوە؟))، هـەر یەکسـەر دەیگـوت: ((مـن نەچوومەتـە ریـزی شۆڕشەوە، من هەر لەپەنای قەندیلدا بووم، شۆرش بۆ لای من هـاتووە..)). خـەبات ئەنـدامی کۆمەڵـە بـوو. کاتی خـۆی پەیوەنـدی لەگەڵ مامۆسـتا جەعفـەر عەبدولواحید دلێرەوە دەبێت. خـەبات یـەکێک بـوو لـەو پێشـمەرگە کەمانـەی پـاش هـەرەس و نسـکۆی ١٩٧٥ لەشـاخ و ئەشـکەوتی قەنـدیل دەمێنێتـەوە و چـەکێکی زۆر دەشارێتەوەو چەک دانانێت.

پـاش هەڵگیرسـانەوەی شـۆڕش (١٩٧٦/٦/١) لـە چەنـدین ناوچـەی جیاجیـای کوردسـتان، دەسـتەی چەکـداری بچـووک بچـووک رووبـانکردە شـاخ و لەزۆربـەی دێهاتەکانـدا دەسـتیان کردە جموجۆڵ و چالاکی سیاسی و عەسکەری. خـەبات ئامێزی

بۆ کردنەوە و پێشوازی لێکردن و چەک و تەقەمەنی بۆ پەیداکردن و جێگەی حەوانەوەو کارکردنی بۆ دەستەبەرکردن.

هەڵۆکەی قەندیل، کاتێک بەرامبەرت دادەنیشت و دەدوا، وەکو پیاوێکی رۆشنبیر و بیر فراوان بۆچوونی خۆی دادەڕشت، هەستت بەوە نەدەکرد ئەم پیاوە هەل و مەرجی ژیان دەرەفەتی بۆ نەڕەخساندبێت سەردانی فێرگە و خوێندنگە بکات، سووربوونێکی قووڵ لەناخەوە هانیداوە فێری خوێندن و نووسین ببێت. لەهەر پێشمەرگەیەکی خوێندەوار، کە چاوی پێکەوتبێت و ناسیبێتی، لەبارەگا بووبێت، یان لەناو سەنگەردا، پیتێک فێر دەبێت و رستەیەک لەبەردەکات. ئەم پیاوە یەکێک بوو لەو کەسایەتییە دەگمەنانەی کورد، کە هەرچی نامە و بڵاوکراوەی بۆ دەهات، هەر هەمووی دەپاراست و ئێستا بنەماڵەکەیان خاوەن (٩٠٠) نامەی (م.س)و سەرکردە و کادر و پێشمەرگەکانن و ئەمەش گەنجینەیەکی بایەخدارە، کە خەبات بە جوانی هەر هەمووی پاراستوون و لەفەوتان رزگاری کردوون. زۆربەی سەرکردە خوێندەوارەکانیش یەک نامەی خۆشیان پێدەرباز نەکراوە.

لەشوێنی جیاجیای ناو چەمەکە، چوار چادر هەڵدرابوون. هەریەکەیان خەون و پەیام و جیهانبینیەکیان هەبوو. مام جەلال بەتەنیا چادرێکی هەبوو. زۆربەی کات خەریکی نامەنووسین و خوێندنەوە و پلان دانان بوو. دکتۆر مەحموود عوسمان و قادر جەباری* پێکەوەبوون و کۆمیتەی ئامادە کردن ــ پارتی

---

* پۆلای شێخ مارفی بەرزنجەیی ساڵی ١٩٧٨ لەناو چادرەکەی د. مەحموددا بوو. خۆی بە سەرکردەی (الجيش التحرير الشعبي لتحرير العراق) دادەنا. پۆلا ماوەیەک بەناوی (ج.ت.ش.ت.ع) کاری دەکردو ئەم سوپایە یەک سەربازی نەبوو. ئیدی

دیموکراتی کوردستانیان دروستکردبوو. ئەمانە پێیانوابوو، بەهاریکاری یەکێتی، جەماوەری پارتی دیموکراتی کوردستان بۆ لای خۆیان رادەکێشن و بەرە لەبن پێی سەرکردایەتی کاتی ـ پ. د.ک دەردەکەن. هەندێ جار دکتۆر مەحمود باسی هێڵی سێیەمی دەکرد: واتە باڵی بارزانی و مەکتەبی سیاسی سەرکەوتوو نەبوون و هەردوولا هەڵەیان کردووە و نەیانتوانیوە سەرکەوتن وەدەستبهێنن.. دکتۆر مەحمود بەناڕاستەوخۆ دەیویست ئەوە بەگوێی گوێگرەکانیدا بدات، کە ئەو، ئەو کەسەیە، کە سواری کەشتیی نوح بووەو هەر ئەو دەتوانێت گەلی کوردستان بەرەو لووتکەی سەرکەوتن بەرێت و دوو کەشتیەکەیتر بەرگەی تۆفان ناگرن و بن ئاو دەکەون.

ناوەندی کۆمەڵەش چادرێکی بچووکی دووکەسی هەبوو. ئەوانەی لەناو ئەم چادرەدا پێکەوەبوون، ئەمانەبوون: (نەوشیروان، فاخیر کەرکوکی ، د. حسێن، رەنجە، تایەر، فەرید ئەسەسەرد..). هەر یەکەیان چەک و تاقمی خۆیان پێبوو. هەریەکە دوو بەتانیی بەردەکەوت. کلاشینکۆف و تاقم دەبوونە سەرین، پێشمەرگەکان خەونی زەردو سوورو گڕداریان دەبینی.

رۆژی سێیەم، بەیانی زوو، بە لاپاڵێکدا هەڵگەڕام و لە پەنای بەردێکدا دانیشتم. دووسێ لاپەڕەم خوێندەوەو هەر لە پەناوە سێ چوار رێواسیشم پاک کرد. د. حسێن گوتی: ((رێواس بە ڤیتامین C دەوڵەمەندە...)). نەوشیروان بە هەناسەبڕکێ سەرکەوت و لەسەر بەردێک دانیشت و گوتی: ((ئێمە دەرفەتمان نەبوو، هەندێ قسە پێکەوە بکەین!)). دەستی ڕاستی بۆ

---

خۆیشی لەگەڵ دکتۆر مەحمود ساڵی ١٩٧٩ چوونە ناو حسک. ساڵی ١٩٨٠ گەڕایەوە بۆ ناو یەکێتی و پاشان خۆی و خێزانەکەی لە ستۆکهۆڵم جێگیربوون.

بەرباخەڵی چەپی شۆڕ کردەوەو ژمارەیەک نامەی دەرهێنا. مام جەلال نامەکانی لەناو جانتایەک دادەنا، ئەم جانتای پێنەبوو، گیرفان و بەربەخەڵەکانی شوێنی هەڵگرتنی نامەبوون. گوتی: ((ئەمانە نامەی رێکخستنەکانی ناو شارن. بیانخوێنەوە و ئەم یەک دوو رۆژە وەلامیان بدەرەوە!)). زۆر بەلایەوە سەیربوو، کاتێک گوتم: ((لەکوردی نووسیندا کۆڵەوارم و دەتوانم تەنیا بەعەرەبی بنووسم!)). ئەو لە قاقای پێکەنینی داو ئینجا گوتی: ((کێشە نییە، بە عەرەبی نامەیان بۆ بنووسە! ئەوە حەبیب محەمەد کەریمیش، کە ماوەیەک سکرتێری (پ. د. ک)بوو نەیدەتوانی بە کوردی بنووسێت و قسە بکات، تۆش هەمان کێشەت هەیە!)).

نەوشیروان گوتی: ((دێهاتی ئەم ناوە چۆڵکراون و ئەمە زیانی بەچالاکی ئێمە گەیاندووە. دێهات دەریاچەیە و پێشمەرگەش ماسی! ئاو وشککرا، ماسی ناتوانێت بژی..!)).

من گوتم: ((ئەی چەک و تەقەمەنی و ئازووقە چۆن پەیدا دەکرێت؟)).

ئەو گوتی: ((قورسایی کەوتۆتە سەرشانی رێکخستنی شارو شارۆچەکەکان..)). ئەو لەسەر قسەکردن بەردەوام بوو: ((ناوی ئەم هەورازو چەم و دۆڵانە دەزانیت ؟)).

من گوتم: ((تەنیا ناوی ئەم دۆڵە دەزانم، کە ناوی دۆڵ بلوێرە..)).

ئەو گوتی: ((ئەم هەورازەت بینیوە: گۆمی کرمە سووران لەوێیە. لەوە دەچێت پێش سەدان هەزار ساڵ دەمی بورکانێک بووبێت و ساردبووبێتەوە. ئاوی بەفرو باراناوی تێدا کۆدەبێتەوەو کۆتایی هاوین وشک ئەکاتەوە..)). هەواری دوو

سێ هۆبەی ڕەوەندەکانی لێیە و بۆ حەیوان لەوەڕاندن، ڕەشماڵیان هەڵداوە و لەوێ ئەمێننەوە..)).

من گوتم: ((هۆبە چییە؟)).

ئەو گوتی: ((ڕەوەندەکانی ئەم کوێستانە، هەریەکە جێگە و شوێنی خۆیان هەیە، شوێنەکانیش هەر بەرەبابێک هۆبەی خۆیان هەیە و بەگەرما ڕوودەکەنە هەوارەکانیان..)).

ئینجا گۆرانییەکەی حەسەن زیرەک تێگەیشتم:

ئەوە مانگ هەڵات، وەی دای لەناو هۆبە

ماچ کردن خۆشە، وەی نۆبە بە نۆبە

ئەو پاسپۆرتەکەی دایە دەستمەوە و گوتی: ((من ماوەی چوار پێنج ساڵ لە ڤیێنابووم و لەوێ سەرقاڵی نووسینی نامەی دکتۆرابووم..)).

من گوتم: ((لە نەمسا بە ئەڵەمانی قسە دەکەن؟)).

ئەو گوتی: ((ئەڵەمانیا و نەمسا و زۆرینەی سویسرییەکان بە ئەڵەمانی دەدوێن...)).

من گوتم: (نازییەکان ئەو هەموو هەڵلاوبگرەیان لەسەر ڕەگەزی ئاری نابووەوە، لەڕووی زمانەوە، هەست بە نزیکایەتی لەنێوان کوردی و ئەڵەمانیدا دەکرێت؟)).

ئەو گوتی: (( ئەڵەمانی و کوردی، لەڕووی زمانەوە، هەر زۆر لەیەکەوە دوورن و تەنیا چەند وشەیەکی زۆر کەم هەن، لەیەکەوە تۆزێک نزیکن..)).

من لەبەرئەوەی ئەوکات هیچ زانیارییەکی ئەوتۆم لەسەر زمانی ئەڵەمانی نەبوو، زۆر لەسەری نەڕۆیشتم..*

نەوشیروان گوتی: ((جیڤارا ماوەی دوو ساڵ و نیو بەشاخەوە بووە، کەچی ئەم هەموو بایەخەی پێئەدرێت و لەسەرانسەری جیهاندا، ناووناوبانگی بەشێوەیەکی ئەوتۆ دەنگی داوەتەوە، مرۆڤ سەری سووڕ ئەمێنێت. ئێمە دوو شۆڕشمان یەک لەدوای یەک هەڵگیرساندووە و نزیکەی (١٥ ـ١٦) ساڵە بەشاخەوەین و شۆڕش ئەکەین و یەک کەسیش باسمان ناکات

---

* پێویستە ناوەندێکی زانستی زمانەوانی، لێکۆڵینەوەیەک تەرخان بکات بۆ نزیکایەتی وشەی ئەڵەمانی و کوردی. بێگومان ژمارەیەک وشە هەن لەیەکەوە نزیکن:

| کوردی | ئەڵەمانی | فارسی |
|---|---|---|
| نوێ | نۆی | نو |
| نۆ | نوین | نه |
| تۆ | دوو | تو |
| برا | برووده‌ر | برادر |
| کچ،دوێت | تۆختەر | دختر |
| دێ | دۆرف | |
| داڕشتن | دارشتیلن | |
| ڕاست | ڕێشت | راست |
| بان(ڕێگاوبان) | ئۆتۆبان | |
| ناو | نامە | نام |
| برۆ | براون | أبرو |
| لێو | لیپە | لب |
| ترێ | تراوبە | |
| لاشە | لایشە | |
| هەنگوین | هۆنیگ | |
| ماندوو | مویدە | |
| مانگ (ئاسمان) | مۆند | ماه |
| مانگ (کات) | مۆنات | ماه |

و بەهیچیشمان نازانن! پێشمەرگەمان هەیە، لەساڵی (١٩٦١)ەوە چەکی بەشانەوەیە و کەسیش ناوی نازانێت؟)).

من گوتم: ((پێتوانییە هۆکارەکە ئەوە نەبێت شۆڕشی کوبا لەبن دەستی ئەمریکاو دژی ئەمریکابوو. کاسترۆ و جیڤارا هەر یەکسەر شەقڵی سۆسیالیستییان بە شۆڕشەکەیانەوە ناو کوبایان کردە بنکەیەک بۆ هەموو بزاڤە رزگاریخوازەکانی جیهان..)).

نەوشیروان قسەکانی منی پێخۆش نەبوو((ئێمەیش جوڵانەوەیەکی چەپمان هەیە و دژی رژێمە دیکتاتۆرو کۆنەپەرستەکان خەبات دەکەین. چۆن خەڵکی کوبا داوای مافی رەوای خۆی کردووە، ئێمەش داوای مافی رەوای خۆمان ئەکەین..)).

من گوتم: ((دووساڵ ماوەیەکی کورتە بۆ خۆ بەجیهان ناساندن، کە بزووتنەوەکەی ئێمە، بزووتنەوەیەکی چەپ و لەبەرەی سۆسیالیستییە.. بە درێژایی پەنجا ساڵی رابووردوو شۆڕشی گەلی کورد، تا رادەیەک ناوچەیی و داخراو بووە ـ شۆڕشی ئەیلوولی لێدەرچێت ـ شەقڵی چەپیشی پێوە نەبووە..)).

ئەو گوتی: ((جیڤارا دووساڵ و نیو شۆڕشی کرد!)).

من گوتم: ((ئەوان بە دووساڵ و نیو سەرکەوتنیان بەدەستهێنا.. ئێمە رەنگە بە دە ساڵی تریش نەتوانیین حکومەت بگۆڕین! ئەوان یەکسەر سیستێمی سۆسیالیستیان راگەیاندووە!)).

نەوشیروان مژێکی قووڵی لەجگەرەکەی دا و ئەم پرسیارەی لێکردم: ((هەواڵنامەی ژمارە (١)ت بینیوە؟)).

من گوتم: ((دەستتان خۆش بێت، لەم شاخ و کێوە ئەم هەواڵنامەیە دەربچێت کارێکی زۆرباشە و کاک حەمە سەعید

بەش بەش ستینسڵەکانی رادەست کردم و منیش دەمخوێندەوە و یەک دوو بۆشایی هەبوو، بەدەنگ و باس و هەواڵەکانی قەرەداخ و گەرمیان پڕکرایەوە..)).

((هیچ سەرنج و تێبینیت لەسەری هەبوو؟))، دەموچاوی لەناو تەپ و دووکەڵ دیار نەما کاتێک ئەم پرسیارەی لێکردم..

لەناو ئەم هەموو شەڕو شۆڕو هەڵلاوبگرە و راکە راکەیەدا((دەرکردنی یەک بڵاوکراوەی بچووکیش کارێکی قورسە)) .. دوای سەرکەوتن دەتوانین چاپخانەی نوێ بەکاربهێنین و گۆڤاری زانستی و رووناکبیری بڵاوبکەینەوە..)). ئەمە کۆمێنتی من بوو لەسەر پرسیارەکەی ئەو..

ئەو گوتی: ((من و مام جەلال هەموو هەواڵنامەکەمان نووسیووە..)).

من گوتم: ((بە کوردییەکی جوان نووسراوە.. هەرچەند کوردیەکەی من باش نییە و هەندێ رستە و وشە تێنەگەیشتم.. هەر بۆ نمونە: داوودەزگا چییە؟)).

نەوشیروان گوتی: ((داوودەزگا: مؤسسة))یە!

من گوتم: ((نووسەرانی کورد دەنووسن دامودەزگا)).

ئەو گوتی: ((دام ودەزگا لەفارسیەوە وەرگیراوە..)).

من گوتم: ((چۆن؟)).

ئەو گوتی: ((لەهەندێ وشەی فارسیدا (م)هەیە و لەکوردییا دەبێتە (و) وەکو (نام) لەکوریدا دەبێتە (ناو). لەفارسیدا (همشهری) لەکوریدا دەبێتە (هاوشاری)، تاد..)).

من گوتم: ((لەمەودوا ئەگەر هەوڵبدەین هەندێک وشەی رەسەنی کوردی بدۆزینەوەو لەجیگای وشە بیانییەکان بەکاریانبهێنین چاکتر نییە؟)).

ئەو وەکو یەکێک شتێکی بیر بکەوێتەوە، لە قاقای پێکەنیندا: ((با شتێکی خۆشت بۆ بگێڕمەوە: کاتی خۆی من و مامۆستا برایم ئەحمەد لەچۆمان بووین، کتێبی چەپکێک لەوتەکانی ماوتسی تۆنگمان تەرجەمە دەکرد. پێویستیمان بە هەندێ چەمک و زاراوەی سەربازی بوو. ئێمە زاراوەی سەربازیمان نییە وەکو (کمین) چەند دزو جەردەیەکی بەسالاچوومان دۆزییەوە، ئەوان گوتیان کەمین دانان: بۆسە نانەوەیە.. ئێمە پاش ئازادکردنی کوردستان دەبێ دێ بەدێ کێومالی ناوچەکان، لەڕووی زمانەوانییەوە، بکەین. دڵنیام وشەی زۆر جوان ئەدۆزینەوە..)).

لەم دانیشتنەدا هەستم کرد، نەوشیروان پیاوێکی زۆر کراوەو قسە خۆش و بێ پێچ و پەنایە. لەدڵی خۆمدا گوتم ئەوانەی قسەیان لەسەر کردووە، دیارە بە هەڵە لەکەسایەتیی ئەم پیاوە تێگەیشتوون و ئەگەر وەکو من نەوشیروانیان لەنزیکەوە بناسیبایە، شێوەی بیرکردنەوەیان دەگۆڕا:

ساڵی ١٩٧٣ نەریمان دەربەند فەقەرەیی* پێیگوتم: ((کۆمەڵە کێشەیەکی زۆر گەورەی هەیە، ئەویش کێشەی نەوشیروانە..)).

من گوتم: ((ئەو پیاوێکی رووناکبیرەو سەرنووسەری گۆڤاری رزگاری بووە**!)).

---

* نەریمان مەحمود: لەبنەماڵەیەکی نیشتمان پەرەوەرەو لەشۆڕشی ئەیلول کادرو پێشمەرگە بوو. ساڵی ١٩٧٠ یەکێک بوو لە دامەزرێنەرانی کۆمەلە لەشاری خانەقی، وێرای (صەلاح حەسەن، دارای مەلا عەبدوللا، نەسرەدین رۆژبەیانی). ئێستا لەشاری ڤینا دەژێت.

** ناظم گزار: بەڕێوەبەری گشتی (الامن العامة) بوو. ساڵی ١٩٧٣ ویستی احمد حسن البکر و صەدام حسین بکوژێت. کودەتاکەی سەرکەوتوو نەبوو، رژێم ئیعدامی کرد.

نەریمان گوتی: ((دەستی بڕوات لە (ناظم گزار)*** خراپتر دەکات..)).

من گوتم: ((ئێستا لە ڤینا نییە؟ تۆ بڵێیت ژیان و فەرهەنگی ڕۆژاوا کاری تێنەکردبێت؟)).

نەریمان گوتی: ((ڕاستە ئێستا بۆ ئۆروپا سەفەری کردووە، بەڵام هەر گۆڕانێک لەوڵات ڕوویدات و بگەڕێتەوە ریسەکەمان لێدەکاتەوە بەخوری. ئەم پیاوە تەنیا بڕوای بە کوشتن و بڕین و زەبروزەنگە. لەنزیکترین کەس و هاوڕێی خۆی دەسپاریزی ناکات!)).

زێڕۆی عەبە ڕێوی* لەخڕي نێوزەنگ پێیگوتم: ((کاک نەوشیروان ئێستا کەسایەتی ژمارە یەکی ناو کۆمەڵەیە. هەر دەڵێی هەوری بەهارە، یان بارانی ڕەحمەت دەبارێنێت، یان هەورەبروسکە و گرمە و ناڵەیە. ئێوارە میزاجی خۆشە، پێدەکەنێت، بە دەیان نوکتە وقسەی خۆش دەگێڕێتەوە. سبەی دەیبینی هەروا دەزانیت کاک نەوشیروانەکەی دوێنێیە، دەچیت بۆ لای و دەڵێیت: (( کاکە ئەوە گیان بەیانیت باش..)). بە شێوەیەک بەرووتدا هەڵدەشاخێت و دەتشکێنێت و پەشیمانت دەکاتەوە، هەروەکو ئەوەی نە تۆی دیبێ و نە بتناسێت و خوێنێک لەنێوانتاندا ڕژابێت..)).

---

*** گۆڤاری رزگاری: گۆڤارێک بوو کۆتایی شەستەکانی سەدەی پێشوو، نەوشیراون و شازاد صائب لەسلێمانی دەریان دەکرد.

* زیرۆ: خۆی نامەی بۆ دەنووسیم، نەیدەنووسی (زیرۆ عەبدوڵلا) بۆیە من وەکو ڕێزێک ناوەکەی وەکو خۆی دەنووسمەوە. ماوەیەک فەرماندەی هەرێم بوو. پیاوێکی بەڕێزو خاوەن ئەزموون و دڵسۆز بوو. ئەو یەکەمین کەس بوو وشەی (لێپێچانەوە)ی لەنووسیندا بەکارهێنا. دەیگوت: لەمەرگە دەڵێن: لێپێچینەوەی لەگەڵدا بکە. لێپێچینەوەی لەگەڵدا کردم.. تاد..

## دەنگوباسی هەکاری

## (٢)

چوار پێنج رۆژێک لە (دۆڵ بلوێر)ماینەوە.. سەرەتا مام جەلال هەر زۆر شادی و خۆشی پێوە دیاربوو، دەیگوت: ((چاوەڕوانی نامەی کاک عەلی دەکەین، بارەگا دابنێن و خۆیان جێگیر بکەن و بە ئێمەیش بڵێت: وەرن! ئێمەیش لێرەوە بە چوار پێنج رۆژێک دەگەین. لەچەند شوێنێک مەترسی هەیە، ئەوەش چارەسەر دەکەین..)). شەوان مام جەلال و دکتۆر مەحموود گوێیان لە BBC و مونتیکارلۆ دەگرت. رووماڵکردنی پەیامنێرەکانی ئەو دوو رادیۆیە بەدڵی مام جەلال نەبوو: بە روونی لەزاری بەرپرسە بالاکانی پ. د. ک هەواڵەکانیان دەگواستەوە، کە هێزەکانی ی. ن. ک تووشی تێکشکانی عەسکەری قورس هاتوون.

رۆژێکیان (مینە کووپە) دەرکەوت، بەرێکەوت هەموو لەبن چادرەکەی د. مەحموود بووین. ئەو دەنگوباسی ئەمسەرو ئەوسەری دونیای پێبوو. روویکردە مام جەلال گوتی: ((دەنگوباسی ناو تورکیا ئەوەیە، هێزە سیاسییەکانی تورکیا بەسەر دوو بەرەدا دابەش بوون، لایەک جەلالین وەکو بولەند ئەجەڤید و لاکەیتر مەلایین وەکو سلێمان دیمیرێل... تاد)).

ئەو تیشکی خستە سەر رووداوەکانی هەکاری و گوتی: ((هێزەکانی ئێوە لەسەر سنوور نەماونەتەوە و بەرەو قووڵایی خاکی تورکیا رۆیشتوون..)). مام جەلال قسەکانی (مینە کووپە)ی پێباشنەبوو، لەناو ئەو هەموو دەموچاوە جۆراو جۆرەدا هەندێک

رازو نهێنـی لەسـەر ڕووداوەکـان بـدرکێنێت، قسـەی بەسـەر قسـەکانی ئـەودا هێنـاو بـواری نـەدا، قسـەکان تـەواو بکـات. بەناڕاستەوخۆ تێیگەیاند، دواتر دوو قۆڵی دادەنیشن و بوار هەیە بەدڵی خۆی قسەکانی بکات..

من لەنەوشیروانم پرسی: ((مینە کووپە کێیە؟)).

ئەو گوتی: ((من نازانم ئەم مینە کووپەیە چییە مام جەلال ئەوەنـدە دڵ بـە قسـەکانی خـۆش ئـەکات! ئـەم کابرایـە پیـاوی سـاواکە و بـۆ ئـەوان کـار ئـەکات و پروپاگەنـدەی سـاواک بڵاوئەکاتەوە کەچی مام جەلال پێیوایە: کە ئەم ڕاستیەکانی بۆ ئـەو ئەگێڕێتـەوە بـەڵام ئـەم پیـاوە خـەڵکی سـەرگەڵوە و پاش هەرەسی ١٩٧٥ ڕووی کردۆتە ئەودیوو لە زێوە دەژێت و بە ئاشکرا بۆ ساواک کار ئەکات..)).

مام جەلال پێشمەرگەیەکی نارد بەدوای من و نەوشیروان دا. دیـاربوو، قسـەکانی مینـە کووپـە و بـی بـی سـی و مونتیکـارلۆ کاریـان تێکردبـوو. بێدەنگی هـەڵبژاردو قسـەی لەسـەر بابەتەکـە نەکرد و هیچی لای ئێمە دەرنەبڕی، ئەو گوتی: ((ماوەیەکە ئێمـە لێـرەین. پێویسـتە ئـەم جێگایـە بگـۆڕین و لـەدیـوی دۆڵـەنێ چـاوەڕوان بـین. ئەگـەر هـەڤالان لـەوێ جێگیربـوون، هـەروەکو ئـەوەی پێشـتر پلانمـان دانـابوو، ئـەوە ئێمـەیش بـۆ لای ئـەوان دەچین...)).

نەوشـیروان گـوتی: ((ئـەم هێـزەی لێـرە ماوینەتـەوە، هێزێکـی بچووک و کەم ئەزموونە..)).

مام جەلال گوتی: (لەودیو چەند مەفرەزەیەکی پەراگەندەمان هەیە و دەتوانین کۆیان بکەینەوە. ئێمە دەبێ حیساب بۆ هـەموو ئیحتیمالاتەکان بکەین..)).

ئەو جانتا دیپلۆماسییەکەی کردەوەو دوو بەستە دە هەزار دیناری دەرکردو گوتی: ((من بەدووری نازانم لە هێرشێکی سوپای رژێمدا، ئەم سێیەی پێکەوە دانیشتوین، دووانمان شەهید بکرێن. سێیەم دەبێ درێژە بە شۆڕش بدات و پەیوەندی بە هەڤالانی ترەوە بکات. ئەوە (١٠.٠٠٠) دە هەزار دینار بۆ کاکە نەوەو (١٠.٠٠٠) دە هەزار دینار لای مامۆستا جەعفەر بێت و (١٠.٠٠٠) دە هەزار دیناریش لەلای خۆم دەمێنێتەوە. ئەم بڕە پارەیە هەر بۆ ئەوەیە، ئەگەر شتێک روویدا، هەریەکەمان شتێکی لەبەر دەستدا بێت بۆ ئەوەی ئیدارەی خۆمانی پێ بدەین، تا باری شۆڕش راست دەکرێتەوە..)).

پاش نیوەڕۆ، بارەگامان لێکنایەوە، باری پێنج شەش هێستریک دەبوو، بەرەو کێوی (شێخ شەروە) تیانتەقاند. پێشمەرگەکانی ئەوێ دەیانگوت: ئێمە بەدوو سەعات لەدۆڵ بلوێرەوە بۆ دۆڵەنێ بە پێیان دەچین. ئێمە رێگەکەمان بە (٧) سەعات بڕی. جارێ لەم دیو بووین، تاریک داهات. لاپاڵە رژدو سەختەکان، چەند چینێک رنووی سەدان ساڵەی پێوە نووسابوو. لەبەرد رەقتر، لەکاشی لووسی سابوناوی خزتر بوو. پێشمەرگەکان بە حەربە و قۆناخی تفەنگی بڕنەو شوێن پێیان هەڵدەکۆڵی. لەوە دەچوو مام جەلال لەگەڵ سروشتی قەندیل نامۆبێت: چەند هەنگاوێک دەڕۆیشت و دەخزی. چوار پێنج پێشمەرگە ئەملاو ئەولایان دەگرت. شیوەکان زۆر قوول بوون. ئەوەی بەردەبووەوە، بەزیندوویەتی سەرنەدەکەوتەوە. توولە رێکان هەر لە (پردی سیرات) دەچوون. بەربوونەوە، هەریەک جاربوو. کەسیش نەیدەتوانی بەدواتدا بێت و بۆ سەرەوەت بهێنێتەوە.

پێشمەرگەیەک پێمگەیشت و گوتی : ((ئەوە مام جەلال بۆ تەنیا یەک پ. م پارێزگاری لێدەکات؟)).

من گوتم: ((من و ئەم دوو پێشمەرگەیە، بەوردی چاودێری دەکەین و پارێزگاریشی لێدەکەین. پێنج شەش پێشمەرگەیەک لە لاپاڵە رژد و هەڵەمووتەکاندا، ئەملاو ئەولایان گرتووە بەرنەبێتە خوارەوە. ئێستا ئەوان فریای هێسترەکان کەوتون و ئاگایان لە مام جەلال نەماوە..)).

پێشمەرگەکە گوتی: ((پیاو خراپێک لەم ناوە بێت، دەتوانێت هەر زۆر بەئاسانی مام جەلال بکوژێت و بۆیشی دەربچێت..)).

من گوتم: ((خەمت نەبێت! راستە ئەو ئاگای لە ئێمە نییە پارێزگاری لێدەکەین، بەڵام ئێمە هەنگاو بە هەنگاو ئاگامان لێیە و رێگە نادەین کەس لێی نزیک بێتەوە..)).

# خدره چکۆڵ
## (٣)

ناوی (خدر محەمەد ئەمین عوسمان)ە، لەدایکبووی (١٩٦٤)ە لە پشتئاشان. لەناو هێزی پێشمەرگە و دێهاتی بناری قەندیل بە (خدرە چکۆل) ناسراوە. رۆژی ١٩٧٦/٧/٢١ وێڕای (عوسمانە چکۆل)ی برا گەورەی، دوو قۆڵی دەچنە ریزی شۆڕشەوە. خدر ئەوکاتە تەمەنی (١١ ـ ١٢) ساڵی بوو، واتە: منداڵترین پێشمەرگە بوو، بەلام بە ورەیەکی بەرزو شارەزایی لەکاروباری پێشمەرگایەتی.

مانگی ئەیاری ١٩٧٨ ئەو هێزەی لەگەڵ مام جەلال بوون، نە دەتوانن بگەنە لای هێزەکەی عەلی عەسکەری لەبرادۆست و نە دەتوانن لەدۆڵی باڵەیان بحەسێنەوە، چونکە سوپای عیراق، بەشێک لەدێهاتەکانی راگواستبوو، جموجۆڵ و هێرش و پەلاماریشیان پەرە پێدابوو. لەدیوی ئێرانیشەوە، سپای ئێران سنوورەکانی تەنیبو، هەلیکۆپتەری هەردوولاش بەچڕی چاودێریی رێگاو دۆڵ و شاخەکانیان دەکرد..

حاجی شێخەی بنزێری و چەند (پ. م)ێک لە ئاستی گوندی (دۆڵەنێ) و (بادیناوا)وە، بە مەبەستی نان پەیداکردن روودەکەنە ئێران، لەوێ سەربازی ئێرانی دەیانگرێت و بۆ ماوەی سێ مانگ زیندانیان دەکات.

قادر خەبات و چەند پ. م، سنوور دەبەزێنن و نان و خۆراک و پێویستی بۆ بارەگای کاتی سەرکردایەتی رەوانە دەکەن. هێزی پاسەوانی سنوور، رێگایان پێدەگرێت و دەیانگێڕێتەوە.

یانزە رۆژ لەسەر یەکتر، خەبات نان و خۆراک رەوانە دەکاتەوە، هەر یانزە جارەکە لەسەر سنوور، بارەکان دەگیرێن و بەدەستی بەتاڵ دەگەڕێتەوە.

مام جەلال، قادر خەبات دەنێرێتەوە، چونکە برسێتی بڕست لە هێزەکە دەبڕێت و هیچ شتێک بۆ خواردن نامێنێت، تەنیا ئەسپێکی لات نەبێت، کە پێشمەرگەکان مرخی لێخۆش دەکەن. بڕیار دەدرێت سامان گەرمیانی و خدرە چکۆل و (١٢) پ. م بۆ نان پەیداکردن تۆڕی خۆیان هەڵبدەن و گەمارۆکە بشکێنن.

دەیانەویت لە (گەلی توان)ەوە بۆ دێهاتی (گەزگەزکێ) و(ماشکان) بڕۆن. هاتنی هەلیکۆپتەر ناچاریان دەکات، لەبن (کەوی بەفر)* خۆیان بشارنەوە، بەشێکیان دەچنە کونە ورچێکەوە، کە مام ورچ لەبنەوە دەنەڕێنێت و هەلیکۆتپەریش بە ئاسمانەوە بۆ دەرزی لەناو کاداندا دەگەڕێت. خدر شارەزای جۆری گژوگیای کوێستانان و بن بەفر دەبێت وەکو : (کەرکۆڵ) و (تالیتۆس) و (خون) و تاد.. سەرەڕای تفتی و تیژی لەبرساندا هەندێکی دەخۆن.

قادر خەبات، ئەم جارەیان چەند فەردەیەک نان و دوو مەشکە خورما دەهێنێت و هەردوولا بەیەک دەگەن. خەبات، نان و خورماکە رادەستی پێشمەرگەکان دەکات و خۆی بۆ ناو گوندەکان دەگەڕێتەوە. پێشمەرگەکان بە پەلە بۆ بارەگای کاتی سەرکردایەتی بە باری سەنگین و رەنگینەوە دەگەڕێنەوەو هاوڕێکانیان لەچنگی ئەژدیهای مەرگ رزگار دەکەن.

---

* کەوی بەفر: بۆشایی بن شاخە بەفرە، بەهۆی ئاوەوە ئەشکەوتە بەفرینە دروست دەبێت، مرۆڤ دەتوانێت لەبن کەوی بەفر خۆی بشارێتەوە..

# ڕێوی

## (٤)

کوێخاکانی مەنگوڕ کە خۆیان بە خاڵی (یەکێتی)* دادەنا، لەرۆژانی تەنگانە و پشێویدا لە دۆڵ بلوێردا چوار پێنج کوێخایەک بەیەکەوە دەرکەوتن. سەردانی خوشکەزاکەیان دەکرد و بەدەنگییەوە دەهاتن. بیستبوویان گوشار دروستبووەو دەبێ دڵسۆزی خۆیان بنوێنن، خۆیان گەیاندە لامان. پێش ئەوەی بگەنە لای ئەو، ڕێویەک دەبینن و دەیکوژن. لەناو عەشایەری کوردی سوننە مەزەبدا دەڵێن: ((گۆشتی ڕێوی هەزار دەرد دەپەڕێنێت)). کوێخاکان دەگەنە لای مام جەلال و دەڵێن: ((ئەو ڕێویەمان بۆ هێناویت..)). ئەویش بە خۆشیەوە دیاریەکەیان لێوەردەگرێت و دەیداتە دوو (پ. م) لەسەر چەمەکە کەوڵی بکەن و پارچە پارچەی بکەن و پاک بیشۆن. ئەم دیاریە لەکاتێکدابوو، پێشمەرگەکان خەریک بوو لەبرسا دەمردن: لە عێراق و ئێرانەوە، سوپای هەردوولا، ڕێگاکانیان داخستبوو، هەر لەبەیانیەوە تا ئێوارە هەلیکۆپتەر دەسووڕایەوە، تارمایی هەر گیانلەبەرێکی بدیبایە بەر گوللەیان دەدان.

ئەحمەد گۆخلانی و پێشمەرگەیەکیتر، لاکی مام ڕێوی بۆ سەر چەم دەبەن. دەیگروون و پەل پەلی دەکەن و پاژ پاژ دەیشۆن. لە هاژەی چەم ئاگایان لەتەپەی پێ و خشەخش نامێنێت. مام جەلال و پێشمەرگەیەک بەرێکەوت چاویان بە

---

* دایکی مام جەلال ناوی خەدیجە حوسێن کوێخا ڕەسول مەنگوڕ بووە، بۆیە مەنگوڕەکان خۆیان بە خاڵی مام جەلال و یەکێتیەکان دادەنا.

پێشمەرگەکان دەکەوێت، لەپشت سەریانەوە دەوەستن و سەیری دەست و پلیان دەکەن و گوێیان بۆ رادەدێرن:

ئەحمەد گۆخلانی دەڵێت: ((گۆشتی رێوی چۆن دەخورێت؟ ئەمە زۆر سەیرە بەخوا گۆشتی کەریشی دەستبکەوێت، هەر دەیخوات..)). ئەو پێشمەرگەیەی لەگەڵ مام جەلال دەبێت، بە نووکە پێ بە ئاسپایی تێوەی دەژەنێت. سەیری پشت سەری دەکات، دەبینێت مام جەلال بە گۆچانەکەیەوە وەستاوە. مام جەلال دەڵێت: ((ئەوە مەبەستت کێ بوو: هەرچی دەست بکەوێت دەیخوات؟)). ئەحمەد گۆخلانی بۆ قسە دادەمێنێت و یەکسەر پینەی دەکات: ((مەبەستم ئەم رێویە بوو.. رێوی دەعبایەکی زۆر سەیرە هەرچی دەستبکەوێت دەیخوات.. گۆشتی کەریشی دەست بکەوێت دەیخوات..)).

# دۆڵەنێ

## (٥)

دۆڵەنێ؛ دۆڵێکە باکوور و باشووری زۆر سەختە و لووتکەی (شـەمۆڵ) بەسـەر ئـەم دۆڵـەدا دەڕوانێـت. لوتکـەی (قەنـدیل) و لوتکــەی (قووچبــاش)* دەکەونــە باکووریــەوە. ((قووچبــاش) بــەرزترین لوتکـەی زنجیـرە چیـای قەندیلـە و لێـرەوە ئـاگری کــەرکوک دەبینرێــت. رووبــارێکی بچــووک بــەناو دۆڵــەنێ دا تێدەپەڕێت. لەزۆربەی کەنارەکانیەوە (شاخە بـەفر)ی بەسـەرەوە بوو، تا بەرەو سەرەوە هەڵکشایە قەوارەی بەفرەکە ئەستوورتر دەبـوو. ئـەم شـوێنە لـە (خـانێ)وە زۆر دوور نییـە و لـەدێهاتی ئــەوێوە خــۆراک و ژیوارمــان پێدەگەیشــت. دۆڵــەنێ لــەمانگی حوزەیرانــــدا لـــەچاو دۆڵەکۆگـــە و بێـــدەلان و ســـونێ زۆر ســاردتربوو، لـەچاو هـەواری (شـێخ ئـایش) گـەرمێن بـوو. مـام جـەلال چـادرێکی هـەبوو، کۆمەڵـەش چـادرێکی هـەبوو. هـەر دە مەترێک لەیەکەوە دوور بووین. ئەو بن شـاخەکەی هـەڵبژارد و ئێمــەیش لەکــەناری چەمەکــەوە هاوســنوور بــووین. دەســتەی پێشمەرگەکانی مام جەلال* وشکەکەڵەکێکیان کردبووە نشینگەی

---

* بەرزترین لوتکەی قەندیل ٣٤١٤ مەتر بەرزە.

* دەستەی پارێزگاریی مـام جـەلال ئەمانەبوون(سـامان گـەرمیانی، عـادل شـوکر، مارف عوسمان عەسکەری، سەلاح چاوشین، کامەران عارف، عەبدوللای حاجی عەزیز، شێرکۆ، هێمن (قەیسەر)، دلشاد قەلادزەیی، ئەحمەد گۆخلانی، شێخ فەتاح، مام رەسول.. تاد)

خۆیان، هەر لەوێش ئاگریان دەکردەوە و چا لێدەنرا و ناندێنیش بوو. کۆمەڵێک مەنجەڵ و قاپیان هەبوو. ئێمە مەنجەڵێکی بێ سەرە مەنجەڵ و کتری و کوپی چینکۆی رەش داگەڕاومان هەبوو.

چوار پێنج هەنگاوێک، بەرامبەر چادرەکەی کۆمەڵە، بەردێکی سپی زلی لێبوو، بنەکەی کەسێک یان دەعبایەکی کێوی هەڵیدڕیبوو، مرۆڤ دەیتوانی بە چوار مەشقی تێیدا دابنیشێت. نەوشیروان بەتانی و تفەنگ و تاقمەکەی بۆ ئەوێ گواستەوە، بەردەمی کونەکەی بە نایلۆن داپۆشی و تا بەرەبەیان هەر جگەرەی دەکێشا. بەیانییەکی درەنگ لەکون هاتە دەرەوە. دەم وچاوی دابوو بە یەکا، مات، مەلوول، ریش هاتوو.

من رۆژباشم لێکرد و هەواڵم پرسی و ویستم بزانم نەخۆش نییە، یان دەنگوباسی خراپتری نەبیستووە؟

ئەو گوتی: ((ژانەسەرێکی زۆر توندم هەیە!)).

منیش گوتم: ((ئەوە دکتۆر حسێنە و هەندێ حەب و دەرمانی لێوەربگرە!)).

ئەو گوتی: ((ئەم ژانە سەرەی من جیاوازە..)).

من گوتم: ((چۆن جیاوازە؟)).

ئەو گوتی: ((ئەزانیت مگرێنە ** چییە؟)).

من گوتم: ((هێشتا نەمبیستووە!)).

---

**مگرێنە: Migräne چەمکێکی پزیشکیە، لە لاتینی و گریکی و فەرەنسیەوە وەرگیراوە. کەسێک تووش بوو نیوەی سەری دێشێ و هەندێ جار تووشی رشانەوەش دەبێت

گوتی: ((ئەزانیت (شقیقە)چییە؟)).

گوتم: ((بە عەرەبی جۆرێکە لەژانە سەر: صداع نصفي.. پێ دەڵێن..)).

ئەو گوتی: ((ئەوانەی تووشی شەقیقە دەبن، نیوەی سەریان باش خوێنی بۆ ناچێت. من کە تووشم دەبێت، هەندێ جار لەسەر سەر ئەخولێمەوە..)).

دکتۆر حسێن کادرێکی (سازمان انقلابی ایران) بوو، خۆی و بەشیری خوسرەوی لەگەڵ مام جەلال گەڕابوونەوە. دکتۆر حسێن دەیویست بەهۆی ئێمەوە کوردی فێربێت، ئێمەیش ئەومان کردبووە ئامرازی فێربوونی زمانی فارسی. ئەو دوو سێ ساڵ لە ئەڵمانیا کۆلێجی پزیشکی خوێندبوو. دەستی لە کۆلێجی پزیشکی هەڵگرتبوو، چووبووە کۆلێجی ئەندازیاری. لای ئێمە ئەو دەرزی و دەرمانی پێیبوو، رەنگە ژیانی چەندین کەسی لەمردن رزگار کردبێت.

(سازمان انقلابی) رۆژنامەیەکیان بڵاودەکردەوە بەناوی (ستارەء سرخ) واتە: ئەستێرەی سوور ـ زۆربەی ژمارەکانی پێکەوە لە بەرگێکدا بەجوانی چاپ کرابوون. رۆژنامەیەکی (ماوی) تیۆری بوو، دەنگوباسی سیاسیی تێدا بڵاودەکرایەوە. بۆ یەکەمین جار لە (ستارەء سرخ) وێنەیەکی ئایەتوڵڵا خومەینیم بەرچاو کەوت.

لەدکتۆر حسێنم پرسی: ((خومەینی کێیە؟)).

ئـەو گـوتی: ((گـەورەترین سـەرکردەی ئۆپۆزسـیۆنی ئـاینیی ئێرانە دژی رژێمی شا خەبات دەکات. ئەمڕۆ لەشاری نەجەف دەژێـت و کاریگـەری لەسـەر کۆمـەڵی ئێـران هێگجـار زۆرە..)). رەنجـەو فـاخێر زۆر لەنەوشـیروان بێزاربـوون. مـن نامـەویَ قسـەکانیان لەسـەر ئـەم لاپەڕەیـە بنووسـمەوە. چونکـە پێشـەکی بریـارم داوە، هـەموو شـتێک نەنووسـم و خـۆم لـەزۆر بابـەت بپـارێزم. شـەوێک لەگـەڵ پێشـمەرگەیەکیتردا، بـەرەو ئێـران رۆیشـتبوون. فـاخیر یـەکێک بـوو لـەو کەسـانەی تەقـەی لەپارێزگاری سلێمانی کردبوو. ئەو بەراشکاوانە دەیگوت: ((من نەوشیروان بەسەرکردەی خۆم نازانم. ئەم پیاوە ناتوانێت رێزی خەڵک بگرێت و حەز دەکات هاورێکانی خۆی بشکێنێت و خەڵک بە کۆیلەی خۆی دەزانێت)).

ئـەو شـەوەی رۆیشـتن، سـەرونامەیان بـۆ نەوشـیروان جێهێشتبوو*.

من و فەریدو تایەرماینەوە. پاش نیوەڕۆی هەمان رۆژ؛ شێخ شـەماڵی باخ و ئـازادی سـەگرمە و مـەلا عـەلی و دڵشـاد تـۆفیقی حـاجی بـاقی بەنگینـە و حەمـە رەزای قایکەنـدی هـاتن. ئـازادی سـەگرمە، وەسـتای سـوعبەت و وروژانـدنی هەنـدێک لەپێشمەرگەکان بوو.

بەتایەری گوت: ((کاک تایەر لەشار کاری چیت دەکرد؟)).

تایەر: ((لە سوپای عیراقدا نایب زابت بووم!)).

---

*بڕوانە: نەشیروان مستەفا ئەمین، لەکەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ ل٢١١.

ئازاد: ((ژنت هێناوە؟)).

تایەر: ((ژنم هێناوە و دوو منداڵی وردم هەیە!)).

ئازاد: ((مووچەکەت چەند بوو؟)).

تایەر: (( مانگی نەوەت دینارم موچەم وەردەگرت! نەوەت دینار!)).

ئازاد: ((رێکخستنەکەتان ئاشکرابوو، یان حکومەت ویستی بتگرێت؟)).

تایەر: ((نە لەرێکخستن بووم و نە حکومەت ویستی بمگرێت!)).

ئازاد: ((ئەی بۆ هاتیتە دەرەوە؟)).

تایەر ئیدی بەسەرو پۆتەلاکی خۆیدا دەهاتە خوارێ و بەم شێوەی خوارەوە خۆی جوێنباران دەکرد، رۆژی پێنج شەش جار بە لای کەمەوە بەخۆی دەگوت: ((ئەی تایەری سەگی سەگ باب)).

نایب زابت نەبووی؟

ژنی جوانت نەبوو؟

مانگی نەوەت دینارت وەرنەدەگرت؟

ئۆتۆمبێلت نەبوو؟

خانووت نەبوو؟

ناو ماڵت نەبوو؟

ئەی لەچیت کەم بوو؟

ئازاد و دڵشاد ئەملاو ئەولایان دەگرت، ئیدی ئەو وەکو مەنجەڵی شیری سەر کووره هەڵدەچوو. بەیانیانێک لەخەو هەستاین، تایەر لەناو جێگاکەی نەبوو. لای دەستەکەی مام جەلال پرسیارمان کرد، هیچ کەسێک چاوی پێنەکەوتبوو.. بەره بەره دڵنیابووین ئەویش رێگای ئێرانی گرتۆتەبەر..

# حزبێکی نوێ
## (٦)

ئێمە لەبەردەم چادرەکەی خۆماندا وەستابووین. چا لێنرابوو، خۆمان گەرم دەکردەوە، هەریەکە کوپێک چامان بەدەستەوە گرتبوو. مام جەلال بۆ لامان هات. ئەویش چایەکی فڕکرد. ئەو گوتی: ((پێش ئەوەی هێزەکانمان بەرەو برادۆست بکەونەڕێ، من و کاکە نەوە و کاک عەلی و دکتۆر خالید لەنۆکان کۆبوونەوەیەکمان کردو بڕیارمان دا لەوێ سەرکردایەتییەکی نوێ دروستبکەین وحزبێکی مارکسی نوێ دامەزرێنین و ئەم ناوانە پەسەند کران بۆ سەرکردایەتی ئەم حزبە نوێیە: خۆم، کاکە نەوە، کاک عەلی عەسکەری، د. خالید، مامۆستا جەعفەر، ئازاد هەورامی و... تاد)).

من گوتم: ((من لەکەسم نەبیستووە کاک عەلی عەسکەری خۆی بە مارکسی دانابێت: ئێستا چۆن دەبێتە مارکسی؟)).

نەوشیروان بە تووڕەبوونەوە گوتی: (( ئەی تۆ چۆن دەتوانی ببیتە مارکسی ئەو بۆ ناتوانێت ببێتە مارکسی؟)).

من گوتم: ((یەکێک بە درێژایی ژیانی، خۆی بە مارکسی دانەنابێت، ئێستا چۆن لەپڕ شێوەی بیرکردنەوەی خۆی دەگۆڕێت؟)).

نەوشیروان گوتی: ((تۆ لەنزیکەوە کاک عەلی ناناسیت. ئەو ڕەزامەندی لەسەر ئەوە دەربڕیوە لەناو ئەم حزبە نوێیەدا کار بکات..)).

ئەوکاتـــە ســـەرقاڵی کـــارو کاردانـــەوەو دەرهاویشـــتەکانی ((کارەسـاتی هـەکاری)) بـووین، بۆیـە نەمپەرژایـە سـەر ئـەوەی پرسـیارێک لـە مـام جـەلال بکـەم پڕۆژەی ئـەو بـۆ دروسـتکردنی حزبێکی نوێ چۆن چۆنە؟

پـاش ماوەیـەک بـۆم دەرکـەوت، بـەگوێرەی تێگەیشـتن و بۆچـوونی مـام جـەلال، ئیـدارەدانی یـەک حـزب ئاسـانترە تـا ئیدارەدانی سێ رێکخراوی نـاکۆک و ناتـەباو چەکدار. یـەکگرتنی بەشێک لەسەرکردەی سێ باڵەکەی لەناو سـەرکردایەتی حزبێکی نوێدا، سێ باڵەکە هەریەکەیان لەجێگەی خۆی دەتوێتەوە.

تێکشـکانی (حەملـەی هـەکاری) پلانـەکانی مـام جـەلالی بـۆ پێکهێنانی یەک حزبی سیاسی، یـان گۆرینی (ی. ن. ک) لـە نیمچـە بـەرەوە بـۆ حزبێکـی (یـەکگرتوو) سـەر لەبـەری خەونەکەی هەڵوەوەشاندەوە..

# جیاوازی

## (٧)

بەیانیانێک خۆمم دابووە بەر بەرۆژ. مام جەلال لەناو چادرەکەی هاتە دەرەوە، پاش رۆژباش و چۆنی و چاکی: ((دەزانی وێنەمان پێکەوە نییە..). مام جەلال بەڕوویەکی گەشەوە قسەکانی کرد.

من گوتم: ((کامیرام بە کەس نەدیوە، تا داوای لێبکەین وێنەیەکمان پێکەوە بگرێت!)).

مام جەلال گوتی: ((من کامیرایەکی کۆداکم هەیە!)). قسەکانی کردو بۆ ناو چادرەکەی خۆی گەڕایەوە، بەدەم رێوە بانگی کردم. لەوێ چوار مەشقی دانیشتم و بەدەستی خۆی وێنەیەکی بۆ گرتم. یەکسەر بە دەنگێکی پڕ لەسەرسوورمان گوتی: ((دەزانیت لەم وێنەیەدا تۆ رێک لەعەبدولوەهاب ئەتروشی دەچیت!)).

من گوتم: ((من عەبدولوەهاب ئەتروشیم نەبینیوەو تەنانەت وێنەکەیشم بەرچاو نەکەوتووە..)).

مام جەلال گوتی: ((ئەوانەی لەناو ئەم شۆڕشەدا بەشداری دەکەن، زۆربەیان هاروهاج و چوختی و فرەزانن. تۆ زۆر بێدەنگ و کەمدوویی، دڵنیام هەرکەس هەڵسا، مافت دەخوات، دەبێ من زۆر ئاگام لێت بێت و بەردەوام پشتیوانیت لێبکەم بۆ ئەوەی مافەکانت نەخۆن..)).

لەچادرەکــە هاتینــە دەرەوە، نەوشــیروان قســەی بــۆ شــێخ شەماڵ و مەلا عەلی دەکرد. نەوشیروان گوتی: ((من بەڵێنم بە مـام جـەلال داوە، تـا مـاوم دەبـێ پشـتیوانی لێبکـەم و پشـتی بەرنەدەم و خیانەتی لێنەکەم. ئەگەر گوللەیەک بێت و بزانم بەر مـام جـەلال ئەکـەوێ، مـن خـۆم ئەخەمـە بـەردەم ئـەو گوللەیـە... تاد)).

لە زۆر بۆنەدا نەوشیروان ئەم قسەیەی لەبەردەم مام جەلال دووبارە دەکردەوە. لەدڵی خۆمدا دەمگوت: گوللە بەو خێراییە بێت، کێ دەتوانێت خۆی بخاتە بەردەمی؟

# گەڕانەوەی ئۆدیسی

# (٨)

هێشتا لەدۆڵەنێ بووین لەکۆی سەدان پ. م تەنیا هەشت پ. م توانیبوویان یەکبگرنەوە و بە سەلامەتی پاشەکشە بکەن، کە ئەمانە بوون:

١. تاهیری حاجی عەزیز.

٢. مەحموود زەردۆیی.

٣. رەفیق پارەزانی.

٤. حەمەڕەش گریژەیی.

٥. جەمالی عەلی باپیر.

٦. بەکرەسوور.

٧. ئاوات گەڕدێیی.

٨. محەمەدی حاجی مەحمود.

سەدان کیلۆمەتریان بڕیبوو تا گەیشتبوونە (دۆڵە گۆستە)، لەو سەرێشەوە بە نەشارەزایی، دێ بەدێ و شاخ بە شاخ، گەڕابوونەوە. ئەم گەڕانەوەیە لەلایەکەوە زۆر شادمان و بەختەوەری کردین، کە هەشت کادری عەسکەریی پێشکەوتوو، ویستێکی پۆلایین پاڵی پێوەناون، ئەو رێگا دوورودرێژە ببڕن. لەلایەکیترەوە وردەکاری هەڵە و کەمووکوڕیەکانیان دەگێڕایەوە، کە بوونەتە هۆی تێکشکان و لەناوچوونی ئەو هێزە گەورەیە: لەماوەی (٢٠) رۆژدا هێزەکان بەبێ ئەوەی هیچ ئامانجێک وەدیبێنن و قازانج بەگەلی کوردو شۆڕش بگەیێنن و لەپێناوی "هیچ"دا هەڵوەشێنرانەوە. لەکاتێکدا ئەگەر لوولەی تفەنگەکان

رووبەڕووی بەغـــدا بکرانـــایە، رەنـــگە ئەنجـــامە سیاســـی و سەربازییەکان بەجۆرێکی تر بوونایە...

ئۆدیســـێ Odyssee کەســـایەتیەکی ئەفســـانەییە، شـــایەک لەشـاکانی یۆنـانی کۆن بـووەو بەشـداری لـەداگیرکردنی تـەروادە (ترۆیـا) کـردووە، لەگەڕانـەوەدا، لـەدەریا تۆفـان و ڕەشـەبایەک هەڵـدەکات، کەشـتیەکان لـەرێگای دەریـایی تووشـی هەڵـە و سەرلێشێوان دەبن. ئەم رێگا لێتێکچوونـە بیست سـاڵی پێدەچێت و ئۆدیسـێ تووشـی جـەنجاڵ و شـەڕو شـۆڕو رووداوی سـەیر دەبێت. هۆمیرۆس لـە سـەدەی (٧ـ ٨) پێش لـەدایکبوونی مەسـیح ئەم داستانەی بەشیعر هۆنیوەتەوە.

(ئۆدیسـێ)ی کـوردی هەشـت پ. م، بـە بـەرچاوی خۆمانـەوە روویداوە، هیچ نووسەرێکی کوردیش تاقەتی نـەبووە چوار پێنج دێڕیـان لەسـەر بنووسـێت، ئەمەیـە تێگەیشـتنی ئێمـە بـۆ مێژووی مۆدێرنی خۆمان.

# بەرخلیسك

## (٩)

هەواری نوێمان بەرخلیسک بوو، مام جەلال هەستی کرد، قەوارەو پانتایی کارەساتەکە زۆر گەورەیە و پێویستی بە (هەرەوەزی سیاسی) یەو هەر لایەک چمکێکی بارەکە بەرزبکاتەوە. کۆبوونەوەیەک کرا، سەرکردەی هێزە جیاجیاکانیش بانگهێشت کرابوون:

١. د. مەحمود عوسمان و قادر جەباری کۆمیتەی ئامادەکردن ـ پ. د.ک.

٢. جەلالی حاجی حسێن ـ پاسۆک.

٣. قادر عەزیز و حاجی حاجی برایم، بسک ـ ی. ن. ک).

٤. نەوشیروان و مامۆستا جەعفەر (کۆمەڵە ـ ی. ن. ک).

ئەم کۆبوونەوەیە لەکاتێکدابوو، دڵنیابووین هێزەکەی یەکێتی لەهەکاری وردو خاش کراوەو سەرکردەکان (عەلی عەسکەری، دکتۆر خالید سەعید، شێخ حسێن بابە شێخ، ئازاد هەورامی، م. عومەر، .. تاد) و هاوڕێکانیان دەست بەسەرن. د. مەحمود و جەلالی حاجی حسێن بەرچاویان زۆر روون بوو. جەلالی حاجی حسێن گوتی:

((چەند مانگێک لەمەوپێش من کاک ئیدریس بارزانیم بینیوە، ئەو ئامادە نییە هیچ ڕێکەوتنێک لەگەڵ یەکێتیدا بکات. ئەوان نایانەوێت هێزێکی وەکو یەکێتی لەسەر ساحەکە هەبێت: ڕێکەوتن و نزیکبوونەوە لەگەڵ پ.د.ک لەم کاتەدا: کات بە

فەیرۆدانە و هیچیتر. ئەوان ئێستا خۆیان بەسەرکەوتوو دەزانن، چۆن گوێ لەئێوە دەگرن؟)).

دکتۆر مەحمود بەهەمان شێوە، بەروونی بیری دەکردەوە و گوتی: ((سەرکردایەتی پارتی، لەرووی عەسکەرییەوە، سەرکەوتنی بەدەستهێناوەو بڕوای بەوە نییە لەگەڵ ئێمەدا رێک بکەوێت، هەر رێکەوتنێکیش بکات رێکەوتنێکی کاتی دەبێت و ئەگەر سوور نەزانێت قازانجی خۆی تێدا دەبێت نایکات! ئێمە پێویستە پەیوەندی نێوان خۆمان چاک بکەینەوە و هەوڵبدەین هێزەکانمان بکەینە یەک..)).

قادر عەزیز و حاجی حاجی برایم و رەسوڵ مامەند لایەنگری ئەوە بوون: لەگەڵ سەرکردایەتی پارتیدا هێورکردنەوەو خاوکردنەوە هەبێت، بەشەڕ و شۆڕ هیچ بەهیچ ناکەین! دەبێ گفتوگۆو دانوستاندن و ئاشتەوایی هەبێت. قادر عەزیز گوتی: ((دەبێ هەرچی هێزو توانامان هەیە بیخەینە گەڕ بۆ رزگارکردنی هەڤاڵانمان (مهما كلف الامر)..)). قادر عەزیز (مهما كلف الامر)ەکەی زۆر بە توندی گوت. من خۆم لەقسەکانی ئەوە تێگەیشتنم: ئەوان ئامادەن هەموو تێگەیشتن و رێکەوتنێک لەگەڵ پارتیدا بکەن، بە مەرجێک عەلی عەسکەری و دکتۆر خالید و هەڤاڵەکانیان ئازاد بکرێن و بگەڕێنەوە. ئەم هەڵویستەی ئەوان جوامێرانە بوو، چونکە نێوان عەلی عەسکەری و رەسوڵ مامەند شیرو تیر لەیەک سووین بوو، نەک گوڵ و گوڵزار.

مام جەلالیش دەیویست کێشەکە تێپەڕێنێت و باش گوێی بۆ هەموو لایەک رادەدێرا و گوتی: ((نامە بۆ ئەسەد دەنووسم بۆ ئەوەی دەوری خۆی بگێڕێت و گوشار بخاتە سەر پارتی.. تاد)).

# ئەتەویٚ کەسێك بکوژیت؟
## (١٠)

بەرامبەر یەکتری دانیشتبووین. من کتێبێکم بەدەستەوەبوو، شانم دادابوو. نەوشیروان دەینووسی و تەپوودووکەڵی لێبەرزدەبووەوە. لەپڕ سەری هەڵبڕی و ئەم پرسیارەی لێکردم:

((مامۆستا جەعفەر تا ئێستا کەست نەکوشتووە؟)).

((نەوەڵلا تا ئێستا کەسم نەکوشتووە! ))، من بە پێکەنینەوە وڵامم دایەوە.

((ئەتەویٚ کەسێک بکوژیت؟)). ئەو قەڵەمەکەی لەسەر کاغەزەکان داناو ئەم پرسیارەی لێکردم و مژێکی لەجگەرەکەی داو چاوەڕوانی وەڵام بوو.

من لەدڵی خۆمدا گوتم: خودایە دیارە ئەرک و فرمانەکانی ناوەندی کۆمەڵە فرە ـ سەر و فرە ـ پەل و پۆن: دادگاییکردن و حوکمدان و جێبەجێکردنیشی دەکەوێتە ئەستۆی ئێمە و ئەمە یەکەم مەلەفە، کە رووبەڕوومان دەبێتەوە.. ئەمە راهێنانە بۆ ئەوەی من ببمە((میر غەزەب)). و ((سەرپەڕێنەر)). ئەمەیە ((کەسی گونجاو بۆ شوێنی گونجاو)).

یەکەمین چرکە پێموابوو، مەسەلەکە سوعبەتە و نەوشیروان دەیەوێت من تاقیبکاتەوە، بۆیە گوتم:

((هەر کەسێک جاش و جاسووس و بەکرێگیراوبێت، فوو لەئاو ناکەمەوە..)). کتێبەکەم لەسەر بەردی قەراخ چادرەکە داناو سەیری پێشمەرگەکانم کرد، کە لەدەرەوە وەستابوون...

((جاسووسـێکمان گرتـووه و پێمخۆشـه تـۆ بیکوژیـت!)). نەوشیروان وەڵامەکەی منی پێخۆش بوو، وایزانی هەنگوینی لەدارا دۆزیوەتەوە. بەفەرید ئەسەسەردی گوت: ((بڕۆن ئەو کابرایە بهێنن)).

پاش چەند دەقیقەیەک کوڕێکیان هێنا، باڵابەرز، سووروسپی، جوانخـاس، قژێکـی رەش، لەبـەردەم تیشـکی هەتاودا دەبریسـکایەوە، تەمەنی (١٤ ــ ١٥) سـاڵ دەبـوو. تـووک و گەنـدەموو بـەدەم و چاویـەوە نـەبوو. چـوار پێـنج پیشـمەرگە ئەملاوئەولایان گرتبوو..

نەوشیروان گوتی: ((ئەمە جاسوسەکەیە بڕۆ بیکوژە!)).

بەچاو دەمبینی و بەدڵ بڕوام نەدەکرد. ئەم منالە جاسوس بێت و نەوشیروان بڕیاری وا بدات!

گوتم: ((کامیان جاسووسە؟)).

نەوشیروان ئامـاژەی بـۆ ئـەو مێردمنالـە کـرد، کـە لەپـەنای بەردێک وەستابوو، پێشمەرگەکانیش ئەم لاو ئەولایان گرتبوو..

((ئەمـە هـەر زۆر منالـە کـاک نەوشـیروان!)).مـن بەسەرسووڕمانەوە وەڵامی نەوشیروانم دایەوە.

ئەو گوتی: ((جاسووسە و دەبێ بکوژرێت!)).

من گوتم: ((مێرمناڵێکی وا ببێ بە ئاگر کوێ دەسووتێنێت؟)).

ئەو گوتی: ((پیاوخراپی بەمنالی و گەورەیی نییە..)).

من گوتم: ((ئەمە خۆی دانی پێداناوە، کە جاسووسە؟)).

فەرید ئەسەرد گوتی: ((ئەمە خۆی کردۆتە کەڕولاڵ)).

من گوتم: ((ئەی لەرێکخستنەوە نامەتان بۆ هاتووە، کە ئەمە جاسووسە؟)).

نەوشـــیروان گـــوتی: ((نـــەخێر لەرێکخســـتنەوە هیچمـــان پێنەگەیشتووە!)).

مـن گـوتم: ((رێکخسـتن هیچـی لەسـەر نەنووسـیبێت، لـەهـیچ لایەکـەوە زانیـاری لەسـەری دزەی نـەکردبێت، خـۆی کردبێتـە کـــەرِولاڵ و دانـــی بەهیچـــدا نـــەنابێت، ئـــەی چـــۆن دەزانـــن جاسووسە؟)).

نەوشیروان گوتی: ((ئێمە خۆمان دەزانین ئەمە پیاو خراپە..)).

مـن گـوتم: ((لـەهیچ شـوێنێکی ئـەم جیهانـە ئـەم جۆرە دادگایـە لەئارادا نییە، بەبێ بەڵگە خەڵک بکوژرێت.. چۆن ئێمـە دەبـێ بـەم شێوەیە بڕیار لەسەر مان و نەمانی خەڵک دەربکەین؟)).

نەوشـیروان گـوتی: (( تـۆ ئەتـەوێ بیکوژیـت، یـان ناتـەوێ بیکوژیت؟)).

مـــن بـــەروونی پێمگـــوت: (( بـــە هـــیچ شـــێوەیەک نـــاتوانم بەردێکیشی تێبگرم..)).

نەوشیروان بەو چوار کەسـەی گوت: ((برۆن! بیبـەن بۆ ئـەو چەمە..)).

مـن هـەروام زانـی دەیبەنـەوە بـۆ شـوێنەکەی خـۆی، نـەمزانی لەوێ (لەناو چەم) تیرباران دەکرێت..

شـاخەکانی دەوروبـەری بەرخلیسـک ئەگـەر زمانیـان هەبوایـە، دەبوایــە تــا دونیــا دونیایــە ئــەو تاوانــەیان بــۆ بــەفرو بــاران بگێڕایەتەوە..

## هەڵە بە هەڵە چارەسەرکردن
## (١١)

نیوەی یەکەمی ساڵی ١٩٧٨ یەکێتی تووشی زیان و کارەساتی جەرگبڕ بوو. رۆژی ١٩ی حوزەیران سێ بەشی سەرکردایەتی و هێزی پێشمەرگەی یەکێتی تووشی تەفروتوونابوون و دارمان بوو. دەبوایە سەرکردایەتی یەکێتی هەوڵی بدایە برینەکان سارێژ بکاتەوە و گرژیەکان خاوبکاتەوەو بەدوای سەرەتایەکی نوێدا بگەڕێت. لەو چرکەیەدا، کە رۆژانە دەنگوباسی تێکشکان و هەڵە و شەهیدبوون و دەربەدەربوونی هەڤاڵەکانمان پێدەگەیشت، نەوشیروان نامیلکەیەکی لەبن ئەم ناونیشانە نووسی: ((رێکخستن بەهێز بکەن! رێکخستنی کملک بەهێز بکەن و یەکێتی بیرورا، ویست، رێکخستن و کردەوە لەریزەکانیدا بەدیبهێنن!)) بەشێکی برگەی (٨) و (٩) هێرشێکی زۆر توندوتیژ بوو بۆ سەر (بسک) ئەمەی کەی؟ لەکاتێکدا دوو لەسەر سێی هێزەکانی (ی. ن. ک) پلیشێنرابوونەوەو یەکێتی سەرکردایەتی نەمابوو! رەسوڵ مامەند چووبووە سەنگەرەوە و نەیدەتوانی ئەو جوێنباران و داشۆریە قبووڵ بکات: لەبڕگەیەکدا نووسیبووی: ژمارەیەکی زۆر جاسووس و بەکرێگیراو و جەردە، دز، داوێنپیس خۆیان خزاندۆتەوە ریزەکانی (بزوتنەوە)وە. رەسوڵ مامەند هەڕەشەی جیابوونەوەو دژایەتی یەکێتی کرد. حاجی حاجی برایم و قادر عەزیز چەند جارێک

هات و چۆیان کرد. د. مەحمود عوسمان و قادر جەباری و جەلالی حاجی حسێن هەموو توانای خۆیان خستەگەڕ بۆ هێورکردنەوە.

دکتۆر مەحمود گوتی: ((نامیلکەکە با چاپبکرێتەوەو ئەو برگەیەی تێدا نەبێت، کەعبە کەچ نابێت! ئەمە کەی کاتی رەخنەو رەخنەکارییە..)). قسەکانی دکتۆر مەحمود کاریگەری خۆی هەبوو، ئەو دوو سێ دێرەیان سڕیەوە ((بەشێک لە برگەی (٨) و (٩)).) ئاوێک بە ئاگرەکەدا کرا. هەرچەند ئەم نامیلکەیەو قسەو جوێنەکانی نەوشیروان رۆژانە بەرگوێی رەسول مامەند دەکەوت. (بسک) ئاگربەستەکەی پێباشبوو. لەو کاتەوە خرپی نێوزەنگ بووە (جەمسەر)ێکی دژ بەمام جەلال و کۆمەڵە. ئەو دڵشکاوەکانی کۆدەکردەوە، پەیوەندی لەگەڵ سەرکردە سەربازی و سیاسیەکان دەبەست تا ١٩٧٩/٣/٢١ بزوتنەوە بە ئاشکرا جیابوونەوەی خۆی راگەیاند. نیوەی هێزەکانی یەکیتی، لە چەمی نۆکان چوونە ئەو بەرەوە و لە (حسیک) ئالان.

# دکتۆر مەحمود عوسمان
# (١٢)

حــــەزم دەکــرد قســـەکانی دکتـــۆر مـــەحمود وەک خـــۆی بنووسمەوە، بـەڵام وەک دەڵـێن قســەی نێـو مـەجلیس ئەمانەتـە (المجالس بالامانة) و من نامەوێت کـەس دڵی گـەرد بگرێت، هـەر لەبەرئەوەی من حەزمکردووە نوکتەیەک بگێڕمەوە، کە ئەو پیاوە لەبۆنەیەکی تایبەت و هەل و مەرجێکی جیاوازدا گێڕاویەتیەوە.

د. مـەحمود، بـە پیشـە پزیشـک بـوو، تـا سـاڵی ١٩٧٥ ئەنـدامی مەکتـــەبی سیاســـی (پ. د. ک)بــوو، پــاش (١٩٧٥) رێکخراوێکــی دروستکردو ناوی لێنا (کۆمیتە ئامادەکردن پ. د. ک).

د. مـەحموود پیـاوێکی لەسـەرخۆ، بـە ئـەزموون و فرەزان و قسەخۆش بوو. لەدۆڵ بلوێرەوە تا نێوزەنگ زوو زوو یـەکترمان دەبینـی. دەوری هێورکـەرەوەی گرژیـەکانی دەبینـی و راشـکاوانە بیرورای خـۆی لەسـەر رووداوەکـان دەردەبڕی. پـتر لـە دە سـاڵ لەنزیکەوە کاری لەگەڵ بارزانیدا کردبوو. ئەم ماوە دووورودرێژە کاریگـەری بـەرچاوی لەسـەر شـێوەی بیرکردنـەوەو جیهـانبینیی ئەو دانابوو.

زۆرجار مام جەلال و دکتۆر مەحمود هەریەکە بیرەوەریی و ئـەزموونی خۆیـان لەگـەڵ بارزانیـدا دەگێڕایـەوە. دکتـۆر مـەحمود شێوەی قسە پێوتنی بارزانی بە یەک بـە یـەکی ئەنـدامانی (م. س) (باڵی مەکتـەبی سیاسی) بـۆ مـام جـەلال دەگێڕایـەوە، مـام جـەلال

لەبری ئەوەی پەست بێت، یان دەم و چاوی بە یەکدا بدات، لە قاقای پێکەنینی دەدا. من لەقسەکانی دکتۆر مەحمود، ئەوەم لەلا گەلاڵە بوو، کە بارزانی سەرکردەیەکی سیاسی ئەوتۆ بووە، کە توانویەتی بریاری چارەنوسساز بدات، تەنانەت باڵی (م. س) نەیتوانیوە هەمبەرو ئاستەنگی بۆ دروست بکات. ئەو ئامرازی (کش مەلیک)ی بەدەستەوە بووە، هەرچەند باڵی (م. س) ویستویانە پێشتر (کش مەلیک)ی لێبکەن. کش مەلیکی ئەمان کورتی کردووە و هیچ ئەنجامێکی سیاسی و عەسکەری نەبووە. کەچی (کش مەلیک)ی ئەو، هەرچی (بیرۆکە) و (پلان)و نازانم چی لەهەگبەی ئەو رۆژگارەدا هەبووە، رەشەبایەکی بچوک هەمووی سڕیوەتەوە.

رۆژێکیان مام جەلال هەستی بەوە کردبوو، سەرماو سۆڵە خەریکە پیشمەرگەکان شپرزە دەکات، گوتی: ((دەبێ دۆڵێکی تۆزێ گەرم بدۆزینەوە، هەندێک دارودەوەنی تێدا بێت... تاد)). دکتۆر مەحمود گوتی: ((سەیری ئەقڵی کورد بکە، چوارساڵ لەمەوپێش، ساڵی (١٩٧٤) رژێمی بەغدا ئامادەبوو، هەموو کوردستانمان بداتێ، تەنیا کەرکوک هەر دوولامان بەهاوبەشی ئیدارەی بکەین، ئێمە رازی نەبووین. ئەمڕۆ هەموو خاکی کوردستانمان لەدەست دەرهێنراوە، بێ نان، بێ ئاو، بەدوای دۆڵێکی تۆزێک گەرمدا دەگەڕێین، کە هەندێک دارو دەوەنی تێدابێت)).

# تاتیدۆ
# (١٣)

تـات، بـەردێکی پـان و لووسـە لـەچاو گابـەرد و خڕەبـەرد: (ئەملام تات و ئەولام تات ئای بابە جیقم دەرهات).

تاتیدۆ: دەربەندێکە هـەر دوو دیوەکەی تـا رادەیـەک سـاف و لووسـە و رەنگەکەشـی لـەچاو بـەردی شـاخەکانی دەروبـەری جیاوازە. سـەرەتای تـەمووز لێرە بووین، چەند هەفتەیـەک بـوو ئاوادانیمـان نـەدیبوو. هـاوڕێ جـەبار لەچادرەکـە هاتـە دەرەوەو هاواری کرد: ((هەڵسن! وەرنە دەرەوە!)).

سەرەتا وامانزانی گەمارۆ دراوین. جەبار بەسەرسووڕمانەوە دەستی رادەکێشا بۆ پیرێژنێک گوێدرێژێک، منالێک، دوو مریشک و کەڵەشێرێک.

هاوڕێ جەبار بەدەنگێکی قووڵ وپڕ لەرزینـەوە هـاواری کـرد: ((ئـەی هـاوار، ژن، منـاڵ، نێرەکـەر، کەڵەشـێر، مریشـک.. تـاد. ئـەی خوایە ئەم دیمەنە چەند جوانـە.. ئـەی خوایـە ئەمـە چەنێکـە ژن و مناڵ و کەڵەشێرم نەبینیوە..)).

هـەر بەڕاسـتی دیمـەنێکی سـەیربوو، هەسـتێکی زۆر سـەیر، هەستمان دەکرد، ئێمـە بەشـێکین لـەم شـاخ و کێوانـە و جارێکی دی نە ئاوەدانی دەگاتە ئێرەو نە ئێمە دەگەینەوە ئاوەدانی...

## ئاشتی چاوشین
## (١٤)

ئاوات قارەمانی لە تاتیدۆ بوو، کاتێک ژمارەیەکی تر لە نامەکانی ئاشتی چاوشین* گەیشتن. نەوشیروان گوتی: ((ئەم نامەیە بخوێنەوە، کە ئاشتی لە زیندانەوە رەوانەی کردووە...)). نامەکەم بە وردی خوێندەوە و ئەم بە بێ پێچ و پەنا تاوانی گرتنەکەی دەخاتە ئەستۆی ئاوات قارەمانی. من بە نەوشیروانم گوت: ((لەقەرەداخیش ئەم دەنگۆیە هەبوو، کە مەسەلەی شەهید کردنی کاک ئارام و گرتنی ئاشتی دەخرێتە ئەستۆی کاک ئاوات..)).

نەوشیروان گوتی: ((من حەزدەکەم قەناعەتی تۆ بزانم؟)).

منیش گوتم: ((من کوردییەکەم زۆر باش نییە، تۆ چی لەم نامەیە تێدەگەیت؟)).. ((قەناعەتی من ئەوەیە: ئاوات پیاوێکی خاین و تاوانبارە، پێویستە هەر ئێستا بیگرین و بیکوژینەوە!)).

من گوتم: ((ئەی مام جەلال نامەکەی خوێندۆتەوە! ئەو پیاوێکی قانونییە. فەرموو با بچین گوێ لەویش بگرین!)).

مام جەلال لەبەردەم چادرەکەی خۆی پیاسەی دەکرد، جامانەکەی لەبن دەست بوو، کڵاوەکەی لەسەر بوو. مام جەلال گوتی: ((ویستم بەدواتاندا بنێرم، باشبوو خۆتان هاتن. ئێستا

---

* کاوەی مەلا مەحموود (برای فازیلی مەلا مەحمود) زۆر هاوڕێی ئاشتی بوو، لە زیندانی موسڵ سەردانی کردبوو، نامەکانیشی لەرێگەی ئەوەوە رەوانەی ناوەندی کۆمەڵە کرد بوو.

پێشمەرگەکان گۆشتی حەیوانە کێویان بۆ هێنام، ئێوارە پێکەوە نان دەخۆین..)).

نەوشیروان گوتی: ((مام جەلال ئەوەی راستی بێت، تۆ پیاوێکی قانونیت و نامەکەی ئاشتی چاوشینت خوێندۆتەوە، حەز دەکەین بیروڕای تۆش بزانین!)).

مام جەلال گوتی: ((من محامیم، بە گوێرەی قانون بێت، قوربانی پێش گیان لەدەستدانی، بە ماوەیەکی کورت، هەر قسەیەکی کرد، لەسەر ئەو قسەیە حوکم دەردەچێت! هەر بۆ نمونە: پیاوێک تەقەی لێدەکرێت و خەریکە دەمرێت، ئەو بریندارکراوە ئەگەر گوتی: فلانە کەس منی کوشتووە! تەواو! دادگا لەسەر ئەو ئیفادەیە بڕیاری خۆی دەدات و ئەو کەسە بە بکوژ ((قاتل)). دادەنرێت! بڕیار دەربکەین و دادپەروەرانە حوکم بدەین. ئێمە بەگوێرەی نامەکەی ئاشتی و لەبەر رووناکی (قانون العقوبات البغدادیة) بێت دەبێ ئاوات قارەمانی وەکو خاین و خۆفرۆش و تاوانبار دابنرێت و بەبێ سێ و دوو ئیعدام بکرێت..)).

نەوشیروان گوتی: ((من بە ڕاشکاوانە بیروڕای خۆمم بە مامۆستا جەعفەر وتوە. من پشتیوانی سەد لەسەدی قسەکانی مام جەلال دەکەم و لایەنگری ئەوەم هەر ئێستا چەکی بکەین و سەری بخەینە رەشی بابیەوەو لەو چەمە با سزای رەوای خۆی وەربگرێت!)).

مام جەلال گوتی: ((ئێمە ئێستا سێ کەسین، دووانمان پشتمان بە قانون و بەڵگەی حاشا هەڵنەگر بەستووە، ئاوات خیانەتی لە شۆڕش کردووەو کادرێکی بە گرت داوەو ئێستا

چاوەڕوانی جێبەجێکردنی حوکمی ئیعدام دەکات نابێ. ئەم وەکو بەرزەکی بانان بۆی دەربچێت؟)). ئینجا رووی کرد من و گوتی: ((مامۆستا جەعفەر! بیروڕای تۆشم بەلاوە گرنگە، حەز دەکەم تۆش قسەی خۆت بکەیت...)).

من گوتم: ((ئاوات ماوەیەکی زۆر هاوڕێی شەهید ئارام بووەو من هەرسێکیانم پێکەوە ناسیوە. ئاوات وەکو کادرێکی سەربازی مافی خۆیەتی بواری هەبێت، داکۆکی لەخۆی بکات. ئێمە دەبێ لێپێچینەوەیەکی دادپەروەرانەو بێ لایەنانە لەم کێشەیە بکەین. با کاک ئازاد (سەگرمە) بۆ قارەمان و برایماواو گەڕەزیل و تەنگیسەر بڕوات: لەوێ لێپێچینەوەو لێکۆڵینەوەیەکی ورد بکات. ئەگەر ئاوات تاوانبار دەرچوو، ئەوە (م. س) هەر بڕیارێک لەسەر ئاوات بدات کەس گلەیی لە (م. س) ناکات..)). قسەکانی من دیارە تا رادەیەک کاریگەری لەسەر بیروهەڵویستی مام جەلال و نەوشیروان هەبوو.

ئەو رۆژە من لایەنگری ئەوە نەبووم ئاوات قارەمانی بکوژرێت. هەوڵەکەشم سەری گرت. بڕیاری ئیعدامەکەی ئاوات قارەمانی ئیمزا کرابوو. من ئێستاش داکۆکیەکانی ئاوات قارەمانی لەگوێمدا دەزرنگێتەوە: قسەکانی هەر هەموو قسەی پڕوپووچ و بێتام و بێ سەروبەربوون. بڕۆیشتایە بۆ لای مام جەلال و ئەو قسە ساردو سڕانەی بکرادیە، مام جەلال بەسەریدا دەڕووخا و کێشەکە بە کەس چارەسەر نەدەکرا.

مام جەلال گوتی: ((ئازاد بە تەنیا بچێت؟)).

من گوتم: ((با ئازاد بەرپرسیاری لیژنەی لێکۆڵینەوەبێت، ئیدی خۆی لەوێ چەند کادرێکی سیاسی و عەسکەری

هەڵبژێرێت، کە ئاگایان لە ڕووداوەکان بێت و گوێ بۆ خەڵکی قارەمان و تەنگیسەر و برایماواو گەڕەزیل و پێشمەرگەکان رادێرن!)).

((پێتوایە دەتوانن بگەنە ئەنجامی یەکلاکەرەوە؟)).

من گوتم: ((کاک ئازاد پیاوێکی زۆر پاک و سەرڕاست و ئازاو بە جەرگ و هەقبێژە و خاتری کەس ناگرێت و هەرچی روویدابێت وەکو هێلکەی پاککراوە دەیخاتە بەردەستتان..)).

نامەکەی ئاشتی پاش چەند مانگێک لەکۆمەڵەی ژمارە (٢) بڵاوکراوەیەوە. ئێمە پێمانباشبوو نامەکە بڵاوبکرێتەوە، بەڵام لەبری ناوی ئاوات قارەمانی چەند خاڵێک دابنرێت(.....) هەرواش کرا!

ئازاد(سەگرمە) بۆ قەرەداخ رۆیشت و لەوێ ماوەیەکی زۆر مایەوەو لێپێچینەوەیەکی وردی لەمەسەلەی شەهیدکردنی ئارام و گرتنی ئاشتی چاوشین کرد. گەیشتبوونە ئەو ئەنجامە، کە ئاوات دەستی لەشەهیدکردنی ئارام و بەگرتدانی ئاشتی هەبووەو تاوانبارە و بەڵگەی تۆکمە و یەکلاکەوەرە خرابووە بەردەست لیژنەکە. ئازاد گەڕایەوەو وردو درشتی راپۆرتەکەی خستە بەردەم مام جەلال، ناوەندی کۆمەڵە و (م. س). ئەو کاتەش سێ کەس ڕێگریان لە کوشتنی ئاوات قارەمانی کرد.!

کاوەی مەلا مەحموود لەسەر زاری شەهید ئاشتی چیرۆکی گرتنەکەی خۆی بەم شێوە گێڕاوەتەوە:

((فازیلی مەلا مەحمود پێش گەڕانەوەی بۆ بەیروت، حەبێکی دامێ و گوتی: ئەم حەبە بۆ کاتی لیقەومان هەڵبگرە. هەر کەسێک بیخوات سەد لەسەد دەیکوژێت. ئاوات قارەمانی بە

حەبەکەی زانی. دوو رۆژ پێش گرتنەکەم، ئەو بەزۆر حەبەکەی لێوەرگرتم.

ئێوارەی ئەو رۆژەی بە بەیانییەکەیا من گیرام. ئەو سوور بوو لەسەر ئەوەی لەماڵی خوشکی لە دێی قارەمان بمێنینەوە، منیش پێداگریم لەسەر مانەوە لەماڵی جوتیارێکی پەڕی ئاوایی کرد. من لەبەردەم بەلووعەی بەرمیلە ئاوێک دەم و چاوم دەشت، لوولەی تفەنگی جاشەکان لەپشت سەرم بوو، بواری ئاوڕدانەوەشم بۆ نەمایەوە. ئاوات قارەمانی لە ژووری میوان دانیشتبوو چای دەخواردەوە. شەویش هەردووکمان لەهەمان ژووردا نووستین. جاشەکان منیان گرت و سەریان بەژووری میواندا نەکرد...)).

مام جەلال لەنامەیەکدا بۆ سالار عەزیز لە رۆژی ١٩٧٨/٤/١٥ دەربارەی سەرکردایەتی نوێی کۆمەڵە ئەم دێڕانەی نووسیوە:

((کۆمیتەی خۆسازدان بۆ کۆنفرانس هەڵبژێردرا لە (٣)* هەڤاڵەکەی کۆمیتەی هەرێمەکان و (٦) هەڤاڵی تر کە بەدەوری سەرکردایەتیش هەڵسن تا کۆنفرانس. هەڤاڵان: نەوشیروان، بەکری حاجی سەفەر، شێخ عەلی (محمود کەشکۆل) و جەعفەری قەرەداغ** کرێکارەکەی کەرکووک و (ئاوات)یش کە پاشان (معلق) کراوە لەسەر هەندێ شت کە ئیستە لێی ئەکۆڵنەوە، بەتایبەتی ئەو لەگەڵ شەهید ئارام بووە کە پێش شەهیدکردنی و لەگەڵ ئاشتی بووە پێش گرتنی. لیژنەیەکی سێ

---

* سالار عزیز، مەلا بەختیار، ئازاد هەورامی

** جەعفەری قەرەداغ: مەبەست مامۆستا جەعفەر (م.ج)

قۆڵیش لەهەڤالان: نەوە، ئازاد، جەعفەر، دانرا، کە وەک (م. س) ی کۆمەڵە بێت و جریدة و مجلەی نظری دەرکات لەگەڵ وثائیقی پێویست بۆ کۆنفرانس..)).

سەرجەم ئەم کۆپلانەی سەرەوە: قسەو بۆچوون و تێگەیشتنی ئاشتی چاوشین و مام جەلال و نەوشیروان و ئازادی سەگرمە و کاوەی مەلا مەحموود بوون، دەربارەی هۆکاری گرتن و شەهیدبوونی ئاشتی چاوشین. من ئەوکاتە، مام جەلال و نەوشیروانم قەناعەت پێنەکردایە، ئێستا ئەو ئیسک و پرووسکیشی نەمابوو. من خۆم دەزانم لەسەر ئەو چەند داکۆکیم کردووە و چەند رەخنەی ساردو سڕم لێ گیراوە!

ئەوکاتە دادگاو لێکۆڵینەوە و بەڵگەی تاوان رەوانەی سەر ئەستێرەکان کرابوون. دوو سێ کەسی دەستڕۆیشتوو سەریان بە یەکا دەکرد و لەسەر چارەنووسی مرۆڤێک بڕیار دەردەچوو، دەستبەجێیش جێبەجێدەکرا.

ئەمەی من دەینووسم تاوانبارکردن نییە. من رووداوەکان وەکو بەشێک لەمێژوو دەبینم و مەبەستم ناوزڕاندنی کەس نییە و نامەوێ یەکێک دژی یەکێکیتر بورووژێنم. ئەمە کاری من نییە و ئیستا نزیکەی چل و یەک ساڵ بەسەر رووداوەکاندا تێدەپەڕێت.

سەرکردایەتی یەکێتی دەبوایە: هەرپاش دروستبوونی حکومەتی هەرێم، ئەم جۆرە کەیسەی رادەستی دادگا بکردایە و یاسا رێچکەی رۆتینی خۆی وەربگرتایە: کەسانی بێتاوان ئەستۆ پاکیان بۆ دەربکرایە و تاوانباران رادەستی دادگا بکرانایە، ئەوکاتە کەس لەخۆڕایی تاوانی نەدەخستە پاڵ کەس..

# دەراوی گورگان
## (١٥)

مام جەلال گوتی: ((نابێ لەمەودوا بارەگا لەناو دۆڵ و شیو دابنرێت. دەبێ بەرزاییەکانمان بەدەستەوە بێت و بارەگاش لەسەر لوتکە و هەوراز دابنرێت..)).

ناوەڕاستی تەمووز بەرەو دەراوی گورگان کەوتینەڕێ. لەڕێگا ئازادی سەگرمە، دڵشاد تۆفیق، حەمەرەزا، مەلا عەلی و من لەسەر کاچێکی پان لاماندا، کە بەسەر شیوێکی کراوەدا دەیڕوانی.

من گوتم: ((مام جەلال دەستەیەک (پ. م)ی خۆی هەیە، کەچی، خۆی و دکتۆر حسێن دوو قۆڵی دەڕۆن و یەک کەسیان لەگەڵدا نییە. هەر هەردووکیانن و ئێمە نەبین رەنگە ڕێگەیان لێتێکبچێت.. ئێستا بەکرێگیراوێک لەهەر شوێنێکەوە تەقەی لێبکات، دەتوانێت بیکوژێت و بە ئاسانیش دەرباز بێت.. راستە ئێمە هەموومان کادری پێشکەوتووی کۆمەڵەین بەڵام دەبێ تا دەگاتە لای دەستەکەی خۆی دوورونزیک ئاگامان لێبێت..)).

دەراوی گورگان لەبن شاخی ((سەری کۆڕەش)بوو.

لە دەراوی گورگان بەرەو خوار شۆڕبیتەوە: ((قەڵاتووکان))ە. شیوێک پڕ((رنوو)) و ((باتیووە)) بوو. ((ئەستێڵ)ێک لەخوارەوەی کەویەکە هەڵبەسترابوو، دامیاو دەڕژایە ناویەوە و ئێمە ئەو

ئاوەمـان بـۆ چالێنـان و دەسـت و دەموچاوشـتن بـەکاردەهێنا. باتیووەکـە ئەوەنـدە سـەخت بـوو، بـە چـەقۆ هەڵمانـدەکۆڵی و گۆشـتی حـەیوانمان تێدەکرد و بەردێکمان بەدەمی کونەکەوە دەنا، نەوەک گورگ، لە پەناوە، بە ئاسانی بیدۆزیتەوە. نەشدەکرا لەبـەر هـەتاو دابنرێـت و مـێش لێبـدات و بۆگـەن بکـات. چاڵـە بەفری سروشتی فریامان کەوت و سوودی چاکمان لێبینی.

رۆژانـە لەرێگـەی BBC و مونتیکـارلۆ و رادیـۆی تارانـەوە، دەنگوباسـی خۆپیشـاندان و رێپێـوان و مـانگرتنی شـارەکانی ئێرانمـان دەزانـی و ئەمـە هیوایـەکی گـەورەی پێدەبەخشـین، کـە لەناو ئێراندا گۆڕانکاری روودەدات و رژێمی شا ناتوانێت دەنگی نـارەزایی خـەڵک کپبکاتـەوە. گوشـاریش بخاتـە سـەر هێزی پ. م لەهـەردوو دیـوی سـنوور. رۆژ و شـەو هەریەکـە رادیۆیـەکی بەدەسـتەوەبوو، بـەدواداچوونی دەکـردو پاشـان پێکـەوە دادەنیشـتین و دەنگوبـاس ئـاڵوگۆڕ دەکـرا. ئەوکاتـە لـەناو شـارەکانی کوردسـتانی رۆژهـەڵات جووڵانـەوەو نـاڕەزایی دەربـڕین تـا رادەیـەک کزوخـامۆش بـوو. مـام جـەلال ئـەم پرسـیارەی لـەدکتۆر مـەحمود کـرد: ((لەسەرانسـەری ئێرانـدا خۆپیشـاندان و هەڵسـانەوەو راپـەرین گەرمـە، تـەنیا لەشـاری سـنەی خۆشەویسـت، نـەمانگرتن، نـە خۆپیشـاندان و نـە هـیچ هەیە!)).

دکتـۆر مـــەحمود گـوتی: ((خۆپیشـــاندان: سەرتاســـەری و گشـــتگیرە، ئـــەمڕۆش ئـــەوان رانەپـــەڕن، ســـبەی لـــەویش دەتەقێتەوە..)).

هاوڕێ جەبار (جەبار عەبدوڵلا حەبیب) هەر گوێی دەگرت، لەپڕ گوتی:

((لەسنە هیچ روونادات!)).

مام جەلال گوتی: ((بەچیدا دەزانی لەوێ هیچ روونادات و تاسەر بێدەنگی هەڵدەبژێرێ؟)).

هاوڕێ جەبار: ((چۆن نازانم؟ خەڵکی سنە هەر زۆر هیچ و پووچن!)).

مام جەلال قسەکانی هاوڕێ جەباری زۆر پێناخۆش بوو: ((خەڵکی سنە هەر زۆر قارەمانن و سنە دڵی کوردستانەو بەچیدا دەزانیت خەڵکی سنە زۆر هیچ و پووچن؟)).

هاوڕێ جەبار لە قاقای پێکەنینیدا و گوتی: ((مام جەلال، باوکم خەڵکی سنەیە، بە باوکما دەزانم سنەیی هەر زۆر هیچ و پووچن..)).

# شاندی دەراوی گورگان

## (١٦)

چێشـــتەنگاوێک دەنگۆیـــەک لـــەناو کـــادرو پێشـــمەرگەکاندا بڵاوکرایـەوە گوایـە: هـەمزە ئاغـای بـاپیر ئاغـای پشـتدەری، بـە مەبەسـتی گفتوگـۆ، سـەردانی دەراوی گورگـان دەکـات، رۆژی دواتـر کۆبوونەوەیـەکی فراوانـی بەشـێک لـە سـەرکردایەتی هێـزە سیاسـییە کوردسـتانییەکان کـرا، دەربـارەی (گفتوگـۆی شـۆڕش لەگەڵ میری) بە حیساب رژێم داوای لەشۆڕش کردووە: یـەکێتی داواکاری گەلی کوردستان بخاتـە ڕوو، ئینجـا شـاندی هـەردوولا بـە فـەرمی یـەکتری ببیـنن و کێشـەی نێـوان کـوردو رژێـم بەشێوەیەکی ئاشتیانە چارەسەر بکرێت. هەر هەموو سـەرکردەی ئـەو هێـزە سیاسـیانەی، کـە لـەو کۆبوونەوەیـەدا ئامـادە بـوون، پرنسـیپی دانوسـتاندن و دیالۆگیـان پەسـەند کـرد، چونکـە سـەد سـاڵیش شـەڕ درێـژە بکێشـێت، هـەر دەبـێ رۆژێـک لـەرۆژان هـەردوولا پێکـەوە دابنشـین و چارەسـەری ئاشـتیانە بدۆزنـەوە. تەنیا مام جەلال گوتی: ((ئێوە هـەموو ئیمزای خۆتـان بکـەن، من تێبینیم هەیە)). چاوەڕوانی کرد، تـا دوا نوێنـەری هێزە سیاسـییە کوردستانییەکان، کە لەو کۆبوونەوەیەدا بەشداربوون، هەریەکـە پەپوولەی ئیمزای خۆی لەبن کۆنووسی کۆبوونەوەکە دانا. ئینجا گـوتی: ((مـن دژم! بـا گفتوگـۆ بکرێـت و مـن هـەرچیم پێبسـپێرن دەیکەم، بـەڵام مـن گومـانم لـەم رژێمـە هەیـە. بـەعس مـافی کـورد

نادات و بڕوای بەچارەسەری ئاشتیانە نییە و دەیەوێت کورد لەناو بەرێت، بۆیە من وەکو ئێوە بیر ناکەمەوە و ناتوانم لەسەر مەحزەری کۆبوونەوەی ئەمڕۆ ئیمزا بکەم و کاکە نەوە تێبینیەکانی من وەکو خۆی بنووسە..)).

مام جەلال حەوت ساڵ دواتر خۆی وردەکاریی ئەو کۆبونەوەیە بەم شێوەیەی خوارەوە دەنووسێتەوە، کە بەبێ دەستکاری دایدەگرین:

(ئەو رۆژەی کاک رەسوڵ بۆ ئەوەی (م. س) گفتوگۆ لەگەڵ میری قبووڵ بکا ئامادەی سەلماندنی هەموو شەرتەکانی (م.س) بوو: ئەوە بو لە کۆبوونەوەکەی (دەراوی گورگان ـ قەندیل) بڕیاری وەڵامدانەوەی میری درا و نامەیەکیش ئاراستە کرا تێیدا داخوازیەکان نوسران: ئەو محضرەی لەبەردەستمانە، ئیمزای رەسوول و حاجی* و مەلا ناسیحی پێوەیە لە بسک و هی کاکە نەوشیروان و فاضل کریم لەکۆمەڵە و د. مەحمود لە لیژنەی تحضیری حدک و جلالی حاجی حسینیش لە جیاتی پاسوک و مام جەلالیش وەک سکرتێری گشتی بەڵام بە (تحفظ)ی پرس کردن بە (التجمع الوطنی العراقی) و برادەرانی دەرەوە).**

رۆژێک پێش کۆبوونەوەکە نەوشیروانم بینی، پاڵی بە بەردێکەوە دابوو، خراپ دەکۆکی. من گوتم: ((هەر بەڕاست رژێم هەمزە ئاغای باپیر ئاغای پشتدەری بۆ ئێرە ناردووە؟)).

---

* مەبەست: حاجی حاجی برایمە.

** گفتوگۆی شۆڕش لەگەڵ میری: ناونیشانی کتێبەکە، یەکێتی نیشتمانی کوردستان، ساڵی ١٩٨٥ بلاویکردەوە، ل٥٨.

ئەو گوتی: ((هەمزە ئاغای باپیر ئاغای پشتدەری دۆستی دێرینی مام جەلالە و رژێم داوای لێ کردووە سەردانی ئێرە بکات..)).

من گوتم: (( مەعقوولە لەم کاتەدا رژێم داوای گفتوگۆ بکات؟ بۆ رژێم لەگوێی گادا نووستووەو ئاگای لە وەزعی یەکێتی نییە چی لێبەسەر هاتووە؟)).

نەوشیروان زانیی چیرۆکە دروستکراوەکە کورتی هێنا، بۆیە ناچاربوو بڵێت: ((شتێکت پێدەڵێم لای کەس باسی مەکە! ئێمە خۆمان لەم هەل و مەرجەدا، داوامان لە هەمزە ئاغای باپیر ئاغای پشتدەری کردووە سەردانمان بکات و دەنگوباسمان بۆبهێنێت..)).

من گوتم: (( کەواتە: ئەو پێشەکی رەزامەندی رژێمی وەرگرتووە!)).

ئەو گوتی: ((بەبێ رەزامەندی رژێم چۆلەکەیەکیش ناتوانێت بۆ ئێرە بفڕیت!)).

من گوتم: (( ئەم داش جوولاندنە پێویست بوو بۆ ورە بەرزکردنەوە؟)).

نەوشیروان گوتی: (( نابێ ئەم راستیانە کەس پێیان بزانێت..)).

من گوتم: (( من هەرچەند بڕوام بەوە نییە رژێم بێتە پێشەوە، بەڵام هەروەکو قەدیمان گوتویانە: بەراز هێلکەی کرد دەیکات! ئایا داوا دەکرێت شاندێک بۆ ئێرە بێت، یان لێرەوە شاندێک بۆ

بەغدا دەڕوات؟)). من مەبەستی خۆمم لەپرسیارەکە هەبوو! حکومەت داوای شاندی بکردایە و لەرێگە پیلانێکی بۆ بگێڕایە، دوایی بیگوتایە خۆیان یەکتریان کوشتووە، کێ لەسەر کورد بەدەنگ دەهات؟

من لەدڵی خۆمدا گوتم: ((نە کەرە، نە بارە، بەهەردوو لایاندا خوارە)).

نەوشیروان گوتی: ((من پێشنیار دەکەم، هەر لەسلێمانییەوە برایم جەلال خۆی بۆ بەغدا بچێت، قسە لەگەڵ رژێمدا بکات و رێکەوتنامەکە ئیمزا بکات!)).

من گوتم: ((برایم جەلال کێیە؟ ئەم ناوەم نەبیستووە؟)).

ئەو گوتی: (( برایم جەلال شێوەی هەر لەعەرەب دەچێت و لەعەرەبیش عەرەبی چاکتر دەزانێت. ئەو ئێستا لەناو شارە و بەتەمایە بێتە دەرەوە بەراستی پیاوێکی عەبقەریە..)).

پاش چەند رۆژێک ئەو (عبقریە)یە هاتە دەرەوە و خۆی و نەوشیروان رۆژی سێ چوار جار لەیەک هەڵدەبەزینەوەو دەبووە دەنگە دەنگیان.

لەدڵی خۆمدا گوتم لەشەستەکان مام جەلال و ساڵح یوسفی شاندی کوردستان بوون و ساڵی ١٩٧٠ د. مەحمود عوسمان و دارا تۆفیق شاندی شۆڕش بوون..

# سەرماو رەشەبا

## (١٧)

پەیوەندی نێوان ئێمە و جیهان تەنیا رادیۆ بوو، لەرێگەی رادیۆوە دەمانزانی لە ولآتانی تر چی روودەدات! دەنگوباسی وردی ناو شار و لادێکان بە زەحمەت دەگەیشتن، سەرکردایەتی ناوەوە، لە گرنگی کۆکردنەوەی زانیاری تایبەت کەمتەرخەم نەبوون، بەڵام گرنگی زانیاری کۆکردنەوەیان لەسەر بواری ئابوری و بازرگانی و گرانی و ژمارەی ئۆردوگای زۆرەملێ و ژمارەی دێهاتی چۆڵکراو.. تاد نەدەزانی. یان پێیانوابوو ئەو زانیاریانە لای ئێمەیش هەن و پێویست ناکات ئەوان خۆیان ماندوو بکەن.

دەراوی گورگان ئەوەندە سارد بوو قەت نەماندەتوانی بڕوا بە دەنگوباسی کەش و هەوای رادیۆی تاران بکەین، کە دەیگوت: پلەی گەرمای (قەسری شیرین) لە سێبەر (٥٢) پلەی تێپەڕاندووە. ئێمە هەستمان دەکرد لە سیبیریا گیرساوینەتەوە. جارێکی دی چاومان بە گەرمی ناکەوێت و شەوێک لەسەرمادا رەق دەبینەوە. شەوان رەشەبا هەڵیدەکرد و چادرەکەی بەسەرماندا دەروخاند، یان شیتاڵ شیتاڵی دەکرد. رەشەبا لەلایەکەیەوە گڤ گڤ و لوورە لوورو گرم و هووڕی لەو ناوە دەنایەوە، لەلایەکی تریشەوە پلەی گەرمای دادەبەزاند. زۆرجار نیوەشەو چادرەکەمان بەسەردا دەڕووخا، بەو شەوە کەس تاقەتی سنگ کوتان و گوریس شەتەک دان و لوولە راستکردنەوەی نەبوو.

# دزیی کوردی
## (١٨)

مام جەلال گوتی:

کوردەکان لەهەر کوێ بن، هەوڵ نادەن بەکاری گەورە و گرنگەوە خۆیان سەرقاڵ بکەن، بەداخەوە پلان دانان و چوارچێوەی بیرکردنەوەیان لە ئەنجامدانی شتی سووک و بێبایەخ و بێتام چڕ دەکەنەوە.

لە بەیرووت دزەکان دەچوون بانقێکیان دەبڕی و دوو سێ ملیۆن دۆلاریان دەستدەکەوت، یان دەچوون دوکانێکی زێڕنگەریان دەبڕی و هەشت نۆ کیلۆ زێڕ و ئەڵماس و خشڵیان بە تالان دەبرد.. کەچی کوردێکی لوبنانی نیو فەردەی بەسەر شانەوە بووە، خەڵک بەدزە دزە راویان ناوە و تەقەیان لێکردووە و کوشتویانە، کاتێک دەچنە سەری سەیر دەکەن نیو فەردە پیازی رفاندووە.

لە دزیکردنیشدا دیاردەی دواکەوتن و خۆ بە بچووک دانان دەردەکەوێت.

# مەلا عەلی

## (١٩)

مەلا عەلی ناوی نهێنی (حسێن مەولود)بوو، لە تەمەنی (٢٧)ساڵی دا شەهید کرا، شاعیرێکی هەست ناسک، شارەزا لە زمانی کوردی، ڕۆح سووک، زمانپاراو، قسەزان، نەرم و نیان، بیرفراوان. نزیکەی دوو مانگ لە شاخەکانی قەندیل پێکەوەبووین، نموونەی کادری ڕەوشت بەرز، لێزان لە تێگەیشتنی شێوەی بیرکردنەوەو ئەقڵی خەڵکی شارو لادێ. ئەو کاری خۆی و هاوڕێکانیشی دەکرد. مرۆڤ نەیدەتوانی ڕێزی لێنەگرێت. لەبری ئەوەی بە خەڵک بڵێت: هەستن ئاگر بکەنەوە، خۆی کۆتەرەدارو گوێنی* و بۆقی** کۆدەکردەوە و ئاگری دەکردەوە.

کەڵلەرەقی، بوغز، دووڕوویی و ڕابواردن بەم و بەوم لێی بەدینەدەکرا.

کاتێک بەرامبەرت لەسەر بەردێک چوار مەشقی دادەنیشت، هەرواتدەزانی ئەمە شاخی (پیرەمەگروون)ەو بەرامبەرت دانیشتووە و دەست بەڕیشی خۆیدا دەهێنێت. زۆرجار باسی زانکۆ و کۆلێجی ئەدەبیاتی بۆ دەکردم و جاریش هەبوو دەستی بە گیرفانیدا دەکرد و هۆنراوەیەکی جوانی خۆی بۆ دەخوێندمەوە: ئەو عاشقی خاک و کانی و ڕووبارو دارودەوەنی کرژە و کۆکە و سووسێ و قەرەچەتان بوو.

---

*گوێنی: جۆرە دارو دەوەنێکی کوێستانی دڕکدارە و گەڵاکەی لەسنەوبەر دەچێت.

** بۆق: جۆرە دەوەنێکی کوێستانیی زۆر کورتە و گەڵاکەی سەوزە.

من کونەشاخێکم بۆ خۆم ڕێکخستبوو، (دیوی ئەوبەریش مەلای عەلی کونە شاخێکی پاککردەوە و هەندێ گوێنی و بەتانی تێدا ڕاخست. لەگەڵ کازێوەدا، مەلا عەلی خۆی لەبەرکردبوو: ئێمە بە جلەکانمانەوە دەنووستین. پشتێنەکانمان لوول دەکرد و لەسەر تاقم و کڵاشینکۆف داماندەنا و دەمانکردە سەرین. ئەو بە گوێزان سەری پاک پاک دەتاشی. هەر زوو کڵاوو جامانەی دەبەست و کتێبی دەخوێندەوەو بەردێکی کردبووە پشتی و جارجار سەیری نووستووانی دەکرد، کە تیشکی هەتاو ختوکەی دەدان و بەئاگای دەهێنانەوە. ئەو بەرچایی بۆ ئامادەکردبوون و چاوەڕوانی هەستانی هەمووانی دەکرد.

تا کاتی بەرچایی هەر هەموو ڕادەبوون، ئەو، کتری ئاوی لەسەر ئاور دادەنا، کوپی چینکۆی ڕەش هەڵگەڕاوەکانی پاک پاک بە خۆڵەمێش دەشت. خۆی و حەمەڕەزا، کۆتەرەدار و داری بۆق و گوێنیان دەدۆزیەوە. ئاردمان هەبوایە، زووتر هەویریان دەشێلا. دوو قۆڵی گونکیان دەبڕی، بە تیرۆک گونکەکە پاندەکرایەوەو لەسەر سێڵ دەبرژێنرا و لەسەر بەردێک هەڵدەچنرا.. هەریەکە نانێک و کوپێک چامان بەردەکەوت.

مەلا عەلی هەر بە سوعبەتەوە دەیگوت:

خوا نەیبڕیت؛

بەیانی: نان و چا

نیوەڕۆ: چاو نان

ئێوارە: هەردووکیان پێکەوە دەخۆین..

حەمەڕەزا، کە بە بەردەوامی بۆ ناو شاری سلێمانی دادەبەزی، دەستی نەدەپاراست، ژمارەیەک سەربازی سوپای ڕژێمی کوشت. جارێک لەشەڕێکی دەستەویەخەدا چەند

سەربازێک لەهێزی تایبەت (قوات خاصة) دەکوژێت. هێزێکی گەورە گەمارۆی دەدەن، نەیتوانیبوو خۆی دەرباز بکات و تا دوا هەناسە شەڕی کردبوو.

ئەم پیاوە زۆر دەستڕەنگین بوو، جاری وا هەبوو، نانەڕەقە بە ئاستەم دەست دەکەوت، حەمەڕەزا و مەلا عەلی دەیانگوت: ((هەویرمان هەیە، دەڵێن چی؟ ناوەشکێنە دروست بکەین. من نەمدەزانی ناوەشکێنە چییە؟ یەکەمین جاریش ناوەشکێنە بخۆم. هەردووکیان بە شەوق و زەوقێکەوە ناوەشکێنەیان ئامادە دەکرد، هەر لەسەر سێڵەکەوە لەت لەت دەکرا و هەریەکە پاروویەکمان خوارد، بڕوا ناکەم نە لە پاریس و نە لەفلۆرەنس و نە لە لۆزان ئاوا تامم لەخواردن کردبێ.

مەلا عەلی لەمانگی ئەیاری ١٩٧٧ هاتە ڕیزی شۆڕشەوە. تۆڕێکی فراوانی ڕێکخستنی لەدێهاتی پیرەمەگروون دروستکردبوو. مەخابن شۆڕش ئەوکاتە بڕوای بە مەشق و ڕاهێنانی سەخت و هونەری چەک بەکارهێنان نەبوو.

مەلا عەلی و مارف (عوسمان عەسکەری) سەرەتای ئەیلوولی ١٩٧٨ پێکەوە بۆ بناری (پیرەمەگروون) گەڕانەوە. موختاری دێیەیەک زانیاری وردی بەدەزگا هەواڵگریەکانی ڕژێم دابوو. هێزێکی گەورەی ڕژێم گەمارۆی کرژە و کۆکەی دابوو. ئەوان لەبری ئەوەی لەناو چەمەکە خۆیان بشارنەوە، روویان کردبووە گردێک، کە ئەوکاتە بەدەست سەربازی ڕژێمەوە بووە. ئیدی نەیانتوانیبوو خۆیان دەرباز بکەن.

# عەزیز و برایم

## (٢٠)

چێشـــتەنگاوێک، دوو دەموچـــاوی نـــوێ، لـــە مەمەلەکـــەتی (دەراوی گورگان) دەرکەوتن. یەکێکیان سووروسپی و باڵابـەرز، نێوی لـەخۆی نـابوو (مامۆستا برایم). دووەمیـان نـاوی لـەخۆی نـابوو د. عـەزیز. ئێمـە هـەموو چڵکـن و پڵکـن و رەش داگـەڕاو، سـیس و برسـی و بـێ ڕەنـگ و روو، ئـەمان پـاک و خـاوێن، سەروڕیش تاشراو، پۆشتە و پەرداخ، هـەروەکو ئەوەی بـەر لـە سێ چوار دەقیقـەیـەک لـەناو پاکەت دەرهـاتبن. هـەر بـە شێوەی سـڵاوو چـۆنی و چـاکی زانـیم تێکۆشـەرانی رۆژهـەڵاتن و بـۆ پشتیوانی و هاوئاهەنگی و هاوخەباتی هاتوون.

نەوشـیروان بـەبێ سـێ و دووکـردن بـە چپـە بـەمنی گـوت: ((مامۆســـتا بـــرایم: ســـاعدی وەطندوســـتە، ئەنـــدازیارە و کوردسـتانییە. د. عـەزیز: نـاوە راسـتەقینەکەی دکتـۆر جەعفـەری شـــەفیعیە، پزیشـــکە، بۆکانییـــە. هـــەردووکیان ســـەرکردەی[*] رێکخراوێکن نـاوی (کۆمـەڵە)یـە.)). ئـەم دوو جوامێرە رووناکییـان خستە دڵی کادرو پێشمەرگەکانەوە.

دکتۆر جەعفەر وەکو پزیشکێک دەورێکی گرنگی گێڕا: هـەر زوو بنچینـەی نەخۆشـخانەی دانـاو نـاردی دەرزی و دەرمانیـان

---

[*] مامۆستا برایم (ساعد) ئەندامی سەرکردایەتی و دەستەی دامەزرێنەری کۆمەڵە بوو. د. جەعفەر دواتر بووە ئەندامی سەرکردایەتی.

هێنا، ژیانی چەندین پێشمەرگەی بریندارو نەخۆشی لەمردن رزگارکرد. مامۆستا برایم، لەبیروڕا گۆڕینەوە، سەبارەت بە راپەڕینی گەلانی ئێران، بەشدارییەکی بەرچاوی هەبوو. ماوەیەک بووە لێپرسراوی هەرێمی پارێزگاری و ئەمەش بەرپرسیارێتییەکی سەربازیی گرنگ بوو.

پێش ئەمان بەدوو سێ مانگ، وەک پێشتریش ئاماژەم پێداوە، خانەی موعینی، گەیشتە ناو پێشمەرگەکانی هەرێمی (٣) و شەهید کرا. پاشتر، بەتایبەتی پاش رووخانی رژێمی شا بۆ ماوەیەک سنوور سڕایەوە، هەردوو رووبارەکە، یەکتریان لەئامێز گرت. د. جەعفەر زوو زوو بەمن و نەوشیروانی دەگوت: ((زۆر حەزدەکەم فێری زمانی عەرەبی ببم!)) ئێوارانێک باسی زانستی شکانی ئێسکی کرد.

ئەو گوتی: ((ئێستا لەئۆروپا زانستی پزیشکی پێشکەوتووە: یەکێک لاقی بشکێت لەبن پاژنەی ئەو کەسە بوورغوویەکی رەق دادەنرێت، لەوێشەوە بە مادەیەکی رەق بە بن رانی ئەو کەسەوە توند توند دەبەسرێت، ئیدی لاقی لە (فضاء معلق) دەبێت..)). هەر ئەو گوتی: ((لاقی لە فضاء معلق) دەبێت... ئامادەبووان لەقاقای پێکەنیندا و گوتیان: ئەوە نییە خۆت عەرەبی دەزانێت و پێتوایە بە کوردی، یان بە فارسی رستەکەت داڕشتووە! من هەر ئەوکاتە و پاش ئەوەی شیکارییەکی دووردرێژم سەبارەت بە کێشە و بیشەکانی تاکتیکی خەباتی چەکدار کرد: بە دکتۆر جەعفەر و ساعدم گوت ((تکایە هەڵەکانی

ئێمە لەهەڵگیرساندنی شۆڕش و خەباتی چەکدار دووبارە مەکەنەوە. ئێستا لەئێراندا مانگرتن، خۆپیشاندان و ڕێپێوان پەیڕەوی دەکرێت. بەدرێژایی مێژووی ئێرانیش ڕاپەڕینی جەماوەریی ئاشتیانە، گۆڕانکاری سیاسی و مێژوویی بنەڕەتی هێناوەتە پێشەوە. خەباتی چەکدار لەئێراندا سەرکەوتوو نەبووە. بزوتنەوەی چەکداری کۆتایی شەستەکان. تێکشکانی جولانەوەکەی سلێمان و عەبدوڵلا موعینی و مەلا ئاوارە و ئیسماعیلی شەریفزادە.. بەڵگەی بەهێزن دژی بزاڤی چەکدار لەچیاکانی کوردستان. هەڵسانەوەی جەنگەڵ (جنگل)* پاش یەکەم جەنگی جیهانی، هەروەها بزاڤی (سیاهکل) لەشەستەکاندا، فێرمان دەکەن دەستبردن بۆ چەک، مەرج نییە سەرکەوتووبێت.

دەنگی دەهۆڵ لەدوورەوە خۆشە! خەباتی چەکدار سەرکەوتووش بێت، سوودی بۆ ڕەش و ڕووتی ئەم وڵاتە چییە؟ دەسەڵاتێک بە لوولەی تفەنگ دروست بێت، هەر زۆر زەحمەتە دیموکراسی و ئازادیخواز بێت. ئێوە دەتوانن شۆڕش بکەن. دڵنیابن پاش چەند مانگێک شەڕی براکوژی دەتەقێتەوە و تەڕو وشک پێکەوە دەسووتێت و دەوڵەتی ئێران بۆ ئەودیوی سنوور ڕاتاندەماڵێت..)).

ئەم گفتوگۆیە لە کۆتایی ئەیلوولی ١٩٧٨ کرا، نازانم ساعد وطندوست (مامۆستا برایم) ... بیری ماوە یان نە؟.

---

* قیام جنگل: بەسەرکردایەتی میرزا کوچک خان بوو.

# دڵشاد تۆفیق بەنگینە
# (٢١)

دڵشاد تۆفیق*، یان هەروەکو پێشمەرگەکان بۆ خۆشەویستی پێیان دەگوت: (دڵشادە رەش) هەر بۆ ئەوەی لە دڵشادەکانیتر جیابکرێتەوە. لەدۆڵەنێ بۆ لامان هات، کادرێکی لاو، خوێندەوار، چالاک، چاوکراوەو لە قسەی خۆش و نوکتە گێڕانەوەدا وەستابوو. ئێستاش هەندێ نامەی دووردرێژی ئەوم پاراستووە، کە شیکاری و بەراوردکاریە لەنێوان (پەیڕەوی ناوخۆی هێزی پێشمەرگەی کوردستان) لەگەڵ (پەیڕەوی ناوخۆی دەستە چەکدارەکان)دا کراوە، لەئەنجامدا ئەوەی دەرخستووە، هەندێ مادەی (پەیڕەوو پرۆگرامی ی. ن. ک) دەبێ دەستکاری بکرێت.. تاد. ئەم نووسینە رادەی هۆشیاریی دڵشاد پیشاندەدات و بەڵگەی وردبینی و زیرەکی ئەم کادرە رووناکبیرە جوانەمەرگەیە.

ئەو لەتەک شێخ شەماڵ، ئازادی سەگرمە، مەلا عەلی و حەمەرەزا لە (دۆڵەنێ) گەیشتنە لامان. مام جەلال بۆ بەخێرهاتن و پێشوازی هات. هەریەکە خۆی ناساند و بیرمە دڵشاد گوتی: ((من دڵشاد تۆفیقم، کوڕەزای حاجی باقی بەنگینەی شاعیرم**، کە وەختی خۆی هاوڕێت بووە..)).

---

* دڵشاد توفیق (١٩٥٥ ـ١٩٨١)

** حاجی باقی بەنگینە (١٩٠٨ ـ ١٩٧٢) دیوانەکەی دووجار چاپکراوە.

مام جەلال گوتی: ((حاجی باقی بەنگینە شاعیرێکی میللی زۆر باشبوو، شیعری نیشتمانی و کۆمەڵایەتی زۆر جوانی هەیە..)) و هەندێ شیعری بەنگینەی لەبەربوو، بۆی خوێندینەوە:

ئۆخەی گردەکەی یارە
چەند شیرین و نازدارە
ئەو کاریزەی لەبەرپێی
ئاوی شیرینی شارە
بۆیە هێندە جوانی
جێی نەورۆزی کوردانی
سەیرانگەی بەهارانی
جێی ئومێدی لاوانی

دڵشاد رۆژێکیان ئەم سەربردەیەی بۆ گێڕامەوە:

((کابرایەک دەناسم، کەچەڵە، چاوێکی کوێرە، دەستی گۆجە، قاچێکی شەلە، لووتی منگنە، دەمی خوارە.. پیشەنگای ئۆتۆمبێلی هەیە. هەر کەسێک بیەوێت ئۆتۆمبێلێکی لێبکڕێت، هەر بۆ ئەوە ئۆتۆمبێلێک بە نرخێکی گران بفرۆشێت، هەزار سوێندی دەخوارد، کە ئۆتۆمبێلەکە هیچ کێشەیەکی نییە: دەڵێت: کاکە گیان بەخوا عەیب لەخۆمدا هەبێت، عەیب لەم سەیارەدا نییە!)).

دووسێ رۆژبوو، با بۆنێکی پیسی بەسەرماندا دەهێنا! من لەهەر کەسێکم دەپرسی: ((ئەم بۆگەن و بۆنە پیسە چییە؟)). دەیانگوت: ((بزانە دەعبایەکی کێوی مردار بۆتەوە، هیچ نییە!)). لەمامۆستا جەلالم پرسی: ((ئەم بۆنە چییە کاسی کردووین؟)).

ئەویش جەختی لەسەر ئەوە کردەوە: ((ئەم بۆنە کاسی کردووم، رۆژێک زووتر لێرە بڕۆین چاکترە!)).

من کلاشینکۆفەکەم کردە شانم و بەشاخەکەدا هەڵگەڕام و سەیری لۆلۆی رکەکانم کردا دڵشاد لەخوارەوە زۆر بانگی کردم. من دەمویست بگەمە راستی! ئایا پێشمەرگەیەک بەربۆتەوە، یان بە برینداری خۆی گەیاندۆتە ئەم نزیکانە و گیانی لەدەست داوە، یان چی بووە؟

هاتمە خوارەوە و دڵشاد بە سوعبەتەوە ئەم پرسیارەی لێکردم:

((خێرە رووتکردۆتە ئەم شاخ و کێوە؟ خۆ هیچ رووینەداوە؟ لەکەس دڵگران نەبوویت؟)).

من گوتم: ((بۆ هەرکەس دڵگران بێت، روودەکاتە هەوراز، یان بۆ ناو چەم شۆڕدەبێتەوە؟)).

دڵشاد گوتی: ((پەیوەندی بەقورسی دڵگرانبوونەکەوە هەیە!)).

من گوتم: ((بۆنێکی زۆر پیس دێت، کەسێک بەر نەبووبێتەوەو تیاچووبێت.. وەرە با بەدوو قۆڵی سەیریکی ئەو دۆڵە بکەین!)).

دڵشاد گوتی: ((وەرە با بەدوو قۆڵی راستیەکەت لا بدرکێنم.. با کەس ئاگای لەقسەکانمان نەبێت و تکایە با لەنێوان هەردووکماندا بمێنێتەوە)).

من بەڵێنی خۆمدا، قسەکان بۆ بن گڵ بن!

((کاک نەوشیروان، من و دوو کادری تری بانگکرد، لێکۆڵینەوە لەگەڵ جاسوسێک بکەین. من داوای لێبوردنم کرد.

پێمگوت: لێکۆڵینەوە ئەم قەڵەباڵغەی بۆ چییە؟ ئەو دوو کادرە بۆ ئەو شیوە بردبوویان، ئەوەندەیان لێدابوو، گیانی دەرچووبوو..)).

دڵشاد بەسەرە نینۆک پشتملی خۆی خوراند و رازێکیتری درکاند.

من گوتم: ((هەر بەڕاست جاسوس بوو، یان کادرو پێشمەرگەی خۆمان بوو؟)).

((کابرایەکی درێژی بە تەمەن و سەر رووتاوە بوو، پانتۆڵیکی رەش و کراسێکی سپی لەبەردابوو.. من و تۆ پێکەوە نوکتەمان دەگێڕایەوە. دوو کادرەکە*، جاسوسەکەیان دابووە بەر.. ئێستا بیرت دەکەوێتەوە؟)).

من گوتم: ((مام جەلال گوتی: لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکەن؟ ئایا ئەو گلۆپی سەوزی بۆ هەڵکردن: ئەمە بەڵگەی بەهێزی لەسەر هەیە و دەبێ بکوژرێت؟)). من بەئەنقەست نێوی مام جەلالم هێناو ویستم بزانم بڕیاری (م. س) بووە، یان بڕیاری یەک کەس..

دڵشاد گوتی: ((کاکە نەوە ئێمەی بانگکرد و گوتی: ئەوەندە لێیبدەن تا دان بەوەدا دەنێت کە جاسوسە..

ئیدی ئەو کابرایە سەرەڕای دارکاری و تێلاکاری دانی بەهیچ دا نەناوە. ئەوانیش ویستویانە بە تۆپزی و زەبرزەنگ و لێدان قسەی لێدەربهێنن..)). دڵشاد ئینجا بە سوعبەتەوە لەسەر

---

* من نامەوێ نێوی ئەو دوو کادرە بنووسم، لەبەرئەوەی هەردووکیان پاش ماوەیەک شەهید بوون.

قسەکانی خۆی بەردەوام بوو: ((ئەگەر وەزع وابڕوات تا شۆڕش سەردەکەوێت، نیوەی کورد بەدەستی ئێمە دەڕوات)).

من گوتم: ((بە لێدان، تاوانبار دان بە تاواندا نانێت. ئەگەر لێدان و ئەشکەنجەدان، ئامرازێکی سەرکەوتوو بونایە، ئێستا هاوڕێیانی خۆمان سەروبنی رێکخستنیان بەدەستەوە دابوو..)).

# عەوڵا سوور
## (٢٢)

عەبدوڵلا سـوور، یـەکێک بـوو لـە پێشـمەرگە قارەمانـەکانی شۆڕشی ئـەیلول. سـاڵی ١٩٧٦ لەگـەڵ هەڵگیرسـانەوەی شـۆڕش، ئەو یەکێک بوو لەو پێشمەرگانەی لـەبناری قەندیل دەسـتی دایـە چـەک و نمونـەی سـەرکردەی سـەربازیی ئـازاو بـە هیمـەت و ئیـداری بـوو. لەماوەیـەکی زۆر کەمـدا نـاوو ناوبـانگێکی زۆری پەیدا کرد. لە حەملەی هەکاریش بەشداربوو.

مـن لـەدەراوی گورگـان عـەوڵلا سـوورم بینـی و بـە وردی هەندێ برگەی کارەساتەکەی بۆ گێڕامـەوە. پیاوێکی کەڵەگـەت و زمانپـاراو، پەیوەنـدی کۆمەڵایـەتی بـەهێزی هـەبوو. ناوەڕاسـتی تـەمووز خـۆی و دوو پ. م گەیشـتنە لامـان. ڕۆیشـت و پـاش مانگێک گەڕایـەوە، دەسـتەکەی لـەماوەی یـەک مانگدا ببـووە (٣٠) پ. م، هـیچ فەرماندەیـەکم نـەبینیوە لـەو مـاوە کورتـەدا ژمـارەی دەستەکەی بەو شێوەیە فراوان بکاتەوە.

لە عەبدوڵلا سوورم پرسی: ((لەماوەی یەک مانگدا چۆن (٣٠) چەکتان پەیداکرد؟)).

ئەو گوتی: ((زانیاریم لەسـەر کۆمەڵێک سـەرباز کۆکردەوە، کـە سێ ئۆتۆمبێلیـان پێبـوو، سـی سـەرباز دەبـوون. ئێمـە بۆسـەمان بۆیـان نایـەوە. بەدەسـتڕێژێک، بەشـێکیان کـوژران و بەشـەکەی تریان دەستیان بەرز کردەوە و سی چەکمان لێگرتن.. تاد)).

بۆ دواجار لە (دۆڵە کۆگە) سـەردانی کردین. زۆر لـە ڕەسـوڵ مامەند بێزار بـوو. ئـەو گـوتی: ((بـۆ خـاتری خودای! ئاگاتـان لـە

رەسـوڵ مامەنـد بێـت، سـەدان پێشـمەرگەی لـە یـەکێتی هەڵگێڕاوەتـەوە. چارەسـەرێکی بـۆ نەدۆزرێتـەوە، شۆڕشـەکە تێکدەدات..)).

ئەم پیاوە قارەمانە، ئەوەندە هەوڵی شکاندن و برینداركردنی درا، لەئەنجامدا خۆی و لایەنگرانی بە کۆمەڵ چوونە پاڵ رەسوڵ مامەند و هێزەکەی بووە کۆڵەکەیەک لە کۆڵەکە بە هێزەکانی رەسوڵ مامەند و حسک، کە بەربەرەکانێی هێزەکانی یەکێتیی پێدەکرد.

سەید سەلیمیش هەمان کات هاتە دەرەوەو زۆر دڵمان بە هاتنە دەرەوەی خۆش بوو. ئەویش بە دڵشکاوی بۆی لای بسک رۆیشت و پاش ماوەیەک لە شەڕێکی قارەمانانەدا شەهید بوو.

# حاجی شێخەی بنزێری

# (٢٣)

زۆربەی پێشمەرگەکان، کەسانی سەربەرزبوون. گەردنیان لەگەردنی ((قووچباش)) و ((کەوگەز)) و ((سەری سادر)) دەچوو. ڕێزیان چەند لەسەرکردایەتی دەگرت، دە ئەوەندە ڕێزیان لەخۆیان دەگرت. یەکێک لەو پیاوە زۆر بەڕێزانە (حاجی شێخەی بنزێری) بوو. پیاوێکی لەهەمووان بەتەمەنتر، قورس و گران و کەمدوو. هەر لەسەرەتای شۆڕشی ئەیلولەوە دەبێتە پێشمەرگەو مام جەلال دەناسێت و لەناو هێزەکەی ئەودا دەبێت.

بنزێری تیرەیەکە لە تیرەکانی عەشیرەتی ئاکۆ، گوندێکیش هەیە نزیکی سەنگەسەرە هەمان ناوی هەیە. حاجی شێخە خۆی لە حاجی هۆمەران گەورە بووەو کەس و کاریشی هەر لەوێ بوون.

حاجی شێخە لێپرساوی ڕێکخستنەکانی (ی. ن. ک) لەناوچەی باڵەکایەتی بوو. ئەو ١٩٧٦/٥/٢٧ خۆی گەیاندە دەستە چەکدارەکانی قەندیل، کە پێشتر دەستە دەستە ڕێکیخستبوون و ڕەوانەی ئەوێندەرێی کردبوون. پێشمەرگەکان دەیانگوت: ((حاجی شێخە لە ١٩٧٦/٢/٢٥ هاتۆتە شاخ)).

ڕۆژێک عوسمانە چکۆل، کە ئەویش پێشمەرگەی ١٩٧٦ بوو ماوەیەکیش لەئێران زیندانی دەکرێت بۆ ((کوڵ)) دەچێت: لەناو چەم ئاو گەرم دەکات و جلەکانی دەشوات و وشکیان دەکاتەوە،

خۆی دەشوات و دوای عەسر دەگەڕێتەوە. مام جەلال بە پێشمەرگەیەکدا نامەیەک دەنێرێت، گوایە بدرێتە عوسمان چکۆل زوو بیگەیەنێت. دواتر مام جەلال*، عوسمان دەبینێت لەسەر بەردێک دانیشتووە، دەڵێت: ((عوسمان نامەکەت گەیاند؟)).

عوسمان دەڵێت: ((مامە نامەی چی؟)).

مام جەلال دەڵێت: ((نامەکەت نەگەیاندووە... من بەیانی زوو نامەکەم بۆ تۆ رەوانە نەکردووە؟)). مام جەلال هەڵدەچێت و لەعوسمان تووڕە دەبێت و چەکی دەکات و چەند شەپازللەیەکی لێدەدات. حاجی شێخە دەبینێت لە عوسمان دەدرێت و ئەوە دەزانێت عوسمان لە (کوڵ) بووە و ئاگای لەنامە نەبووە. دەیەوێت کارەکە بۆ مام جەلال روونبکاتەوە. مام جەلال تووڕە بوایە، نەیدەتوانی گوێ بۆ روونکردنەوە بگرێت. هەر ئەوەندەم زانی پێشمەرگەی هەردوولا چوونە سەنگەرەوە. من کادر و پێشمەرگەکانم کردە دوو بەشەوە:

بە ئازادی سەگرمە و دڵشاد و حەمەڕەزام گوت: ((زوو بڕۆن لە پشت مام جەلال بوەستن، نەوەک ئەوان پەلاماری بدەن..)) بەشەکەیتریش بەچەکەوە چوونە سەر لووتکەیەکی بەرز، کە بەسەر هەردوولادا دەیڕوانی. خۆشم چوومە خوارەوە و بە مەبەستی هێور کردنەوە و رێگە گرتن لە تەقەکردن و ئاڵۆزبوونی رووداوەکە..

---

* بڕوانە نەوشیروان مستەفا: (لەکەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ..) ل ٣٢٦ باسی ئەم رووداوەی کردووەو مەبەستی دەرخستنی راستیەکان نەبووە.

هـەر ئـەو ئێوارەیـە حـاجی شـێخە، بەشـێوەیەک هەسـتی بـە کەرامەت رووشاندن و لووتشکاندنێک کرد، ئیدی بارگەی لێکناو لـەو ناوەیـە نەمایـەوە و خـۆی رادەسـتی تاریکـە شـەوی قەنـدیل کرد. پاش دوو سێ رۆژ بیستمان چەکی داناوەو خۆی رادەستی رژێم کردووە.. دوو هەفتـەی پێنـەچوو بیسـتمان، رژێم پیلانیکی بۆ داناوە خۆی و کورێکی پێکـەوە کوشـتووە. ئای خودایـە! ئـەو رۆژە بۆ لەسـەر لوتکەیەک لـە لوتکـەکانی قەندیل بەرنەبوومـەوە! ئای خودایە! ئەم رووداوەم چەند پێناخۆش بـوو: توورەبـوون و لەیەک تێنەگەیشتنێک، نیوەی هێزەکەی کردە ئاردی نێودڕک. من ئـەوەم دەزانـی توورەبـوون، پەشـیمانی بـەدوادا دێت، بەتایبـەتی: دووان، کە ساڵانێکی دووورودرێژ لەیەکەوە نزیـک بـوون. حـاجی شێخە رێگەی مردنی بۆ خۆی هەڵبژاردو ئامادە نـەبوو لەبـەردەم پێشـمەرگەو کادرەکانـدا ئـەو هەسـتە بـە خـەڵک بـدات گـەردنی لەگەردنی ((قووچباش)) و ((کۆدۆ)) و ((شـەمۆڵ)) نزمترە! رژێـم دەیزانی حاجی شێخەی بنزێری کێیـە؟ مـەخابن ((شـۆڕش)) رۆڵـە دڵسۆزەکانی خـۆی نەدەناسییەوەو دەیـان مرۆڤـی دڵسـۆز ناچـار کـران رێگـای ناڕاسـت و هەڵـە بگـرن و ملـی خۆیـان بـە شـکاندن بدەن!

# مامۆستا عەزیز مەحمود
## (٢٤)

دەمزانی مامۆستا عەزیز ئەندامی سەرکردایەتییەوە ماوەیەک خۆی و ئارام لەقەرەداغ پێکەوەبوون. نوکتەو قسە خۆشەکانی لەبن هەموو دەوەن و بنچک و سەرکانیاوێک، بەر گوێیان دەکەوتن، بەڵام خۆی لەهیچ کوێ دیار نەبوو. بەیانییەک لەناو دۆڵ و رەوەز و باسکەکاندا، گوێمان لە دەنگە دەنگ و نەڕە نەڕو هەرای مامۆستا عەزیز بوو. پیاوێکی تۆکمە، قژڕەش، سمێل ئەستوور، دەنگ زل و کەسایەتیەکی ناسراو. ئێمە لەساڵی (١٩٧١)دا خۆی و سالار عەزیز و د. فازیل تەیب پێکەوە بۆ خانەقی هاتن، بەندەش ئەندامی لقی دیالای یەکێتی قوتابیان بووم و ئەوان هەرسێکیان ئەندامی سکرتاریەت بوون و ئیدی لەوێوەوە یەکتریمان دەناسی..

م. عەزیز هاتە سەرەوە و کردیە رۆژی خۆی و گاڵە گاڵ. مام جەلال، دیاربوو گوێی لەدەنگی زولاڵی م. عەزیز بوو، پاش چەند چرکەیەک خۆی و مارف دەرکەوتن. سەرلەنوێ چۆنی و چاکی و لەقاقای پێکەنین درا. ئەو دەیویست بزانێت: بۆ م. عەزیز وەکو لێپرسراوی لقی قەرەداغ، بە درێژایی چوار مانگ، دەست بەکار نەبووە؟ سووریش دەیزانی لەناو شار بووەو لەوێ دەیان کەسی بینیوەو پارێزگاری رێساکانی کاری نهێنیی نەکردووە. ئەو بە شێوازی ئامۆژگاریی باوکانە و بەئاوازی بەتەنگەوە هاتن بە م. عەزیزی گوت:

((ئـەرێ مامۆسـتا عـەزیز بـەڵێنت نـەدامێ، جـارێکی دیکـە سەردانی ناو شار نەکەیت و ئاگات لەخۆت بێت؟)).

م. عەزیز: ((مام جەلال بێ قەزا بێت، شـاری چی! من لـەکوێ خـەڵکم بینیوە؟ تۆ چۆن بڕوا بـەم جۆرە قسـە بێ سـەروبەرانە دەکەیت!)).

مـام جـەلال: ((مامۆسـتا عـەزیز تـۆ ئەنـدامی سـەرکردایەتیت و لای حکومـەت تـۆ قورسـایی خۆتـت هەیـە و تـۆ لـەناو شـار بـەم شـێوەیە دەمێنیتـەوە، لـەکونی هەتیتـەش خـۆت قـایم بکـەیت پیاوەکانی رژێم دەتدۆزنەوە. تۆ نابێ ئەوەندە کەمتەرخەم بیت و رژێم بە هیچ نەزانیت!)).

م. عەزیز: ((زۆر چاک ئەو راستیانە دەزانـم و بڕوام پێ بکـە، زانیاریی ناڕاستت پێ گەیشتووە!)).

مـام جـەلال: ((مامۆسـتا عـەزیز بـۆ پەنجـە ناخەیتـە دەممـەوە بزانە دەیگەزم؟ تۆ لەناو شـار نـەبووی؟ ئـەم دەم و چاوە هـاوار ئـەکات! ئەمـە دەموچـاوی بەرهـەتاو و برسـێتی و دەشـت و دەر نییـە، ئەمـە دەموچـاوی بـەر سـێبەرو موبەریدەو گیپـە و کوبـە و کفتە و شفتەیە!)).

م. عەزیزکـە دڵنیـابوو مـام جـەلال زانیـاری وردی لەسـەری هەیە و گوتی: ((دوو سێ رۆژ لەوێ بووم و گەڕامەوە..)).

مام جەلال: ((ئەوە سێ چوار مانگە لەپەنای قەل و مریشـک و بریانی و پەردە پلاوودا سەنگەرت لێداوە، ئـەوە لای من دەیکەیتە دوو سێ رۆژ؟)).

مامۆسـتا عـەزیز هـیچ قسـەیەکی بـۆ نەمایـەوە و دەمـی بـووە تەڵەی تەقیو..

مام جەلال: ((دڵنیام مامۆستا عەزیز سەدی سەد دەگیریت و ئیعدامت دەکەن و منیش یەک دێڕت لەسەر نانووسم، چونکە تۆ قسەی ئێمە دەشکێنیت و سێ چوار رۆژیتر سەرلەنوێ بەرەو ناو شار دەکشێیت... کفتەی سابونکەران و یاپراخی گەلامێو و گیپەی لا تەراف بمگرەو هاتم..)).

مامۆستا عەزیز دیار نەما. پاش چەند هەفتەیەک گیرا و دوای چەند مانگێک لەسێدارە درا. کراسەکەی م. عەزیزیان کردە (کراسەکەی عوسمان) و تاوانی خیانەتیان لەخۆرا خرایە پاڵ مامۆستا نەریمانی بێتاوان. ئەم کادرە دڵسۆزو نیشتمان پەروەرە لەسەر کێشەی گیرانی م. عەزیز کرایە بێژنگ و کەس نەیزانی قەسابەکان لاشەکەیان لەکوێ فڕێدا؟ دوا وشەی مامۆستا نەریمان داوایەکی زۆر قورس بوو:

((دەمکوژن قەیناکات، بەلام تکایە تاوانی خیانەت مەخەنە پالم. من خیانەتم نەکردووەو بەغەدر دەمکوژن...)).

من ئێستاش خوێنی شەهید مامۆستا نەریمان* (عوسمان حسێن ئیسماعیل عوزێری) بەسەر بەردەکانی توژەڵەوە دەبینم و پۆلێک کۆتری سپی بە ئاسمانی ((نۆکان)) و((باسکەڕێوی)) و ((کانی کەنێر)) دەسوورێنەوەو پاسەوانی گزنگی دوا وشەکانی دەکەن...

---

* لەکتێبی (لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕەی ناوزەنگ) ل ۱۷۳ بەزەقی ئاماژە بۆ ناوی مامۆستا نەریمان کراوە، گوایە جاسوسی رژێم بووەو ئەو ئارامی لەخشتە بردووە. ئەمە غەدرێکی گەورەیە کراوە. ناوەندی کۆمەڵە بەوردی لێپێچینەوەی لەگەڵدا کردوو قەناعەتی ۱۰۰٪ کرد، کە ئەم کادرە زۆر پاکەو هیچ لەکەو گومانی پێوە نییە، دەبوایە (م. س) دان بەهەڵەکاندا بنێت و (رد إعتبار)ی بۆ بکرێت، نەک تاوانی جاسوسی بخرێتە پاڵ. ئەگەر ئەو تاوانە راستە، کە خوێنی مامۆستا نەریمانی لەسەر رژێنرا، ئەی کوا بەڵگەکانی ئەوانەی تاوانەکەیان بۆ دروستکردووە.

## وارمیوان

## (٢٥)

کۆتایی تەمووزی ١٩٧٨ لە (وارمیوان) گیرساینەوە. لاپاڵێکی تەخت، ئاسمان و لوتکەی شاخەکانمان لێوە دیاربوو. کانیاویکی سارد، بۆ ئاو خواردنەوەو کوڵکردن سوودمان لێدەبینی. ئێرە لەچاو (دەراوی گورگان)دا گەرمتر بوو. پێنج چادرمان هەڵدابوو. رۆژێک کامێرایەکی کۆداکم دەستکەوت، وێنەیەکی چادرەکانمان گرت. نووسەرێک، کە باسی ئەم قۆناخەی کردووە، نووسیویەتی لە قەندیل تەنیا یەک چادرمان هەبوو.

چادرەکەی (حاجی کاک ئەحمەد) بە تەنیشتمانەوە بوو. حاجی جل و بەرگێکی تایبەتی لەبەر دەکرد. رانکی شین و چۆخەی زەرد و کراسی سپی و کەشیدەیەکی ئەستووری بەستبوو. نەوشیروان و عەلی ئامەخان ناویان لێنابوو (حاجی نەرگس) لەکتێبەکشی بەو ناوە ناوی هێناوە. ئەم پیاوە لە چۆمان چایچی دەبێت و مام جەلال هێنای و کردیە فەرماندەی هێزەکە. هەرچەند رێکردن و قسەکردن و دانیشتن و دەستەو دایەرەکەی لەوە نەدەچوو، رۆژێک پێشمەرگایەتی کردبێت. لەدڵی خۆمدا دەمگوت: حاجی شێخەی بنزێری لەکوێ و حاجی کاک ئەحمەدی پشتئاشان لەکوێ!

حاجی زوو زوو بۆ لامان دەهات. ئەو رۆژێکیان هات و گوتی: کێ لە ئێوە خوێندەوارە؟

من هەر زوو گوتم: ((کاک ئازاد لەهەموومان خوێندەوارترە..)). مەبەستم ئازادی سەگرمە بوو. (ئازاد نامەکەی

بـۆ نووســی و ئـەویش مـۆر و ئیسـتەمپاکەی لەبـەر باخـەڵان دانـابوو. ئـازاد نامەکـەی دەنووسـی، ئـەمیش مۆرپێوەنانەکـەی لەسەر بوو. ئازاد بەجوانی بۆی باس کرد، نووسراو بۆ کەرت و هـەرێم و کۆمیتـە.. تـاد. دەنووسـرێت و مـۆری دەوێـت، ئەمـە نووسـراوی رەسـمیە. نامەنووسـین بـۆ کـەس و کـارو دۆسـت و ئاشنا مۆری ناوێ. نامـەیەکی بـە ئازاد نووسی بۆ ناسـیاوێکی، هێســـترێکی بـــۆ بفرۆشـــێت. دەســـتی بـــە مۆرەکـــەوە، بـــە ئاسمانەوەبوو، ئازاد توند مەچەکی گرت. بە هـەزار حـاڵ سـاردی کردەوە، (مۆرلێدانی ناوێت!) پاش سێ مانگ حـاجی لەلایـەن مـام جەلالـەوە داماڵـەخاس کـرا. ئـەو گـوتی: ((لەبنـەوە پەیوەنـدی بـە رژێمەوە هەیە، باش بوو زوو پێمانزانی، ئەگینا هـەر هـەموومانی ژەهران خواردوو دەکرد..)).

بەرە بەرە سەرکردە و کادرو پێشمەرگانە دەگەڕانەوە، کە لـە هەکاری زیندانی کرابوون لەوانە (م. عومـەر عەبدوڵڵا، م. سـەلام عەبـدوڵڵا، شـێخ حسـێن بەرزنجـەیی، رێبـوار چاوشـین...) ئەمانـە هەریەکەیان داستانێکیان دەگێڕایەوە.

# مولازم عومەر عەبدوڵڵا
# (٢٦)

م. عومـەر عەبدوڵڵا بـەوردی باسـی ڕەوتـی حەملەکـەی کـرد، هـەر لەناوچـەی برادۆسـتەوە بـەرەو (تەڵـە)کـەی هـەکاری و تـا تێکشکانی هێزەکە و خۆبەدەستەودانی سـەرکردە سـەربازیەکانی یەکێتی.. مـام جـەلال داوای لـە م. عومـەر نـەکرد: لێکۆڵینەوەیـەک لـەڕووی عەسـکەرییەوە لەسـەر ڕووداوەکـە بنووسـێت. سـاڵی ١٩٧٥ داوا لــە ئەفســەرەکانی ســوپای عیــراق کــرا، هەریەکــە لێکۆڵینەوەیـەک لەسـەر نسـکۆی ڕووداوە عەسـکەریە گرنگـەکانی کوردسـتان بنووسـن. سـەرکردایەتی نەیدەویسـت تیشـک بخرێتـە سـەر هـیچ لایـەنیکی ئـەو ڕووداوە، کـە بێگومـان کاردانـەوەو ڕەنگدانـەوەی لەسـەر داهـاتووی (ی. ن. ک) هـەبوو، تـا ئـەمڕۆش شوێنەواری بەسەر شێوەی کارو بیرکردنەوەی سـەرکردایەتی و کادرەکانی یەکێتییەوە بەرچاو دەکەوێت..

م. عومەر چاوی بە بەشێک لەسـەرکردایەتی پارتی کـەوتبوو، ئەوان پێیانباشبوو لاپەڕەیەکی نوێ هەڵبدرێتەوە. سامی نامەیـەکی ئاراستەی سـەرکردایەتی کۆمەڵە کردبوو، نەوشیروان نامەکـەی پیشــانی یــەک کــەس نــەدا. لــەبری ئــەوەی قســەیەکی لەســەر پێشنیازەکەی سامی هەبێت، یان هەنگاوێک بنرێت بۆ ئازادکردنی زیندانی و دیلـەکان، دابارێـە سـەریان بـە جوێنـدان و هەڕەشـە و گوڕەشـە.

## ماموستا سەلام عەبدوڵا

## (٢٧)

م. سەلام عەبدوڵلا هاوینی ١٩٧٧ لەزیندانی (هەیئە)ی کەرکوک بەشێوەیەکی ئەفسانەیی هەڵهاتبوو. بەشێک لە چیرۆکی هەڵاتنەکەی دەنووسێتەوەو لەرێگەی هەکاری بزر دەبێت. لە (وارمیوان) بەرە بەرە، سەرلەنوێ داستانی (هەیئە)ی دەنووسییەوە و بۆی دەخوێندمەوە، من هەر ئەوکاتە بە پەخشانیکی جوانم داناو زۆرم هاندا بە کتێبێک بڵاوی بکاتەوە. پێش ئەوەی (هەیئە) بنووسریتەوە، ماموستا سەلام دوو سێ جاری تریش تووشی گرتن و زیندانی کردن هات.

ماموستا سەلام ماوەیەک پاسۆک بوو، ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم، ئەندامی سەرکردایەتیان بوو. ئەو یەکیک بووە لەو شاندەی کۆبوونەوەیان لەگەڵ ئارام کردووە. هەر لەناو کۆبوونەوەدا، ماڵئاوایی لە (ئازاد مستەفا)* و پاسۆک دەکات و بەڕاشکاوانە بەهاوبیرەکەی دەڵێت: ((ئەمانە شۆڕشیان پێدەکرێت و شۆرش بە ئێوە ناکرێت. من لەمەودوا لەگەڵ کۆمەڵەدا کاردەکەم..)).

ماموستا سەلام پێیگوتم: ((سەرکردەکانی پاسۆک لەناو خەیاڵ و فەنتازیادا دەژیان و بەرپێی خۆیان نەدەبینی..)).

ئەم رێزی زۆری لەئارام و کۆمەڵە دەگرت. ئەوساش بیرکردنەوەی لەگەڵ یەکێتی و نەوشیراون نەدەگونجا و رەخنەی خۆی بەڕاشکاوانە دەگرت.

---

* ئازاد مستەفا (١٩٤٨ـ ١٩٨٩) ماوەیەک سکرتێری پاسۆک بوو. کوردیەکی جوانی دەزانی. ناسیونالیستیکی توندڕەو بوو. بە نەخۆشی شێرپەنجە لەسوید کۆچی دوایی کرد. ئازاد مستەفا پیگوتم: ((مەعز بۆ خوا ئێوە چی دەکەن؟ ئێوە پیاو خراپەکان دەکوژن و رژێمیش مرۆڤە چاکەکان دەکوژێت، لەئەنجامدا کورد نامێنێتەوە!)).

# هاوڕێ مارف
## (٢٨)

هـاوڕێ مـارف نـاوە راسـتەقینەکەی (عوسـمان عەسـکەری) و برازای عـەلی بچکۆل بـوو. مرۆڤێکی راستگۆ، بوێر، قسـەلەڕوو، دڵسـۆزو هۆشـیارو خوێنـدەوار بـوو. بـەگوێرەی قسـەی خـۆی: کۆمەڵـە ئـەوی لەدەسـتەکەی مـام جـەلال دانـابوو، پێشـتریش ماوەیەک لەگەڵ ئارامدا دەبێت. مارف پێنج دەقیقە کاتی هەبوایـە، کەسـێکی دەدۆزیـەوە، سـەرەتاکانی فەلسـەفەی مارکسـیزمی بـۆ رووندەکردەوە.

چێشـتەنگاوێک د. مـەحموود سـەردانی کردین و گفتوگۆیـەکی گەرم لەسەر خۆپیشاندنەکانی ئێران کرا. نیوەڕۆ ویستی بڕوات، ئیـدی پێمـانگوت: ((چێشـت لێنـراوە؛ قوبـولی و قاورمـەمان هەیـە، ئەوە خواردن تێدەکرێت، چۆن دەبێ بڕۆیت؟)).

دکتـۆر مـەحموود گـوتی: ((ئـەو مارفـە تـا کـەوچکێک شـۆربات دەداتێ یەک سەعات باسی دیالیکتیکت بۆ دەکات..)).

سـابیر کۆکـەیی گـوتی: ((لـەمارف ئـازاتر و چاونەترسـترم نەدیوە: لەزیندان پێکەوەبووین. مارف دێڕێکی دەخوێندەوە، کە لەسـەر دیوارەکـە نووسـرابوو. ئەفسـەرەکە شـێراندی: نـابێ نووسـینی سـەردیوار بخوێنیتـەوە. ئـەو خـۆی لـێ تێنەگـەیانـد. ئەفسـەرەکە سـەرلەنوێ شـێڕاندیەوە. مـارف هـەر ئاوڕیشـی لێنەدایـەوە. تەپڵـەکێکی تێگرت بـەر سـەری بکەوتایـە دەستبەجێ مێشکی دەپژاند!)).

چادرەکەی نەوشیروان بە تەنیشت چادرەکەی مام جەلالەوە بوو. چادرەکەی کۆمەڵەش، دە مەترێک لەهەردووکیانەوە دووربوو. نەوشیروان لەچادرەکەی دێتە دەرەوە، سندووقێک تەماتەی سوور دەبینێت، کە لەبەر تیشکی هەتاوەکە دەبریسکێنەوە و بۆی پێدەکەنن. بە مارف دەڵێت: ((مارف لەو تەماتەیە دوو سێ تەماتەم بۆ بێنە!)). مارف موجامەلات و ماستاوکردن و شیردا بۆ داپیرەی دای نەدەزانی، راست و ڕەوان گوتبووی: ((کاکە نەوە گیان! مامە پێیوتم: ئاگات لەو تەماتەیە بێت، یەک تەماتە بە یەک کەس نادەیت، ئەگەر باوکم هات و داوای یەک تەماتەی کرد، مەیدەرێ! خۆشت مام جەلال لەمن باشتر دەناسیت و نامەوێت کێشەیەک دروست بێت..)).

نەوشیروان لەبری ئەوەی قسەکە قووت بدات، یان تۆزێک رستەکانی مارفی داماوی مشت و ماڵ بکردایە. کاتێک مام جەلال دەبینێت دەڵێت: ((کاکە نەوە ئەوە هەمووی تەماتەیە بە ئارەزووی خۆت چەندت حەز لێیە ئەوەندە بەرە..)). نەوشیروان هەر بە پێکەنینەوە، بە ئەمانەتەوە قسەکانی مارفی بۆ گێڕابۆوەوە. مام جەلال سوێندی بۆ خواردبوو، کە ئەو قسەی وا بەسەر زاریدا نەهاتووە. بانگی مارفی کردو پێی گوت: ((ئەرێ مارف من پێمگوتی: ((تەماتە بە کاکە نەوە مەدە؟)).

مارف: ((مامە گیان تۆ ناوی کاکە نەوەت نەهێنا، بەڵام گوتت ئەگەر باوکم هات و داوای یەک تەماتەیشی لێکردی مەیدەرێ! ئەمە کاکە نەوەش دەگرێتەوە..)).

مام جەلال لەمارف خراپ تووڕە بوو، بە ئومێدی ئەوەی مارف لەقسەکانی پەژیوان بکاتەوە.

مارف دەیگوت: ((مامە تۆ پێتوایە من درۆ دەکەم؟)).

هەلاکە زۆر گەورە بوو! من نامەوێ سەرتاپای وردەکارییەکان بنووسم و سەری خوێنەرانی ئازیزی پێ بئێشێنم... ئازادی سەگرمە و حەمە سەعید و هاوڕێ جەبار و مامۆستا سەلام.. هەر هەموو رژاینە سەر گۆڕەپانی شەڕەکە و مام جەلالمان سارد کردەوەو مارفیشمان دوورخستەوە. گلەیی زۆرمان لە نەوشیروان کرد، کە ماکی سەرەکی هەلاکە بوو. ئەو گوتی: ((چوزانم مام جەلال بەم شێوەیە تووڕە دەبێت!)).

دەمەو ئێوارەی هەمان رۆژ، کتری چاکەم لەسەر پشکۆ دانابوو. مارف منی بەدیکرد بۆ لام هات. پاش چۆنی و چاکی، بەڕاشکاوانە پێمگوت: ((لەناخەوە پێمناخۆشە ئەم هەلایە روویدا..)). مارف گوتی: ((ئەمە هەر هەمووی هەڵەی کۆمەڵەیە و من بڕیاری خۆمم داوەو ئیتر من لێرە نامێنمەوە... بەلام دەمەوێ چەند پرسیارێکت ئاڕاستە لێ بکەم!)).

من گوتم: ((فەرموو هاوڕێ مارف!)).

هاوڕێ مارف: (( پرسیاری یەکەم: پەیوەندی نێوان کۆمەڵە و یەکێتی: لقی: أ: ئایا کۆمەڵە رێکخراوێکی سەربەخۆیە لەناو ی. ن. ک یان پاشکۆیە! پرسیاری یەکەم: لقی: ب : لەناو کۆمەڵەدا کێ بڕیار بەدەستە؟..)).

من بە هاوڕێ مارفم گوت: ((من پێمباشە پرسیار بە پرسیار وەلامت بدەمەوە!)).

مارف گوتی: ((من تەنیا بیست پرسیارم هەیەو هەر پرسیارێکیش بریتییە لە پێنج لق، پرسیارەکانم پێمەبڕە تا لێدەبمەوە..)).

مارف سەد پرسیاری بەسەریەکەوە لێکردم. ئینجا بە منی گوت: ((فەرموو مامۆستا وەلامم بدەرەوە؟)).

ئەوەی راستی بێت، لەو سەد پرسیارە، تەنیا هەشت نۆ لقێکم بیرمابوو. بۆیە گوتم: ((هاوڕێ مارف تۆ بیست پرسیارت لێکردم و گـوێم لێگرتـی، دەکـرێ بـەش بـەش وڵامـی پرسـیارەکانت بدەمەوە؟)).

بەڕاسـتی مـارف مێشـکێکی سـەیری هـەبوو. پرسـیارەکانی نەنوسیبووەوە، لەمێشکی خۆیدا هـەمووی بـەش بـەش کردبـوو، زنجیرەی لۆجیکی بۆدانابوون، دەیزانی هـەر بـۆ نمونـە پرسـیاری ژمـارە (١٨) لقـی (ج) چـۆن داڕێـژراوە.. ئـەم هـاوڕێ مارفـە هاوسەنگەرەکانی ئاوا ڕێزیان لێناو رژێمیش لەت لەتی کرد.

# ڕەوشتی بۆرجوازی
## (٢٩)

ئێوارەیەک مام جەلال منی بینی، حەزی دەکرد پێکەوە پیاسەیەک بکەین. دەیویست بۆچوونی من سەبارەت بە گەشەکردنی ڕێکخستنی ناو شار بزانێت و ئایا ڕووداوەکانی هەکاری کاریگەریان لەسەر ڕێکخستنی ناو شار دەبێت؟

من بەگوێرەی شارەزایی خۆم، وەڵامی پرسیارەکانم دایەوە و جەختم لەسەر پێویستی بەهێزکردنی ڕێکخستن کردەوە. ڕێکخستن لاواز بێت، هێزی پێشمەرگەش تووشی تێکشکان هاتبیت، ئەوە چارەنووسی خەباتی گەلەکەمان باش نابیت.

ئازادی سەگرمە قاپێکی دەم کەپەڕی، بن قوپاوی ڕەشداگەڕاوی لەسەر ئاگر دانابوو، یەک دوو کەوچک ڕۆنی تێکردبوو، گونکێکی پانکراوی هاویشتە ناو دەفرە قوپاوە ڕەش هەڵگەڕاوەکەوە، قرچە قرچی ڕۆن و دووکەڵی ناو دەفرە قوپاوەکە، مام جەلالیان بێدارکردەوە، شێوەی قسەکردنی گۆڕا. گوتی: ((مامۆستا جەعفەر ئێوە کادرەکانتان فێری ڕەوشتی بۆرجوازی دەکەن!)).

زانیم مەبەستی ناو ساجییەکەی ئازادە، من به پرسیارێک لەدەربڕینەکەی ئەو خۆمم نەبان کرد.

((نازانم مەبەستت چییە! هیچ ڕوویداوە؟)).

مام جەلال گوتی: ((ئازاد نابینیت، تاوەیەکی پڕ لە ڕۆن کردووە و خەریکی ناو ساجییە؟)).

من گوتم: ((بەناوساجییەک خەڵک دەبێتە بۆرجوازی؟)).

مام جەلال گوتی: ((ئەمە رەوشتیکی بۆرجوازیانەیە. ئێوە کادرەکانی خۆتان فێری ڕەوشتی خراپ دەکەن و شۆڕش بەرەو هەڵدێر دەبەن!)).

من ئازادم چاک دەناسی و مرۆڤە و حەزی لەناوساجی کردووە و من لەو ڕۆژەوە ناوساجیم بەشێوەیەک لەبەرچاو کەوتووە، قەت ناتوانم ناوساجی بخۆم. ئەوەشم دەزانی کەر لەکوێ کەوتووەو کوندە لەکوێ دڕاوە! بەڵام لەهەڵچوونە کوت و پڕەکەی مام جەلال تێنەگەیشتم! من گوتم: ((بێ قەزابیت توورەبوونی ناوێت، پێشمەرگەیەک دوو سێ مانگە بەنانەڕەقە و بە بێ نانی هێناویەتی، ناو ساجییەک ئەوە ناهێنیت دڵی کەسێکی وەکو ئازاد بشکێنرێت..)).

بە سوعبەتەوە گوتم: ((دڵنیام مارکس و لینین و ماوتسیتۆنگ ناوساجیبان نەبینیوە، ئەگینا بەخواردنی پرۆلیتاریایان دادەنا..)).

دوای ئەم قسانە هیچی نەگوت، چووە سەر باسێکی تر..

# بەربەسیل

## (٣٠)

بـەدرێژایی هـاوین، ڕەوەنـدەکان، تـاک و تـەرا لەکوێسـتان دانەدەبڕان، دوورو نزیک، هەواری خێڵاتی هەردوو دیو، ئاوەدان دەکرانـەوە، یـان لـەدوورەوە ڕەشـماڵ و شـوان و ڕانەمـەڕمان بەدی دەکرد. بە چلەی هاوین، مێرگ و بنارەکان سەوز و بژوێن بـوون. کۆچـەرەکـان نەیانـدەتوانی ڕێگـە بـە خۆیـان بـدەن ڕانەمـەڕەکانیان لـەگژوگیای تـەڕو ئـاودار و ئـاوی سـاردی کوێسـتان بێبـەش بکـەن. وا ڕێکـەوتووە، دووسێ مـەڕ لەشـاخ بەربوونەتـەوە، شـوانەکـە بـەدیاری، یـان بەهـەرزان فـرۆش لەدەستی دەرهێنراوە و شوکری خولاش کراوە.

بـەرخیک پەیـداکرا و لەسـەرکانی لـەت و پـەت کـرا و وەکـو مەنگوڕان دەڵێن: (زێڵە گۆشت)ی لێدروستکرا. سێڵ لەسـەر ئاگر دانراو بەرە بەرە گون و گورچیلە و جگەر و پەراسوو لەسەر سێڵ دانـرا. ئـەم جـۆرە گۆشـت برژاندنـە لـەناو مەنگوڕایـەتی و دەڤەری ئاکۆ ناوی (بەربەسێڵ)ە.

هاوڕێ جەبار بەدەوری سێڵەکەدا دەسووڕایەوەو ئەوپەڕی زەوقـی هـەبوو، هـەموو گیـانی پێدەکـەنی و بـەدەنگێکی بـەرز دەیگوت: ((ئەزانن بۆ من ئەوەندە دڵخۆشم. مام جەلال لێرە نییە، هـەر خۆمـانین. گون و گورچیلـەو دڵەکـەی بۆ مـن. بەشـی یـەک کـەس نـادەم. دەبـێ وا جـوان بیـانبرژێنم، باشـترین وەسـتای سلێمانی نەتوانێت ئاوا بەجوانی بیبرژێنیت. بە قوربـانی ئـەم گون و گورچیلەو دڵە بم..)).

هاوڕێ جەبار لەسەر شیعر هۆنینەوە بـەردەوام بوو، ئازادی سەگرمە و حەمە سەعید و مامۆستا جەلال پێیان دەگوت: ((کاکە

برژاوەو بەشەکەی خۆت لەسەر نان دابنێ و بیخۆ..)). هاوڕێ جەبار دەیگوت: (( فرسەتە مام جەلال لێرە نییە و بەخوا دەبێ بیکەمە دەنووکی کەو..)).

لە پڕ مام جەلال لەسەرەوە هات و گوتی : ((سلاوتان لێبێت)).

((ئەوە چی دەکەن؟)).

هەموو گوتمان: ((فەرموو.. فەرموو.. مام جەلال!..)).

ئەو ئیتر خۆی دەستی کردە هەڵگێڕانەوە و داگێڕانەوەی گون و گورچیلە و دڵ و جگەر و دەیگوت: ((کامەران کوڕم فێربە، گۆشت برژاندن ئاوا دەبێت..)). پارچەیەکی هەروا بە ڕووتی خوارد و گوتی: ((هاوڕێ جەبار بەراستی تۆ لەگۆشت برژاندندا هونەرمەندی! کامەران ڕۆڵە! بەجوانی سەیری دەست و پەنجەی هاوڕێ جەبار بکە!)). دووسێ پارچە جگەریشی خواردو گوتی: ((بەهبە هـ. بەهبە هـ. کامەران.. سەیری ئەم گۆشت برژاندنە بکە .. بە بە هـ. بەهـ. ئەمە لەم ناوچەیەدا پێیدەگوترێت بەربەسێڵ.. سەیری ئەم دڵ و گورچیلەیە بکە..)). هاوڕێ جەبار پیشی دەخواردەوە و بەڵام بەزار دەیگوت: ((فەرموو مامە گیان.. ئەمە جوان برژاوە..)) مام جەلالیش دڵی هاوڕێ جەباری نەدەشکاند و پارچە پارچە دەیخوارد. هەموو ئەوانەی لە نزیک سێڵەکەوە وەستابوون تا مام جەلال خواحافیزی نەکرد، کەس دەستی بۆ پلێیک نەبرد. لەناخەوە، هەموو بەقسەکانی هاوڕێ جەبار کوڵابووین. پێمان عەیب بوو پێبکەنین و چاوەڕێمان کرد تا ئەو کامەرانی بە ڕێکو پێکی فێری هونەری بەربەسێڵ کرد. هەر ئەو ڕۆیشت هاوڕێ جەبار گوتی: ((ئەرێ ئەمە لەغەیبەوە هات.. لەئاسمانەوە دابەزی.. ئەمجارەش گون تیاچوو.. گورچیلە فەوتا.. دڵ بە لێو خورا.. جگەر یەک پارچەیشی نەمایەوە..)).

# حاجی چاوشین
## (٣١)

حاجی چاوشین نازناوی (صدیق ئیبراهیم عەبدوڵڵا ـ ١٩٥١ ـ ١٩٧٩)بوو. لەدوورەوە دەتبینی هەر لەرۆژنامەوانێکی فەڕەنسی، یان ئەڵەمانی دەچوو. چاوشین، مووزەرد، سووروسپی و باریک و گورج و گۆڵ. هەر زۆر بە پەلە قسەی دەکرد، بە پەلە کارەکانی ئەنجام دەداو لە رۆیشتن و هاتوچۆدا، کەس بە تۆزی پێی ئەو نەدەگەیشت.

جاریَ یەکەم لە (تاتیدۆ) دەرکەوت، هەگبەیەک نامەی رێکخستن و هەرێم و کەرت و مەفرەزە و پێشمەرگەکانی بۆ هێناین. ئێمەش کۆمەڵێک نامە و دەنگوباس و بڵاوکراوەمان بەودا ناردەوە. دوو هەفتەی پێنەچوو لە (دەراوی گورگان) ئێمەی سەرلەنویَ دۆزییەوە. رۆژی ١٩٧٨/٩/١ لە (وارمیوان) وێنەیەکمان پێکەوە گرت. دەیگوت: بە سیَ رۆژ دەگەمە بەری قەرەداخ و بەسەر شارەزوور و پێنجوێن و ئالاندا دەگەڕێمەوە. ئەو شارەزای بەرد بە بەردی رێگاکان بوو، ماڵ بە ماڵی دێهاتەکانیشی دەناسی.

لە وارمیوان دەبوایە بڵاوکراوەیەکی زۆر لەگەڵ خۆیدا بەرێت و نەیدەتوانی بە شان، بەو رێگایانەدا تێراچێتەوە! ئازادی سەگرمە ئامۆژگاریی کرد داوای هێستریک بکات. هێستر پەیداکرا، تێڕ و کورتان دەستنەدەکەوتن.

حاجی پرسیاری لەزۆربەی دەستەکان کردبوو، کورتانی پیَ پەیدا نەکرابوو. بەرە بەرە، لەناخەوە دەکولاو سوور سوور

ببوو. دەیگوت: ((هەموو کورتانیان هەیەو نامدەنێ!)). ناچار لەچادرەکە هاتینە دەرەوە و چاومان دەگێڕا. لای چادرەکەی حاجی کاک ئەحمەد، کورتانێک کەوتبوو. هاوڕێ جەبار گوتی: ((ئەوە کورتانێکە!)). حاجی چاوشین گوتی: ((ئەوە گورتانی حاجی نەرگسە!)). لەپەنای گابەردێکدا کورتانێک دانرابوو، مامۆستا سەلام گوتی: ((ئەوە کورتانێکیترە لە پەنای ئەو بەردەدا! )). حاجی چاوشین گوتی: ((ئەوە کورتانی دکتۆر مەحمودە!)).

ئەو رۆژە هەموو سەرکردایەتی و کادرەکان سەرقاڵی پەیداکردنی کورتانێک بوون و تا پەیداکرا قیر گوتی: ((چەق!)).

# بێجان جوندی
## (٣٢)

ڕۆژێک بێجان جوندی*، بە شاڵ و شەپکەوە لە وارمیوان بەسەردان هات. ئەو یەکێک بوو لە پێشمەرگەکانی بارزانی و بەشداریی لەپارێزگاری کۆماری کوردستان (مەهاباد) کردبوو. کاتێک بارزانی بڕیار دەدات بۆ یەکێتی سۆڤیەت بڕوات، ئەویش وێڕای ئەو هێزە ڕوودەکاتە ڕوسیا.

ئەم پیاوە، پیاوێکی خاوەن ئەزموون بوو و داستانی سەیر سەیری بۆ دەگێڕاینەوە. ئەو گوتی: ((پاش فێربوونی زمانی رووسی، بە زۆرەملێ خولێکی ڕاهێنان و فێربوونی بنەماکانی فەلسەفەی مارکسی ـ لینینیان بۆ کردینەوە. هەندێ جار وا ڕێکدەکەوت، مامۆستا ڕوسەکە پرسیارێکی ئاراستەی سەرۆک بارزانی دەکرد، بۆ نمونە: ((دیالیکتیک چییە؟)). بارزانی بە حەسۆ میرخانی دەگوت: ((حەسۆ بەرسیڤی پرسیارەکە بدەرەوە!)). پاش چەند وانەیەکی تر مامۆستاکە پرسیارێکی تری ئاراستەی سەرۆک بارزانی دەکرد: ((جیاوازی لەنێوان فەلسەفەی مادی و ئایدیالیزم چییە؟ بەکورتی باسی جیاوازییەکانی بکە...)). بارزانی بە ئەسعەد خۆشەوی دەگوت: ((ئەسعەد هەستە وەڵامی پرسیارەکە بدەرەوە..)). مامۆستاکە بەلایەوە سەیر دەبێت، بارزانی نایەوێت وەڵامی پرسیارەکان بداتەوە. مامۆستا ڕوودەکاتە بارزانی و دەڵێت: ((من پرسیارەکەم ئاراستەی بەڕێزتان کرد، کەچی ئێوە وەڵامی پرسیارەکەتان نەدایەوە. ئایا

* بێجان شکاک (١٩٢٦ ـ ١٩٧٩)..

زمانی روسی نازانیت، یان پرسیارەکەم روون نییە، یان کێشەیەک هەیە؟)).

بارزانی دەڵێت: ((پرسیارەکەت تێگەیشتم و هەرچیت لەپۆلدا باس کردووە، زۆر بە باشی دەتوانم وەلامت بدەمەوە. من بڕوام بە وانەو دەرسەکان نییە و من بەشێوەیەکی تر بیردەکەمەوە و وەکو ئێوەش بیرناکەمەوە.. ئێوە چۆن بیردەکەنەوە و چی دەڵێن و باسی چی دەکەن ئارەزووی خۆتانە، من نامەوێ وەکو ئێوە بیربکەمەوە، چونکە بڕوام پێی نییە!)).

## ڕێبوار چاوشین
## (٣٣)

ڕێبوار کوڕێکی چاوشین، مووزەرد، قۆز، خەڵکی چەمچەماڵ بوو، هەر لەئەکتەری هۆلیۆد و ئەستێرەی فیلمی کاوبۆی دەچوو. لە هەکاری گوللەیەک بەر سینگی کەوتبوو. خرابووە چاڵێکەوە و خۆڵکرابووە سەر پێی و ئەژنۆی جوڵەیەکی کردبوو. جوتیارێک گوتبووی ئەم کوڕە ماوە و پێویستە ڕەوانەی نەخۆشخانەی بکەین. ماوەیەک لەنەخۆشخانە دەمێنێتەوە تا چاک دەبێتەوە. لەوارمیوان گەیشتە لامان و ماوەیەک لامان مایەوە. ئەویش لەگەڵ حاجی چاوشین بۆ قەرەداخ گەڕایەوە.

ڕێبوار ماوەیەک لەقەرەداخ پێشمەرگایەتی کرد. پاشان بڕیاری دابوو لەگوندێک دابنیشێت و کچێک ڕەدووی کەوتبوو. لەناوچەی سێوسێنایەتی و دەیان شوێنی تری کوردستان ڕووداوێکی وا ڕوویدات، لەماڵە کوێخایەک کێشەکە چارەسەر دەکرێت و هیچیش روونادات. پێشمەرگەکانی ((شۆڕش))ی کوردستان ڕێبواریان دەستگیر کرد و بەدەستی خۆیان هاوڕێیەکی دڵسۆزی خۆیان کوشت.

کورتە چیرۆکی (هەلاتن) کە دەیان جار بڵاوکراوەتەوە، پەیوەندی بەم ڕووداوە دڵ تەزێنەوە هەیەو بەزمانی ئەڵەمانیش بڵاوکراوەتەوەو لەلایەن ڕەخنەگرێکی ئەڵەمانەوە بە چیرۆکیکی سەرکەوتووی ئەدەبی جیهانی دانراوە..

**لەپاژێکی تری ئەم بیرەوەرییە، ئاماژەم بە چیرۆکی (هەلاتن) کردووەو سوود لەڕووداوەکانی (بەرکەل) وەرگیراوەو دیمەنەکان تێکەلاوکراون.**

# جەلالی و نەوەیی
# (٣٤)

لەم قۆناخـەدا، یەکێتی هـەر بەناو: مەکتـەبی سیاسـی هـەبوو، بـەڵام بـەکردەیی نـە کۆبوونـەوەی بـەردەوام و نـە پەیوەنـدی هەبوو. ئارام شـەهید کرا، عـەلی عەسـکەری چارەنووسـی نادیار بـوو، رەسـوڵ مامەنـد سـەنگەری ململانـێ و بەربـەرەکانێی هـەڵبژاردبوو، سـالار عـەزیز لـە ئۆروپـا بـوو.. تـاد. لـەو رۆژە بەدواوە مام جەلال هەموو هیواکانی لەسەر نەوشیروان هـەڵچنی بوو. عەلی عەسکەری لەوێ بوایە، ئەو فەرماندەی گشتی هێزی پێشـمەرگەی کوردسـتان بـوو. کەسـایەتییەکی ئـەوتۆی هـەبوو، هێزی پێشـمەرگەی کوردسـتان تـەنیا بـە فـەرمانی ئـەو جوڵـەی دەکرد. هەر خۆیشی دەمڕاست و برا گـەورەی بسـک بـوو. ئارام لەژیاندابوایە، ئەو دەمڕاستی کۆمەڵە بوو، بە بێ قەڵەم و ئیمـزا و بڕیـاری ئـارام، کـەس نەیـدەتـوانی لـووت بژەنێتـە کاروبـاری کۆمەڵەوە.

زۆرجار لەکاتی نان و چا خواردن و کۆڕبەستنی کادرەکانی کۆمەڵە، بەدەوری ئاگردان و کتریی رەش، مام جـەلال دەهـات و بـەدەنگێکی زوڵال دەیگـوت: ((هـەموو خـەڵک دەڵـێن کاکـە نـەوە جەلالییە، من دەڵێم: نەخێر! نەخێر! مام جەلال نەوەییە!)). هـەرچی کاروبـاری پێشـمەرگە و کۆمەڵـە و بزوتنـەوە بهاتایەتـە پێشـەوە. لەنێوان هەردووکیاندا دابەشکرابوو. مـام جـەلال لـەو هـەورازەوە دەیڕوانییـە پاژێـک لـە لوتکـەکانی ((قەنـدیل)) و هەسـتی دەکـرد، ئیدی لووتکەی زۆر بەرز بەدی ناکرێت.

## (١)

دۆڵەلێنیٚ کوێستانی تیرەی چنارەیی هۆزی مەنگوڕە. هەواری گوندی (سپێرۆ) و (سێدەلان) ەو بەهارو هاوینان رووودەکەنە ئەویٚ. ئەم شوێنە لە وارمیوانەوە، بۆ خەڵکی ناوچەکە، بە پێیان سەعاتێک دەبێت. بەشەو بۆ خەڵکی نە شارەزا هەر نابڕێتەوە. لێنیٚ مانای لێژایی و دۆڵێکی بچووک دەگرێتەوە.. دوو کانیاوی لێبوو، کانیاوەکان لەچاو کانییەکەی وارمیوان گەورە نەبوون.

دوو سیٚ رۆژ پێش کۆتایی هاوینی ١٩٧٨ ئێمە لێرە گیرساینەوە. ناوچەکە لە چاو (بێدەلان) و (دۆڵەکۆگیٚ) رووتەن بوو. گوێنی و تیرویٚ و ئاژنە بەلا پاڵەکانەوە دەڕوان. گوێنی دارێکی دڕکاویە، خزمی سنوبەرە. لەشاخە بەرزەکاندا بچووکە و لەدۆڵە کپەکان گەورەترە. گوێنی رەش و گوێنی سپی هەیە، گوێنی رەش چەقێکی لێدەردەچێت و کەتیرەی لێبەرهەمدەهێنرێت.

تیرویٚ: دەوەنێکە لەکفر (کیفر) دەچێت، تیرویٚ لەکوێستانان دەڕوێت و کفر لەگەرمیان. ئەم دوو دارە زۆر بەرز نابن بۆیە قەدیمان فەرموویانە: کاریتە لەکفر هەڵناکەویٚ.

ئاژنە: دەوەنە و لە بەلالووک دەچێت. سەری شاخی بەمۆ پێیدەگوترێت: ئاژەنان، لەبەرئەوەی (ئاژەن)ی لێدەڕوێت.

دۆڵەلێنیٚ، دۆڵێکی کراوەی بچووک و رووتەنە، بواری خۆ حەشاردان و خۆبزرکردن، لەچاوی هەلیکۆپتەرەکانی رژێم هەر زۆر کەم بوو. سەرکردایەتی تا ئەو چرکەیە، چەکێکی ئەوتۆی بەدەستەوە نەبوو، دژی هەلیکۆپتەر بەرگری لەخۆی پێبکات: زۆربەی پێشمەرگەکان بە کلاشینکۆف، بڕنەو دەمانچە

چەکداربوون. یەک رەشاشم لای دەستەکەی مام جەلال بەدی کرد و هیچی تر. ژمارەیەک چادری سپی و بۆر سەرنجی هەلیکۆپتەری رادەکێشا.

بەیانییانێک دوو هەلیکۆپتەری سوپای رژێمی عیراق، راستەوخۆ بەرەو لای ئێمە هاتن. لەماوەی چەند چرکەیەکدا، هاوار هاوارێکی زۆر کرا (هەلیکۆپتەر هات.. هەلیکۆپتەر هات) پێشمەرگەکان بڵاوەیان کردو چوونە سەنگەرەوە. من لە شوێنی خۆپاراستن دەگەڕام، مام جەلال بانگی کردم:

((مامۆستا جەعفەر وەرە بۆ ئێرە، ئەم شوێنە قایم و نەدیوە..)).

چەقەڵە شاخەکە وەکو رەفە و تاق بوو. ئەو لەبەشی سەرەوە، لەسەر گازی پشت لێیڕاکشابوو. ئەو ئاماژەی بۆ تاقیکی درێژکۆلەی نزیکی خۆی دەکرد. من لەمام جەلال نزیک کەوتمەوە و گوتم:

((ئەم شوێنە بۆ خۆ حەشاردان نەگونجاوە: ساروخ یان گوللە بەر بەردو شاخ و رەوەز بکەوێت، دەیان پارچەی لێدەبێتەوە. شوێنەکەت بۆ ناو ئەو چاڵە بگۆڕیت چاکترە..)).

هەلیکۆپتەرەکان زۆر نزیک کەوتنەوە. بەڵام هیچ تەقەیان لێنەکردین بەرەو دواوە گەڕانەوە. مام جەلال گوتی: ((دەبێ زۆر ئاگامان لەخۆمان بێت. ئەمانە بۆ زانیاری کۆکردنەوەو وێنەگرتن هاتبوون. دەبێ بەزووترین کات بۆ شوێنێکی تر بڕۆین..)).

ئەم چەقەڵە شاخە لە شوێنەکانیتر بەرزترە و ناوی قوڵکانە. لەم ناوچەیە گیایەک دەڕوێت پێیدەوترێت: (تیسوێ) و هەواری (تیسوێلان) لە (تیسوێ)وە هاتووە. ناوی هەواری (بۆ تیسوێ)یش هەر لەگیای (تیسوێ)وە وەرگیراوە.

# کورد و بەغدا
## (٢)

بە درێژایی رۆژانی سەختی قەندیل، مام جەلال هەمیشە بیری لای پایتەخت بوو. هەر دەنگ و باس و هەواڵێک لە ئێستگەی رادیۆی بەغداوە بڵاوبکرایەتەوە وەکو:
(هەڕەشەی رژێم لە ئیسرائیل) و ((پڕۆژەی نزیکبوونەوەی هەردوو رژێمی بەغداو شام))، کە دیارە راگەیاندنی رژێم مەبەستی خۆی هەبوو، هەر بۆ دروشمبازی و چەواشەکاری بوو، مام جەلال هەر یەکسەر کۆبوونەوەیەکی رێکدەخست و بەیانێکی بڵاودەکردەوەو نامەی بەهەر چوار لادا بڵاودەکردەوە، کە ناوەڕۆکی هەموویان ئەم رستەیە بوو:
((ئەگەر سوپای عیراق بیەوێت پەلاماری ئیسرائیل بدات و خاکی فەلەستین رزگار بکات، ئێمە ئامادەین، بەبێ سێ و دوو، بێ پێشمەرج، یەک لایەنە شەڕ و چالاکی پێشمەرگانە رابگرین، تا ئەوکاتەی عیراق ئەرکە نەتەوایەتییەکانی خۆی جێبەجێدەکات!)).

ئەم هەموو بانگەوازو نامەنووسین و دەنگوباسی (مفە)یە، رژێم هیچ کاردانەوەیەکی ئەوتۆی نەبوو. سەدام لە مانگی تەمووزی ١٩٧٨ بەگاڵتەوە باسی چالاکیی هێزی پێشمەرگەی کرد: ئەو تەق و تۆقەی لە باکوور روودەدەن و سەربازێکی بێ ئاگا دەکوژرێت، یان پۆلیسێک، کە لە ئیجازە دەگەڕێتەوە، لە پەناوە بەر گوللە دەکەوێت، ئەو فیشەکانەی لەو رووداوانەدا

دەتـەقێنرێن، ئەوەنـدەی ئـەوە نییـە، کـە جـاران لـە شـایی و زەماوەندێکی لای ئێمە، هەر بۆ خۆشی دەتەقێنرا!!

ئەگـەر لـەناو کۆبوونـەوەدا پرسـیارێک دەربـارەی ئـەو دانوستاندن و ئەگەری رێکەوتن لەگەڵ رژێمی بەغدادا ئاراستەی مـام جـەلال بکرایـە، ئـەو دەیگـوت: ((ئێمـە نـابێ خۆمـان هەڵبخەڵەتێنین، رژێمی سـەدام، رژێمێکی فاشیە و هیچ بە کـورد نـادات و دەیـەوێت کـورد لـەناو ببـات. مـن سـەرانی رژێـم زۆر بەباشی دەناسم و ئەمانە سیاسـەتێکی رونیان هەیە و هـەرچیان لەدەسـت بێـت بـۆ نەهێشـتنی کـورد دەیکـەن. بـەڵام ئێمـە نـابێ (رەفزی مفاوەزات) بکەین.

ئەگـەر هـەر خۆمـان بوینایـە: (نەوشـیروان، ئازادی سـەگرمە، شێخ شەماڵی باخ، بەنـدە...) دەیگوت: مفـاوەزات هـەر زۆر باشـە، خـوا ئـەکات رێکـەوتنێکی (شـەرەفمەندانە)مان لەگەڵـدا دەکـەن و شـارەکانی کوردسـتان دەسـت خۆمـان دەکەونـەوەو لـە دێهاتـەکانمـان راگواسـتن و تـەعریب نامێنێت، ئەمـە گـەورەترین سەرکەوتنە.. ئێمە مەترسی نەمانمان لەسەرەو لەم جیهانە پان و بەرینـەدا دۆسـتێکی راسـتەقینەمان نییـە پشـتیوانیمان لێبکـات و بمانپارێزێت. بۆیـە دەبـێ بەهەڵـەدا نـەچین و سیاسـەتێکی راسـت پـەیڕەوی بکـەین. زۆر هێـزی سیاسـیی گـەورە، چـەک و پـارەی زۆریـان هـەبوو، بـەڵام هێڵـی سیاسـییان راسـت دۆڕانـدیان و هەرچییان هەبوو کەچی، لەدەستیان چوو. ئێمـە هێڵێکی سیاسـی راست و دروستمان هەیە بۆیە هەر سەردەکەوین..

من گوتم: ((پەیوەندی نێوان بەغداو کوردستان، پەیوەندیـەکی دینامیکیە، هەردوو جەمسەرەکە کار دەکەنە سـەر یـەکتر. رژێمـی بەغدا، رژێمێکی دیموکراسی بێت، ئەوە لەکوردستانیش کـەش و

هەوایـەکی دیموکراسـی دێتـە کایـەوە و بـە ئاسـانی دان بـە مافەکانی گەلی کوردا دەنرێت. بە پێچەوانەوە، ئەگەر لە بەغدا رژێمێکی دیکتاتۆری فاشی، بە کودەتا دەسەڵاتی خۆی سەپاند، ئـەو رژێمـە ناتوانێـت لـە کوردستاندا دیمـوکراتی بێـت و مافـە رەواکانی گەلی کورد بسەلمێنێت.

دەمەوێت بڵێم: دروشمی: دیموکراسی بۆ عیراق و ئۆتۆنـۆمی بـۆ کوردسـتان هێشـتا دروشـمێکی مەعقوولـە و دەتـوانین لـەم قۆناخەشدا بەکاریبهێنین..)).

مـام جـەلال گـوتی: ((کاکە نـەوە بڕوای بـەم دروشمە نییـە و دەڵێـت: ئێمـە هـەقمان بەسـەر بەغـداوە چییـە؟ لـەوێ دیکتـاتۆر هـەبێت، کۆنەپەرست حـوکم بکـات، ئـەوە کێشـەی ئێمـە نییـە، بـا رژێمـی بەغـدا ئۆتۆنـۆمی راسـتەقینەمان بـداتێ، لـە بەغـدا چـی روودەدات با روودبدات..)). مـام جـەلال بە پێکەنینەوە قسـەکانی نەوشـیروانی دەگێڕایـەوە. نەوشـیروان لەوسـەری چادرەکـە دانیشـتبوو. گـوێی لـە نـاوی خـۆی بـوو. مژێکـی قـووڵی لـە جگەرەکەی دا..

مام جەلال گوتی: ((کاکە نەوە بڕوات بە دروشمی دیموکراتی بۆ عیراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان هەیە؟)).

نەوشـیروان: ((خـوا ئـەکا حکومـەتی عیـراق ئۆتۆنۆمیمـان دەداتێ، ئیتر خوای ئەکرد قورقوشمی بە گەرووی خواروووی عیراقدا ئەکرد. با ئـەوانیش بۆ خۆیـان خـەبات بکـەن. من بڕۆم مـافی خـۆم لـە بەغـدا وەربگـرم و ئـەویش ئامادەبێـت بمـداتێ. لەسـەر دیموکراسـی بـۆ عیـراق لەگـەڵ حکوومـەتی بەغـدا کێشـە بنێمەوە، ئەمە کەی کاری ئێمەیە؟)).

لە قاقای پێکەنینیدا و گوتی: ((من بەهیچ شێوەیەک بڕوام بە دروشمی: دیموکراسی بۆ عێراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان نییە! ئێمە ئەگەر توانیمان بە شۆڕش و خەباتی چەکداری رژێمی بەغدا ناچار بکەین مافە رەواکانی گەلی کوردستان وەدەستبهێنین و رژێمی بەغدامان پێنەگۆڕدرا. خەڵکی ناوەڕاست و خوارووی عێراقیش هیچ جوڵانەوەو کردارێکیان نەبوو، لەرژێمی بەغدا رازی بوون، ئێمە بە حکومەتی بەغدا بڵێین: ئەم مافەمان ناوێت و دەبێ لە بەغدا رژێمێکی دیموکرایی بێتەدی؟ من دروشمی: دیکتاتۆری بۆ عێراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان، بەراستتر دادەنێم. ئێمە بەرامبەر گەلەکەی خۆمان بەرپرسیارین و هەرچی لە بەغدا و ناوەڕاستی عێراق روو دەدەن کاری ئێمە نییە و بەرپرسیارێتی دەکەوێتە ئەستۆی هێزە سیاسییە عەرەبەکان..)).

# ئەبو زەفار (ئیسماعیل زایر)

## (٣)

ناوەڕاستی ئەیلوول لەدۆڵەلێنێ بووین، دەستەیەک پێشمەرگەی گەرمیان و قەرەداخ (هیوا بارۆیی، خالید گەرمیانی،...) هاتن و پێشمەرگەیەکیان لەگەڵدابوو من نەمناسی! خالید گەرمیانی پێیگوت: ((هذا أستاذ جعفر..)).*

لەگەڵ خالید گەرمیانیدا سوعبەتمان زۆربوو، سەرەتا پێیموابوو، دەیەوێت کوردێکم لێ بەعەرەب بکات. ئەویش بەعەرەبی گوتی: ((انی ابو ظفار طلعت من کرکوک و صارلي مدة بقرداغ و گرمیان..)).**

منیش هەر بە عەرەبی وڵاممدایەوە:

((حضرتک من المعارضة العراقية أو إنسان وطني مستقل..)).

ئەو هەر یەکسەر پێیگوتم:

((من کچەکەم ناوی زەفارە و بەناوی شۆڕشی زەفارەوە ناوم ناوە زەفار.. ناوە راستەقینەکەم (اسماعیل زایر)ە و من نووسەرم..)).

من گوتم: ((تۆچیی ئیبراهیم زایریت؟)).

ئەبو زەفار چاوی پەڕیە پشتی سەری و دیارە ئەو بەهیچ شێوەیەک چاوەڕوان نەبووە کەسێک لەم شاخ و کێوەدا ناوی

---

* ئەمە مامۆستا جەعفەرە

** من ناوم (ئەبو زەفار)ە، لەکەرکوکەوە دەرچووم و ماوەیەک لەقەرەداغ و گەرمیان بووم!

ئیبراهیم زایری بیستبێت، گوتی: ((ئیبراهیم زایر برامە. تۆ چۆن ئەو دەناسیت؟)).

گوتم: ((نووسەرێکی خاوەن هەڵوێست بوو، بەداخەوە لەلوبنان خۆی کوشت!)).

ئەو گوتی: ((لەگەڵ رێکخراوە فەلەستینیەکاندا کاری دەکرد و تووشی نائومێدی هات!)).

ئەبو زەفار هەر زوو ئەو رازەی لا درکاندم، کە ئەو یەکێکە لە ترۆتسکیەکان و لەسوپای عیراق نایب زابت بووەو لەبەشی هەلیکۆپتەر کاری کردووە. ئەو دژی بیروباوەڕی (لینین) و (ماوزەتۆن) بوو. دکتۆر حسێنی لەمەڕ خۆشمان ((ماوی)).یەکی سەرسەخت بوو.

زۆربەی شەوان، ئەم دووانە وەکو کەو بەرامبەر یەکیان دەگرت ((مشت و مڕ)) و ((چاکلی پیکان)) و ((چەقبەرۆکێ)). دەستی پێدەکرد.

دکتۆر حسێن بەفارسی دەیگوت: ((ترۆتسکی نەیتوانی لەریزەکانی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بمێنێتەوە. لەنێوان (بۆلشەویک) و (مەنشەویک) تەراتێنی دەکرد. ئەو بەنووسین و قسەکردن و خوتبەدان سەرکردەیەکی کەموێنەبوو، بە کردەوە نەخوێندەوارێکی وەکو ستالین دەریپەڕاند..)).

ئەبو زەفار بەعەرەبی دەیگوت: ((ستالین پیاوێکی دیکتاتۆرو خوێنڕێژ بوو، هەر دوای لینین، بە کوشتن و بڕین و خوێنڕشتن دەستی بەسەر پارتی کۆمۆنیست و دەوڵەتی سۆڤیەتدا گرت. ترۆتسکی لەسەرانسەری جیهاندا بەرەیەکی دژی ئەو راگەیاند. ماوزەتۆن دەستی لەناو دەستی ستالین ناو چارەنووسی گەلان و شۆڕشی پرۆلیتاریای بیری خۆی بردەوە..)).

ئەركی وەرگێڕان، دەستۆی من خرابوو. گفتوگۆی هەردوولا، هێندە درێژەی دەكێشا تا دانیشتوانی ناو چادرەكە بۆڑوو دەبوون و داوایان دەكرد ((دیالۆگ))ی نێوان ((بەیژین)) و ((ئینتەرناسیۆنالی چوارەم)) كۆتایی پێبێت. ئیدی ناچار دەبووم بەشێوەی وەرگێڕان، ئاوازی گفتوگۆ، دوو سێ چین بەرزتر بكەمەوە، ئیدی هیچی نەدەما بۆ هەڵبەزینەوەو خۆگیڤكردنەوە پەرە بسێنێت.. لەئەنجامدا دەمانگوت:

((ئەم پێشمەرگانە ماندوون و با گفتوگۆكە سبەی درێژەی پێبدرێت..)).

ئەبو زەفار لەڕووی سەربازییەوە شارەزابوو. ئێمە نەماندەزانی چۆن شەڕی هەلیكۆپتەر بكەین. ئەو دەیگوت: ((كلكی كۆپتەرەكە بكەنە نیشانە، پێكاتان، بەردەبێتەوە. پاژەكانی تری گوللەنەبڕە..)).

ئەو دەیگوت: ((پێویستە زۆربەی پ.م كلاشینكۆفی پێبێت، نەك برنەو...)). سەرەتای شۆرش ژمارەی كلاشینكۆف لەشانەكان زۆر نەبوو. ئەو درێژەی بە قسەكانی خۆی دەدا: ((لەزۆربەی شەڕەكاندا هێزی ئاگر یەكلاكەرەوەیە: بەرەیەك دەتوانێت چەند ئاگر، بە سەنگەری بەرەكەی ترەوە بنێت! كلاشینكۆف لەیەك چركەدا سی فیشەك دەتەقێنێت. برنەو: پێنج فیشەك دەخوات! هەموو جارێك دەبێ میل بهێنیتەوە. سەرلەنوێ جاسوس بگریتەوە، دایگریتەوە..)).

لە(دۆڵە كۆگێ) ماوەی چەند رۆژێك بوو گیرسابووینەوە، هێشتا دونیا تاریك دانەهاتبوو. هەرسێكمان لەناو چادرەكەی ناوەندی كۆمەڵە دانیشتبووین (ئەبو زەفار، م. سەیوانی عەلی رەزای هاواری و بەندە). سەیوان و ئەبو زەفار زۆر حەزیان لە

سوعبەت بوو، بەرامبەر یەکتری دانیشتبوون، سەیوان گوتی: ((بڕنەو چەکی شاخ و کێوە و یەک بڕنەو هەزار کلاشینکۆف دەهێنێت..)).

ئەبو زەفار ولامیدایەوە: ((بۆ هەلمەت و پاشەکشە کلاشینکۆف زۆر پێویستە و بڕنەو باوی نەماوە..)).

سەیوان بڕنەوەکەی بەرزکردەوە، بە حیساب سوعبەت دەکات، ئەبو زەفاریش دەستی بۆ کلاشینکۆفێک برد و گوتی: ((بڕنەو بەرامبەر کلاشینکۆف هیچ نییە..)).

گرمە و نالەیک هات! سەرەتا سەیوان هێدمە گرتی! ئینجا بە ئەوپەڕی پەشۆکاییەوە گوتی: سەیوان ((کوشتم! کوشتم! نەمزانی فیشەکم رانیوە..)).

ئاوڕم لە ئەبو زەفار دایەوە، کەللەسەری نەمابوو. (سەری کێوەچوو؟) جامانەکەی بەخڕی کەوتبووە سەر شانی. بە پەلە جامانەکەم لادا، سەریم دۆزیەوە. سەرم بەرزکردەوە: ئەبو زەفار! ئەبو زەفار ماوی! بەر کوێت کەوت؟

بەهەزار حاڵ نوزەی تیامابوو((نازانم!)).

هەر زوو کراسەکەم لەبەر داماڵی. پەڵەیەک خوێن. گوللەکە بەرزایی شانی چەپی سمیبوو، ئەم دیوو ئەودیوی کردبوو.

مژدەم پێبەخشی: ((دڵت هیچ نەکات، سەلامەتی، شوێنی مەترسیداری نەگرتووە. هەر ئێستا ئاگاداری د. عەزیز (د. جەعفەری شەفیعی) دەکەمەوە.))

سەیوان تۆزێک هاتەوە هۆش خۆی و گوتی: ((تۆ جاری فریای مام جلال بکەوە. بزانێت دونیا ژێروژوور دەکات.. ئێمە سوعبەتمان کردو بە ئەنقەست نەبووەو شوکر سەلامەتە..)).

لەچادرەکـە هاتمـە دەرەوە. بـە مامۆسـتا سـەیفەدین هـاواریم گوت: ((فریا بکەوەو دکتۆر عەزیزم بۆ پەیدابکە.. خێرا.. خێرا..)).

سـەرم بـەرزکردەوە، مـام جـەلال و دکتـۆر مـەحمود عوسـمان لەوبەر چەمەکەوە بەتەکان بـەرەو لای ئێمـە دەهـاتن. مـام جـەلال بەدەنگی بـەرز گـوتی: ((مامۆسـتا جەعفـەر ئـەو تەقەیـە چـی بـوو. چی روویداوە؟)).

بەسەر بەردەبازەکەدا بۆ ئەوبەر چەمەکە پەڕیمەوە گوتم: ((دڵتان هیچ نەکات، هیچ نییە و هەموو سەلامەتن..)).

هــەنگاوەکان خاوبوونــەوەو مــام جــەلال هــەردوو دەســتی لەسـەر گۆچانەکـەی دانـاو خـۆی دکتـۆر مـەحموود چـاوەڕوان بوون تا من گەیشتمە لایان:

مام جەلال: ((ئەو تەقەیە چی بوو؟)).

من گوتم: ((ئەبو زەفارو مامۆستا سەیوان سوعبەتیان لەگەڵ یـەکتردا دەکـرد سـەیوان بـەبێ ئـەوەی بـەخۆی بزانێت فیشـەکی رانییـوو! گوللـە لەدەسـتی دەرچـوو، بـەر شـانی ئـەبو زەفـار کەوت..)).

دکتۆر مەحمود پرسی: ((لەبەشی خوارەوەی داوە، یان بەشـی سەرەوە؟)).

مـن گـوتم: ((بەشـی سـەرەوەو ئەمـدیوو ئـەودیوی کـردووە.. ئیسکی نەشکاندووە.. ئاگای لەخۆیەتی..)).

د. مەحموود: ((کەواتە مەترسیدار نییە! سەلامەتە..)).

ژمارەیـــەک پ. م دابـــارین و دکتـــۆر عـــەزیز و چەنـــد پێشمەرگەیەک بەتیمارکردن و دەرزیلەدانەوە سەرقاڵ بوون..

مام جەلال گوتی: ((جارێکیان کاک سمایل (ئیرەج کەشکولی) رێژنەیەک لەدەست پێشمەرگەیەک دەرچوو، چەند فیشەکێک بـەر

کاک ئیسماعیل کەوت، لەبن چەناگەوە خوێن فیچقەی دەکرد و لە تەپڵی سەریشیەوە خوێن پژابوو. یەک گوللەش لەسەر دڵی دابوو. کاک سمایل لەسەر گازی پشت راکشابوو، هەناسەی لەبەربڕابوو، تۆزێک((کاک سمایل! کاک سمایل)) مان کرد. ئەو یەکسەر راستبووەوە و دەستی کرد بە هوتاف کێشان:

- زندەباد انقلاب جهانی
- زندەباد رهبر بزرگ ماو
- ای کارگران جهان متحد شوید

پاشان دەرکەوت: گوللەیەک بن ملی چیخ کردووە، گوللەیەکیش تەپڵی سەری چیخ کردووە. کتێبی (چەپکێک لەوتەکانی سەرۆک ماو) لەبەر باخەڵی دەبێت، گوللەکەی سەر دڵی، رێک لەو کتێبە دەدات و نایبڕێت..)). سەرۆک ماو لەمردن رزگاری کرد، هوتاف کێشانەکەی رەوابوو.

# عەلی حەسەن ئاغای مەنگوڕ
# (٤)

عــەلی حەســەن ئاغــای بــایز پاشــای مــەنگوڕ، لــەتیرەی (کادەرویشــی) لـە گونـدی (شــەرویت) دادەنیشــت، کـە سـەر بـە ناحیەی قەڵادزەیە. سـەرەتای شـۆڕش ئەویش وەکو بەشێک لـە کوێخــا و ئاغاکــانی مــەنگوڕ، هاتــە ریــزی شۆڕشــەوە. پــاش ماوەیـەک بـۆ سـێبەری رژێـم گەڕایـەوە. مینێـک بـە کۆمـەڵێک سـەرباز نزیکـی (گونـدی بارەپانـە) دەتەقێتـەوە. تاوانەکـە رێـک دەخرێتە ئەستۆی (عەلی ئاغا)و دەیگرن و پاش دادگاییکردنێکی رووکەش، ئیعدام دەکرێت.

نوکتە و بەسەرهات و قسـە خۆشـەکانی عـەلی حەسـەن ئاغا، تـا ئـەمرۆش کـۆڕو مـەجلیس و دیوەخـانی پێگـەرم دەکرێتـەوە. راستە ئەم پیاوە نەخوێندەواربوو، بەڵام مرۆڤێکی زیرەک و ئـازا و زمانپاراو و قسەزان بوو، لەهەر کۆڕێک دانیشتبێت، قسـەکانی سەرنجی هەموو کەسێکی راکێشاوە.

مەخابن ئەم پیاوە ئەگەر لەوڵاتێکی ئەوروپی بوایـە، دوو سێ رۆژ جارێک لە بەرنامەیەکی تەلـەفزیۆنیدا دەیانهێنایە قسـەکردن. ئێمــە بــەهۆی نزمیــی ئاســتی رۆشــنبیری و کولتــووری سیاسیمانەوە، نـەمانوێراوە قسـەکانی وەکو خۆی بنووسینەوەو چاپیان بکەین.

رۆژێکیـان سـەردانی لێپرسـراوێکی شـۆڕش دەکات و ئـەویش لەجێگەی خۆی بە ئاستەم دەبزوێت و بەهەزار حاڵ بـەخێرهاتنی دەکات. ئەم کردەوەیە لەبەردڵی زۆر خەڵک گرانە. لەکوردەواریدا

کەسێک بەمیوانی بۆ لای کەسێک بچێت خانەخوێ لەبەری هەڵدەسێت و بەپیری میوانەوە دەچێت، پاشان تا بەر دەرگا رەوانەی دەکات. کەسێک سەردانی کەسێک بکات و ئەم ساردیە ببینێت، رەنگە بڵێت((کابرا بێ لوتف بوو)). یان ((رێزی لێنەگرتم)) یان ((کابرایەکی بێ ئوسوڵە)).... تاد.

عەلی ئاغا گوتبووی:

((پەکوو.. ئەم کابرایە رۆحی چەند زلە، بۆ لای دەچیت، هێندە قونان بڵند ناکات کیری وەبەرنێیت!)).

ئەو هاوچەرخی شێخ رەزای تاڵەبانی بوایەو دووسێ جار سەردانی مەجلیسی یەکتریان بکردایە، شێخ دەیگوت: ((عەلی حەسەن ئاغا وەکو من شاعیر بوایە دیوانی هیجاو ساتیری کوردی چوار ئەوەندەی ئێستا دەوڵەمەندتر دەبوو..)).

# مامۆستا غەفوور ژاژڵەیی
# (٥)

لەدۆڵە لێنێ بووین، مامۆستا غەفوور بۆ یەکەمین جارو دواجار سەردانی کردین. پاش نزیکەی مانگێک لەلایەن خزمێکی خۆیەوە، کە لەبنەوە رژێم ڕەوانەی کردبوو، لە شیرینی خەودا، دەستڕێژێکی لێکردبوو. ئەوکاتە تەمەنی (٣٠) ساڵ بوو. پیاوێکی گورج و گۆڵ، وتووریا، چاوکراوەو قسەزان، کلاشینکۆفی بە شانەوە بوو، دووربین، دەمانچەی چواردەخۆری لەگەڵ تاقمی مەخزەندا دەبەست.

مام جەلال مامۆستا غەفووری پێناساندم و گوتی:

((مامۆستا غەفوور ژاژڵەیی، پیاوێکی ئازا، خوێندەوار، هاوڕێی دێرینمە. لەشۆڕشی پێشوو، سەرلق بوو. ئێستاش کادرێکی سیاسی و عەسکەریی پێشکەوتووە. چاوەڕوان بە ماوەیەکی دی ناوچەی ماوەت و دۆڵی جافەتی دەکاتە قەلای یەکێتی..)).

سێ قۆلی لەچادرەکەی مام جەلال دانیشتبووین: بیرمکەتەوە ئەم جوامێرەم لەناوچەی ئالان بینیوەو لەگەڵ مستەفا چاوەڕەش و ئەحمەد فەتحوڵلا پێکەوە بوون.

ئەو شەوی ١٩٧٨/٦/٢١ لەگەڵ ئەحمەد فەتحوڵلا و خانەی موعینی، لەسەر کانیی (بیشوو)ی خوارووی گوندی دڕی پێکەوە دەبن. ئەحمەد فەتحوڵلا بۆ ناو دێ دەچێت و بەهەڤاڵەکانی

دەڵێت مـن تـۆزێ کـارم هەیـە و هـەر ئێسـتا دێمـەوە. سـەعات دوونیـوی شـەو، ئەحمـەد فـەتحوڵڵا لـەماڵێک دێتـە دەرەوە. هـەر یەکـەم دەسـتڕێژی بەردەکـەوێت. تومـەز ئاگـای لـەخۆی نابێـت بست بە بسـتی سـەربان و بن بان گیراوە. پێشـمەرگەکان دڵیـان نایەت ئەحمەد فەتحوڵڵا جێبهێڵن و هـەر چاوەڕوانی گەڕانـەوەی دەکـەن. بـەیانی زوو دەزانـن لەلایـەن هێزێکـی گـەورەی سـوپای ڕژێمەوە، لەهەر چوار لاوە، گەمارۆ دراون و تەقە دادەمـەزرێت و شەڕێکی زۆر سەخت دەکرێت. لە ئەنجامدا پێنج پ. م شـەهید بـوون و چـواریش بـە برینـداریی زۆر سـەخت بـەدیل دەگیـرێن. مامۆستا غەفوور، بـە سـەختی بریندار دەبێت و لەگەڵ دوو (پ. م)ی خەڵکی ناوچەکە بۆ نـاو چـەم دا دەگـەڕێن و لـەوێ خۆیـان قـایم دەکـەن و پاشـان دەربـاز دەبـن. فەریـدونی حەمـە عاشـق خەڵکی دڕی بوو. ئەویش خۆی دەرباز کردبوو.

مامۆستا غـەفوور یـەکێک بـوو لەوانـەی زۆر بڕوای بـەخۆی هـەبوو. هـەر بۆ نموونـە: ئـەو بڕوای تـەواوی بـەوە هـەبوو، ئـەو دەتـوانێ خراپتـرین مـرۆڤ بـۆ چـاکترین مـرۆڤ بگۆڕێـت. مـن ئێستا نامەیەکی دڵشاد تۆفیق بەنگینـەم لەبەردەسـتدایە کە ڕۆژی ١٩٧٩/٦/٢٧ ئاراستەی ناوەندی کۆمەڵـە کراوە، پاش تێپـەڕبوونی ساڵێک بەسـەر ڕووداوەکانی دۆڵـی جافـەتی بیری دەکەوێتـەوە :

((... ئەوەبـو ئـێمە، هـاوڕێ مەلا عەلـی و خـاڵە شـێخ صـدیق و دڵشاد لەگەڵ مامۆستا غەفوور، کۆبوونەوەیەکمان کرد کە تیایا هـاوڕێ جەمـال عەلـی بـاپیریش بەشـداربوو. لەو کۆبـوونەوەیەدا

دوو بیــروڕای جیــاواز هەبــوو دەربــارەی (ج + ع) یەکێکیــان هاوڕێیانی کۆمەڵەبوو کە نزیکەی یەک بیروڕایان هەبوو، ئەوی تریشیان مامۆستا غەفوور بوو .. هەرچی هاوڕێیانی کۆمەڵە بوون بڕوایان بەوە نەبوو کە ئێمە بتوانین ((اصلاح))ی ئەو جەمـاعەتە بکەیـن بەڵکـو دەبێـت ئەوانە چەک بکـرێن .. بەڵام هەرچی شەهید مامۆستا غەفووریش بوو، بیروڕای وابوو کە خۆی بچێتە ناویانەوەو وەکو کادرێک ((اصلاح))یان بکات .. تا لە دوا ئەنجامدا بەهۆی هاتنی کاک مەلابەختیاریش بۆ ناوچەکەمان بیروڕای هاوڕێیانی کۆمەڵە زاڵبوو ئیدی کەوتینە چەک کردنیان و چەکمان کردن..)).

دیارە ڕژێم زانیاری وردی لەسەر مامۆستا غەفوور هەبووەو زانیــویەتی ئەم ســەرکردەیە دەتوانێـت دەورێکـی سیاســی و عەسکەری گرنگ لەناوچەکەدا بگێڕێت، بۆیە بەزووترین کات پلانی بۆ لەناوبردنی داڕشت و جێبەجێش کرا.

# مێژووی سەرهەڵدانی کۆمەڵە

## (٦)

بەدرێژایی رۆژانی سەختی قەندیل، کات بەسەربردن: چا خواردنەوەو گفتوگۆی دیموکراسیانە بوو، دەربارەی بابەتی سیاسی کۆن و نوێ، کۆڕی عاشقانی نیشتمان و دیوەخانی سیاسەت گەرم دەکرا، دەنووسم: گفتوگۆی دیموکراسی: چونکە سەرکردایەتی و ئەندام و کادران لەسەر یەک بەرەی شەڕ، پێکەوە بە چوار مەشقی دادەنیشتن و دانوستاندن لەسەر رووداوە سیاسیە گەرم و ساردەکان دەکرا و کەسیش بە دڵشکاوی دانیشتنەکانی جێنەدەهێشت.

مام جەلال زۆرجار باسی سەفەرەکەی بۆ مۆسکۆ دەکرد، کە چۆن لەکاتی بینینی مەلا مستەفای بارزانیدا بوراوەتەوە. چاوی کردۆتەوە سەری لەسەر ڕانی بارزانی بووە. ئەمەیە کاریگەری کاریزما!

پێشمەرگە دابڕاوەکان پاش (حەملەی هەکاری)، تاک و تەرا بەجل و بەرگی شڕو قژو ریشی درێژو رووخساری رەش داگەڕاوەوە، بە کۆڵێک ئەزموونی تاڵ و سوێر دەگەڕانەوە. بە وردی چیرۆکی حەملەکەیان دەگێڕایەوە. هەر لە نۆکانەوە تا دۆڵە گۆستێ.

چەند بارە گێڕانەوەی چیرۆکی (حەملەی هەکاری)، سەرما، برسێتی، رەقبوونەوەی چەند پێشمەرگەیەک، ونکردنی رێگا لەناو زریان و باوبۆراندا، زۆربەی پێشمەرگەکانی پڕوکاندبوو! ئەمانە لەرۆژانی تاروگەدا بۆ من بوونە پاژێک لەکەرستەی چیرۆکی

(لەگێژاودا) وێڕای ئەزموونی خۆم لەگەڵ ڕێونکردنی کاروان لەناو زریان و باوبۆراندا.

کوێخا قادری مەنگوڕ گوتی: ((قوش دەرناچێت!))

تالیب ڕۆستەم پێیگوتین: ((قوش دەرناچێت!))

دەبێ تەسلیم ببینەوەو ڕێگەی تر نەماوە. کوێخا قادر لەمنی پرسی ((مامۆستا قوش چییە؟)) منیش گوتم: ((بە تورکی بە مەل دەڵێن: قوش! واتا: باڵدار بە باڵداری خۆی دەرباز نابێت..))

قادر ئاغا گوتی: ((پەکو بەخودای وەمزانی قوش دەعبایەکی سەیرە!))

تەسلیمبوونەوەی تالیب ڕۆستەم و نزیکەی ١٨٠ پ. م ئاماژەیە بۆ هەرسهێنانی فیکری و سیاسی بەشێک لەسەرکردە سیاسی و عەسکەرییەکان و بڕوا نەمانیان بەراستی و دروستی پلان و چالاکی پێشمەرگەیی و داهاتووی شۆڕش.

مام جەلال ڕۆژی دوو سێ جار بۆ چاخواردنەوەو ئاڵوگۆڕکردنی بیروڕاو دەنگوباس سەردانی دەکردین. زۆرجار لەو دانیشتنانەدا، باسی بیرۆکەی دامەزراندنی ی. ن. ک دەکرا:

کۆمەڵە: ڕێکخراوێکی مارکسی ـ لینینی چەپە.

بزوتنەوە: ڕێکخراوێکی نیشتمانی شۆڕشگێڕە.

هێڵی پان، کە دواتر ناوەکەی بۆ (هێڵی گشتی) گۆڕدرا، دوای بیستنەوەی کۆمێنتەکانی قالە دیگەڵ لەسەر (هێڵی پان) کە یەکسەر فەرموویەتی مـن: (هینی پان)م بیستووە، بەلام (هێڵی پانم) نەبیستووە.

پێشمەرگەکان دەیانگووت: لەم هێڵی پانە تێناگەین. نەوشیروان قسەکانی د. کەمال فوئادی دووبارە دەکردەوە: هێڵی پان ڕێکخراوێکە جێگای سەری مارو هاری تێدا دەبێتەوە.

مام جەلال بۆچوونی د. کەمالی دەربارەی پشتیوانی گەلانی بۆ گێڕاینەوە: ئێمە گوتمان با پەیوەندی لەگەڵ هێزە دیموکرات ـ مەسیحیەکان ببەستین. ئەو دەیگوت: ئەمانە هێزی ئیمپریالیستی چەکمە رەقن! گوتمان: با لەگەڵ سوسیال ـ دیموکراتەکان قسە بکەین، ئەو دەیگوت: ئەمانە ئومەمیەی دووەمن*، کاتی خۆی لینین جەوابی کردوون. دەمانگوت: با پەیوەندی لەگەڵ چەپەکانی ئۆروپا ببەستین، ئەو دەیگوت: ئەمانە ئەولادی ئەم عصرەن! **

ئێمەش پێمان دەگوت: تۆ هەرچی هێزی سیاسی وڵاتەکەیە هەمووت (فت) کرد، کەس نەماوەتەوە تەنیا ئەو پرۆپیرەژنانە دەمێننەوە، کە سەگێکیان بەدەستەوەیە و لەناو پارکە گشتیەکاندا پیاسە دەکەن!

کادرەکان تینووی زانیاری نوێ بوون سەبارەت بە بیرۆکەی دروستکردنی رێکخراوی کۆمەڵە!

مام جەلال خۆی وەکو کەسایەتی ژمارە یەک و دامەزرێنەری کۆمەڵە بەتێرو تەسەلی رووداوەکانی دەگێڕایەوەو بە حەسرەتەوە باسی لەدەستچوونی شیهابی شێخ نووری دەکرد. گروپە جیاجیاکان ساڵی ١٩٧٠ یەکدەگرن و ئەمانەی خوارەوە دەبنە دەستەی دامەزرێنەری کۆمەڵە:

١. مام جەلال
٢. فوئاد قەرەداخی
٣. شیهابی شێخ نووری
٤. فەریدون عەبدولقادر
٥. فازیلی مەلا مەحموود
٦. دلێر سدیق

* The Second International (1889-1916) ـ الاممية الثانية.

** أولادى ئەم عصرە: ئیدیۆمێکە شێخ رەزا لەفەردێکدا بەکاریهێناوە.

مـام جـەلال کەسـایەتی ژمـارە (١) بـووەو ئـەو دەوری کۆکـەرەوەو داڕێـژەری هێڵـی سیاسـی و فیکـری ڕێکخراوەکـە بووە. سەیر ئەوەیە لەکۆبوونەوەی هەڵوەشاندنەوەی پ. د. ک ـ بـاڵی مەکتـەبی سیاسـی سـاڵی ١٩٧٠، هـەر هـەموو ئەنـدامانی سەرکردایەتی بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی باڵی (م.س)یان پەسـەند کردووە، تەنیا ئەو هـەموو هێزو توانای خۆی خستۆتە گەڕ بۆ ئـەوەی بـاڵی (م.س) هەڵنەوەشـێتەوەو بـەردەوام بێـت لەسـەر کاروچالاکی خۆی.

فوئـاد قـەرەداخی، کەسـایەتی دووەم بـووە پـاش مـام جـەلال، هەر جارێک کۆبوونەوە کرابێت و مام جـەلال ئامـادە نـەبووبێت، فوئـاد قـەرەداخی تـا سـاڵی ١٩٧٢ سەرپەرشـتی کۆبوونـەوەکانی دەسـتەی دامەزرێنـەری کـردووە. زۆربـەی نووسـین و بڵاوکراوەکانی کۆمەڵـە لەلایـەن فوئـاد قەرەداخیـەوە نووسـراون. ئـەم لـەڕووی ڕۆشـنبیری سیاسـیەوە کاریگـەرترین کەسـایەتی بـووە و تەنانـەت لەسـەر بابەتـە ئـەدەبی ـ سیاسـیەکانی ئـەو سـەردەمە، بۆچـوونی ئـەم یەکلاکـەرەوە بـووە. لـەوە دەچێـت کەسـایەتی فوئـاد بـۆ کـاری (تیۆرسـیۆن)ی حزبێکـی ڕەسـمی و ئاشکرا گونجاو بووبێت. نەک بۆ کاری ڕێبەرێکی هەلسووڕاوی ڕێکخراوێکی ژێرزەمینی تازە دامەزراو!

شیهابی شێخ نووری، پیاوێکی حزبی شارەزا، ئازا، خۆڕاگر، نـەترس بەرامبـەر جـەلاد و پیاوکوژەکـان بـووە. ئاسـتی تیـۆری وەکو فوئاد قەرەداخی نەبووە. دۆستی دێرینی مام جەلال بووەو لەبـەر ڕوونـاکی بیروبـاوەڕی ئـەو کـاری کـردووە. لـەڕووی کۆمەڵایەتییـەوە، پەیوەندییـەکی باشـی لەگـەڵ دەوروبەرەکەیـدا هەبووە. ئەو لێپرسراوی یەکەمی دروستکردنی رایەڵ و شانە و

ئەڵقەی رۆشنبیری بووەو سەرپەرشتی هێڵەکانی ڕێکخستنی لەشارەکانی کوردستان و بەغدادا... تاد. کردووە.

دیارە هەڤاڵانی (کۆمیتەی هەرێمەکان) پاش ڕۆیشتن و گرتنی سەرکردایەتی پێشووی کۆمەڵە، لەکۆبوونەوەو دانیشتنی خۆیاندا ڕەخنەیان لەمەسەلەی ڕۆیشتن و سنووربەزاندنی ئەوان گرتووە، بەڵام ئەوە نەدەگەیشتە لێواری لەسەر نووسین و (تشهیر)! هەر بەزارەکی لەبازنەیەکی زۆر تەسکدا باسی بابەتەکە دەکرا. دووجار بەنووسین ئاماژە بۆ سەرکردایەتی پێشوو کراوەو ڕەخنەیەکی سووکیان لێگیراوە. ئەو دووجارە هەڵلای لەسەر نرایەوە و خوێنی سیاوەحش رژێنرا. بێگومان پاشماوەی سەرکردایەتی پێشوو، بەرژەوەندیان لەوەدا بوو، هیچ لێکۆڵینەوەیەک لەسەر ئەو قۆناخە نەنووسرێت و کەس بە باش و خراپ قسە لەسەر ئەو قۆناخە نەکات و پەنجە بەکونە زەردەواڵەدا نەکات، ڕەخنە بە (تاوان)ێکی گەورە دادەنرا.

ڕاستی ئەوەیە پاش ئەیلوولی ١٩٧٥ ئاست و قەوارە و هێزی ڕێکخستن و ئایدیۆلۆژیای کۆمەڵە دەرکەوت. هەر بۆ نموونە: پاش ئەیلوولی ١٩٧٥ ژمارەی ئەندامانی کۆمەڵە لەشاری سلێمانیدا تەنیا (١٢) ئەندام بووە. ئایا بە (١٢) ئەندام چالاکی جەماوەری، شۆڕش، ڕاپەڕین دەکرێت؟

سەرکردایەتی نوێ هاتە سەر هەواری خاڵی! هەرچی پێویستی ڕێکخستنی ژێرزەمینی هەیە فەراهەم نەکرابوو: نە دەتوانرا شوێنی خۆشاردنەوە بۆ ئەندامێک دەستبەر بکرێت، نە یەک دەمانچە لەبەردەستی ڕێکخستندا هەبوو. تایپ و ڕۆنیویەک گەێنرابووە ناو شار، پارەی یەک نان و کەبابیش لەخەزێنەی کۆمەڵەدا نەبوو!

ئەم ڕێکخستنە ساڵی ١٩٧٢ لەبەر ئەوەی لەرووی تیۆرییەوە باش کاری بۆ نەکرابوو، تووشی یەکەم لەتبوون هات (فوئاد قەرەداخی و فازیلی مەلا مەحموود)* لەکۆمەڵە هاتنە دەرەوەو ڕێکخراوێکی نوێیان پێکەوەنا (ڕێکخراوی مارکسی شیوعیەکانی عیراقی) لێپرسراوی سلێمانی ئەم باڵە ئەشرەف تاڵەبانی (ئەشرەف شێخ شەرەف) کە ئامۆزای مام جەلالە. ئەم گروپە بڕوایان وابووە، کە نابێ ڕێکخراوێکی مارکسی لەسەر بنەمای نەتەوەیی ـ کوردستانی دامەزرێت. دەبێ لەسنووری دەوڵەتی عیراق ڕێکخراوێکی کرێکاری ـ کۆمۆنیستی دروست بێت. واتە:

---

* ئەمانە ناسراوترین ئەندامی ئەم باڵە بوون:

١. فوئاد قەرەداخی. ٢. فازیلی مەلا مەحموود. ٣. ئەشرەف تاڵەبانی. ٤. سلێمان عومەر حەسەن. ٥. وشیار محەمەد ئەحمەد بەرزەنجەیی. ٦. عەبدولرەحمان سدیق قەرەداخی(گۆران قەرەداخی). ٧. فەوزی مەلا مەحموود. ٨. سەردار حەسەنە سوور سیوسێنانی. ٩. زاهیر باهیر مەردۆخەیی. ١٠. پرشنگ مەمەند ژاژڵەیی. ١١. عەبدوڵلا موعتەسەم دەباغ. ١٢ حەسەن حەمەخان ئەمین(حەسەن جاف). ١٣. شیروان شێخ نووری. ١٤. شەماڵ شێخ جەمال.

هەر پاش جیابونەوەی ئەم گروپە لەکۆمەڵە، فازیلی مەلا مەحموود پێشنیازی ئەوە دەکات بە کۆمەڵ بچنە ناو پارتی کۆمۆنیستی عیراق (قیادەی مەرکەزی) و خۆی چاوەڕوانی ئەوە ناکات بیرورای هاورێکانی چییە، دەبێتە ئەندامی پ. ک. ع(ق. م). فاروقی مەلا مستەفا، هاتنی فازیلی ئامۆزای بە باش نازانێت و پێیدەڵێت: لەوێ بویتایە باشتربوو، بواری سەرکەوتن و بەرەو سەرەوەت لەوێ باشتر بوو. ئەم گروپە سێ مەرجیان هەبووە بۆ ئەوەی ببنە ئەندامی (ق.م) پارتی کۆمۆنیستی عیراق:

یەکەم: نێوی پارتی کۆمۆنیستی عیراق بگۆڕدرێت (بۆ نموونە پ. ک. ع- یەکگرتوو).

دووەم: بڕواهێنان بە بیری ماوتسی تۆنگ.

سێیەم:سێ ئەندامی ئەڵقەی ناوەندی بکرێنە ئەندامی لقی کوردستانی قیادەی مەرکەزی.

پ. ک. ع هەرسێ مەرجەکەیان ڕەتدەکاتەوە.

تیـزی دەوڵـەت لای ئەمانـە سـەرووی تێـزی نەتـەوەیی ـ کوردستانی بووە.

مام جەلال دەیگوت: (هەموو هەڤاڵان پێیان باشبوو من لەناو سەرکردایەتی کۆمەڵدا بم، تەنیا کاکە نەوە و گروپی (رزگاری) دژی هاتنی من بوون..) رستەکەی تەواوکردو لەقاقای پێکەنینی دەدا. نەوشیروان رستەکەی بۆ تەواو دەکرد: (بەڵێ! من ئەوکاتە بەراشکاوانە بیروڕای خۆمم دەردەبڕی. من لایەنگری ئەوە بووم ئێمە خۆمـان رێکخراوێک دروست بکەین و کەسـایەتی گەورە نەهێنینە پێشـەوەو خـۆی بەسـەر ئێمـەدا بسـەپێنێت. تـا ئێمـە بەیانێک دەنووسین، مام جەلال بەتەنیا دە بەیان دەنووسێت. تا ئێمە دە کەسمان بۆ ریزەکانی رێکخستن رادەکێشا ئەو هەزار کەسی بۆ رێکخستن پەیدا دەکرد و پاش ماوەیەکی کورت ئەو دەبێتە کەسی یەکەمی رێکخستن..).

مام جەلال قسەکانی ئەوی تەواو دەکرد: ((هەر یەکەم رۆژ، کـە زانـی مـن ئاگـادارم و سەرپەرشـتی یـەکگرتنی دەسـتە جیاجیاکانی کۆمەڵە دەکەم، کاکە نەوەو گروپی رزگاری نەهاتنە ریزەکـانی کۆمەڵـەوە.. گروپـی رزگـاری* پاشـان تـاک تـاک پەیوەندیان پێوەکردین. ئیدی کاکە نەوەش پاش هەرەسی ١٩٧٥ دەستی لەخوێندن هەڵگرت. دوو هەفتەی مابوو نامەی دکتۆرا تەواو بکات. هەرپێمان گوت: ئەوە خەریکین یەکێتی دروست دەکەین، وازی لەزانکۆ هێناو بۆ ئەم شاخ و کێوە گەڕایەوە..))

---

* گروپی رزگاری: ١. نەوشیروان مستەفا.٢. شازاد صائب. ٣. مەحمودی مەلا عیزەت. ٤. رفعەتی مەلا (رفعەت عەبدولرەحمان). ٥. حەمە چاوشین. ٦. دکتۆر محەمەد سابیر. ٧. حەمە سەعیدی فقی عەلی ماوەتی. ٨. شێرزاد فەقێ عەلی ماوەتی. ٩. ئەحمەد ئابلاخی.

ناوەڕاستی مانگی ئۆکتۆبەری ١٩٧٨ سێ هەفتەیەک لە وەرزی پایز تێپەڕیبوو، مولازم سەید کەریم گوتی: (هەوران گەواڵ گەواڵە..) کاتێک بە ئاسمانەوە چەند پەڵە هەورێکی بەدی کرد. من زۆر شارەزای زستانی (دۆڵە کۆگێ)نەبووم، بۆیە ئەم پرسیارەم لە مولازم سەید کەریم کرد:

((زستانی دۆڵە کۆگێ چۆنە؟))

ئەو گوتی: ((دەبێتە مەکۆی ورچان و ئێمە دەبێ بۆ شوێنێکی گەرمتر بگوێزینەوە!))

مام جەلال بەلاماندا تێپەڕی. زۆر نەچوو، لایداو سڵاوی لێکردین و لەسەر بەردێک دانیشت و گوتی: ((مامۆستا جەعفەر پارەت پێماوە؟))

من گوتم: ((نزیکەی هەشتسەد دینارم پێماوە!))

ئەو گوتی: ((دەبێ پێش باران بارین و سەرما و سۆڵە، چارەسەری خۆمان بکەین!))

مولازم سەید کەریم گوتی: ((من و مامۆستا پێش ئەوەی تۆ بێیت باسی هاتنی زستان و بەفرو سەرمامان دەکرد!))

مام جەلال گوتی: ((من پێمباشە مامۆستا جەعفەر وێرای دەستەیەک پ. م بۆ خڕینێوزەنگ بچن و لەوێ سێ چوار ژوورێک دروست بکەن!)) ئینجا بە سوعبەتەوە گوتی: ((هەر تەواوبوو ناوی شوێنەکە دەنێین: جەعفەراوا!))

ئێمە دەربارەی هەواری نوێ گفتوگۆمان دەکرد. هاوارو لەتیف* پەیدابوون: دوو کادری خوێنگەرمی، رۆح سووک، قسەزان، چالاک، گورج و گۆڵ، رووناکبیر، کراوە، زۆر ئازا....

* هاوار جەلال هاوار، لەتیف(لەتیفی مام عەوڵلای میرزا رۆستەمی): ئەم دووانە وەکو دووانە زۆربەی کات پێکەوە بوون. هەردووکیان زۆر بەلاوی شەهید بوون.

لەتیف گوتی: ((ئێمە هەست دەکەین غەدرمان لێکراوە!))

هاوار گوتی: ((بەڵێ مامە ئەمە ئەوپەڕی غەدرە، ئێمە هیچ خراپەیەکمان نەکردووە، خەڵکی ئەو ناوچەیە مرۆڤی باش نین، کەچی تۆ ئێمەت بۆ ناوچەی پشدەر (نەقڵ) کردووە!))

لەتیف گوتی: ((ئێمە ئەم (نەقڵ)کردنە بەڕەوا نازانیین و خەڵکی ئەو ناوچەیە ڕەفتارو کرداریان باش نەبووە! تۆ ئێمە (نەقڵ) دەکەیت!))

مام جەلال گوتی: ((ئێوە نالێن خەڵکی ئەو ناوچەیە خراپن و ئێوە مرۆڤی زۆر باشن؟))

هەردووکیان بە یەکەوە گوتیان: ((بەڵێ وایە!))

مام جەلال گوتی: ((بۆیە منیش ئێوەم نەقڵ کردووە!))

هەردووکیان سووربوونەوەو دەماری ملیان هەڵسا: ((کەواتە بۆ ئێمە نەقڵ دەکەیت؟ ئێمە هیچ خراپەیەکمان نییە و ئەوان مرۆڤی باش نیین!))

مام جەلال گوتی: ((ئێوە پێتان وایە من حکومەتی بەعسم، بتوانم دێهات بگوازمەوە! من دەتوانم لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دوو کادری خۆمان بگوازمەوە. خەڵکی ناوچەیەک باش نەبن، ئێوە تازە لەو ناوچەیە ناتونن بمێننەوە و کێشەمان بۆ دروست دەبێت))

مام جەلال بە شێوەیەک رستەکەی دارشت، هەر هەموومان لەقاقای پێکەنینماندا، بە لەتیف و هاوریشەوە. ئەوان ئەهوەن بوونەوەو بەرەو بێدەلان گەڕانەوە!

من گوتم: ((لەتیف و هاوار* دوو کادری دڵسۆزو زمانپاراون، ئەمان کێشەیان لەگەڵ جووتیاراندا هەبێت، دەبێ کادرە نوێکان چۆن بتوانن لەدێهاتەکاندا کاربکەن؟))

مام جەلال گوتی: ((گوتیان: دۆمە رەشە؟ ئەویش گوتی: بە میراتت کەوێ هەر ئەوەسە!))

من پەندەکە تێنەگەیشتم و حەزیشم دەکرد ئەم پەندە جوانە فێرببم. گوتم: ((مام جەلال تێنەگەیشتم: ((چی رەشە؟))

گوتی: ((هینەکەی!))

گوتم: ((هینەکەی چییە؟))

گوتی: (( بەخوا تۆش دەورییەکی فێربوونی زمانی کوردیت دەوێت و بەتایبەتی پەندی پێشینانی محەمەدی خاڵ..))

ئیدی بلاوەمان لێکرد.

---

* هاوار: پایزی ساڵی ١٩٨١ لەناو شیوێکی نزیکی بەستەسین لەگەڵ ژمارەیەک پ. م کەوتە بۆسەیەکی سوپای رژێمەوە و تا دوا فیشەک شەڕی کردبوو. سەربازەکان گەمارۆیان دابوو. تێیدەخوڕن: خۆت بە دەستەوە بدە! چەکەکەت فرێبدە و دەست بەرز بکەرەوە. ئەویش چەکەی فڕێدەدات و دەست بەرز دەکاتەوە. سەربازەکان دەگەنە بەردەمی. ئەم نارنجۆکەی ناودەستی تێیان دەگرێت و هەندێکیان دەکوژێت. ئەفسەرێک و سەربازێک دەگەنە سەری. ئەفسەرەکە دەڵێت یەک مەخزەن لەسەریدا بەتاڵ بکە. ئەویش یەک مەخزەن لەسەریدا بەتاڵ دەکات. ئەفسەرەکە بە سەربازەکە دەڵێت: یەک مەخزەنی تریش لەسەریدا بەتاڵ بکە. ئەویش یەک مەخزەنی تری پێوە دەنێت. دواتر تا نزیک سەربازخانەکە رایدەکێشن، بەمەبەستی ئەوەی سبەی رەوانەی سلێمانی بکەن. هەر ئێوارە دێ و تاریک دەکات، هاوار خۆی دەرباز دەکات و رۆژی دواتر بەکۆمەڵێک برینی سەختەوە لەنەخۆشخانەی توژەڵە بوو. هەر ئەو رۆژە سەردانم کردو خۆی ڕووداوەکەی بۆ گێڕامەوە. رۆژی ١٩٨٢/٧/١٠ لەبەستەسین جاشەکان دەزانن لەبن کەپرێکە، گەمارۆی دەدەن و ئەمجارەیان جاشی کورد رێگەی دەربازبوونی نادەن.

ـ بڕوانامەی ماستەر لەساڵی ١٩٩٢ لەسۆسیۆلۆگیا زانستیو سیاسیدا ـ لەبەشی پەیوەندییە نێودەوڵەتیەکان لەزانکۆی (جۆرج ئۆگست) لەئەڵمانیا وەرگرتووە.

ـ ١٩٧٠ یەکەم وتاری بەزمانی عەرەبی لەگۆڤاری (الف باء) ی بەغدابیدا بڵاوکردۆتەوە.

ـ هەر لەهەمان ساڵدا پەیوەندی بە (یەکێتی قوتابیانی کوردستان)ەوە کردووە.

ـ لێپرسراوی لیژنەی ناوچەی خانەقی یەکێتی قوتابیانی کوردستان بووە.

ـ لەساڵی ١٩٧١دا بووە بە ئەندامی لقی دیالای یەکێتی قوتابیانی کوردستان.

ـ لەساڵی ١٩٧١ دا پەیوەندی کردووە بەکۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە، کە پێشتر ناوی (کملک) بوو.

ـ لەساڵی ١٩٧٤ـ ١٩٧٥ دا پەیوەندی کردووە بەهێزی پێشمەرگەوە، کە ئەوکاتە (پ. د. ک) بەسەرۆکایەتی مەلا مستەفا بەرزانی رێبەرایەتی دەکرا.

ـ ئەندامی لقی یەکێتی لاوانی کوردستان ـ لقی دیالا.

ـ بووەتە ئەندام لە (یەکێتی نوسەرانی کورد).

ـ ئەندامی کۆمیتەی باوەڕ لقی خانەقی (کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان).

ـ ئەندامی (کۆمیتەی هەرێمی پێشڕەو) لقی بەغداو خانەقی لەساڵی ١٩٧٧.

ـ دامەزراندنی رێکخراوی (هەڵۆی سوور) لەبەغدا.

- ساڵی ١٩٧٧چووەتە شاخو بەشداری لەدەستە چەکدارەکانی قەرداغو گەرمیان کردووە.
ـ لەساڵی ١٩٧٨دا بووەتە ئەندامی (ناوەندی کۆمەڵە) کە پێکهاتبوون لە (نەوشیروان مستەفا، ئازاد هەورامی، م. جەعفەر)
- ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بووە.
ـ ١٩٧٩ لێپرسراوی ناوەندی راگەیاندنی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان.
- ١٩٨٢ بەرەو ئەڵمانیا کۆچی کردووە.
- ١٩٩١ ئەندامی رێکخراوی یەکێتی نوسەرانی جیهان (PEN)
ـ ئەندامی دەستەی نوسەرانی گۆڤاری رووناکبیری بووە، کە ئەوکات لەستوکهۆڵم دەردەچوو.
ـ بەشداری لەچەندین سیمینارو کۆنگرەی جیهانیدا دەربارەی مەسەلەی کورد لەشارەکانی (برێمن، لۆزان، بۆن، دۆسلدۆرف، ئەمستەردام، بەرلین، گوێتنگن.. هتد) کردووە.
ـ ئەندام بووە لەلیژنەی دامەزرێنەری رێکخراوی دۆستایەتی ئەوروپی - کوردی.
ـ ساڵی ٢٠٠٠ پیشاندانی فیلمی (نالی) کە سیناریۆکەی لەنووسینی مامۆستا جەعفەرە.
- لە (٢٠٠٣) گەڕاوەتەوە کوردستان
- لە (٢٠٠٤) بووەتە لێپرسراوی مەکتەبی بیروهۆشیاری (ی. ن. ک)
ـ یەکێکە لەدەستەی دامەزرێنەی (بنکەی ژین) بۆ چاپکردنو بڵاوکردنەوەی بەڵگەنامەو بڵاوکراوەی کوردی.
- لەکاتی ئێستادا لێپرسراوی ناوەندی مێژووی (ی. ن. ک)ە.

**بەرهەمو بڵاوکراوەکانی:**

١. خۆرگیران - کورتە چیرۆک خڕینێوزەنگ ١٩٨١

٢. راوەماسی - رۆمان ستۆکهۆڵم ١٩٨٦

٣. لەگێژاودا - کورتە چیرۆک ستۆکهۆلم ١٩٨٨

٤. هەڵوی سوور - ( سیناریۆ) ٢٠٠١

٥. پێکهاتنی چوارچێوەی ئابوریو سیاسی ـ چینی بۆرجوازی لەشاری سلێمانی ٢٠٠٣

٦. التیارات والاتجاهات الادبیه والفکریه فی القرن التاسع عشر ـ التأخی ١٩٧٢.

٧. خانقین خلال ربع قرن (١٩٠٠ـ ١٩٢٥)، خمس حلقات ـ (التأخی) ١٠و ١١و ١٢و١٣و ١٤ حزیران ١٩٧٣.

(خانقین خلال ربع قرن (١٩٠٠ـ ١٩٢٥) بحث میدانی ـ السلیمانیه ـ ٢٠٠٥.

٨. الرومانتیکیه فی الادب الکردی ـ مجلة الثقافه، عدد (١)س (٤) ص (١٠١) بغداد ـ ١٩٧٤.

٩. لماذا سادت اللهجه الگورانیه فی الادب الکردی ـ مجله الثقافه ـ بغداد ١٩٧٣.

١٠. چەند لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی شەڕی پارتیزانی . خڕی نێوزەنگ. ـ ١٩٨١

١١. Fadil Ahmad: Die Stellung der Frau in der Kurdischen Gesllschaft.

In: VIA Magazin (Bonn).3 (1991) S. 1-120

- گوتاری: دەوری ژن لەکۆمەڵی کوردستاندا (بە ئەڵمانی) لەگۆڤاری(V1A) دا بڵاوکراوەتەوە.

١٢. Fadil Ahmad: LUTTE ARMEE ENTRE LE MYTHE ET LAREALITE

In: HALKAWT HAKIM Les Kurdes par- dela 1. Exode. Paris 1993.

- وتاری خەباتی چەکدار لەنێوان ئەفسانەو راستیدا. لەلایەن (د. هەڵکەوت حەکیم)ەوە کراوەتە فەرەنسیو لەکتێبێکدا ساڵی ١٩٩٢ لەپاریس بڵاوکراوەتەوە. ئەم وتارە لەگۆڤاری یەککرتندا بڵاوکراوەتەوەو چەندین کەس لەسەریان نووسیوە.

١٣. Fadil Ahmad Die Kurdische Befreiungsbewegung zwischen Stammeskultur und politischer Erneurung. Hildesheim.1994.

- کتێبی: بزوتنەوەی رزگاری گەلی کورد لەنێوان کەلتووری عەشرەتگەریو مۆدێرکردنەوەی سیاسیدا. ئەمە نامەی ماجستێرەو ساڵی (١٩٩٤)ە و لەشاری هلدسهایم چاپکراوەو بڵاوکراوەتەوە.

١٤. ئەڵوەنو ئەفسانە رۆمان، سلێمانی، ٢٠٠٤

١٥. مێژووی بیری کوردی، لێکۆڵینەوە، سلێمانی ٢٠٠٥

١٦. الصقر الاحمر (سيناريو) (ترجمة: شهاب القرەلوسی)، السليمانية ٢٠٠٥

١٧. مێژووی خانەقین ، بەرگی یەکەم.

١٨. مانفێستی مەکتەبی بیروهۆشیاری بۆ مۆدێرن کردنەوەی (ی. ن. ک) سلێمانی ٢٠٠٦.

١٩. شاری سلێمانی، ململانێی گرووپە کۆمەڵایەتییەکان ١٨٢٠ ـ ١٩٢٠، سلێمانی، ٢٠٠٦.

٢٠. هەڵۆی سوور (چاپی دووەم) سلێمانی ـ ٢٠٠٧.

٢١. ئەزموونی سۆسیال دیموکراتی ئەڵەمانیا ـ سلێمانی ٢٠٠٧

٢٢. مام جەلال ـ سلێمانی، چاپی یەکەم، ٢٠٠٧

٢٣. هەرێمی کوردستانو تورکیا ـ سلێمانی، ٢٠٠٨

